منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

46

تەمووزی 1986 ساڵی چوارەم

# کاروان

گۆڤارێکی ڕوشنبیریی مانگانەیە ئەمینداریتیی گشتیی ڕۆشنبیریی و لاوان بە زمانی کوردیی و عەرەبی دەری دەکا



# کاروان

گۆڤاریکی رۆشنبیریی مانگانەیە

ئەمینداریتی ی گشتی ی رۆشنبیری و
لاوان بە زمانی کوردی و عەرەبی
دەری دەکا

سەرنووسەر
محمد أمین محمد احمد

جیگری سەرنووسەر
حسین عارف

46

تەمووزی ١٩٨٦
ساڵی چوارەم

## لەم ژمارەیەدا



ئەدرەس :
هەولیر : ئەمینداریتی ی
گشتی ی رۆشنبیری و لاوان
گۆڤاری «کاروان» ت : ٢٠٨٠٠

نرخی (٢٥٠) فلسە

لە کتیبخانەی نیشتمانی لە بەغدا ژمارە «٤٨٣»ی ساڵی «١٩٨٢»ی دراوەتی.
لە چاپخانەی (الادیب البغدادیة) چاپکراوە

# بەڕێزان کاربەدەستانی ئۆتۆنۆمی‌ی ناوچەی کوردستان بۆ «کاروان» دەدوێن

به بۆنەی تێپەڕبوونی ١٨ساڵ بەسەر سەرکەوتنی شۆڕشی ١٧و ٣٠ی تەمموزی ساڵی ١٩٦٨دا «بەشی لێکۆڵینەوە» لە گۆڤارەکەماندا چەند چاوپێکەوتنێکی لە گەڵ لێپرسراوانی ناوچەی کوردستان سازکردو ئەو پرسیارانەی خوارەوەی ئاراستە کردن :

١ – لەم رۆژانەدا جەماوەری گەلی عیراقمان ئاهەنگ بە بۆنەی یادی شۆڕشی ١٧و ٣٠ی تەمووزی نەمر دەگێڕن ، شەقلی ئەم شۆڕشە کە پارتی بەعس‌و سەرۆك صدام حسین سەرکردایەتیان‌کرد لە گۆڕانکاریی باری عیراقیەکان بە گشتی‌و باری گەلی کورد بە تایبەتی چۆن دەست‌نیشان‌و بەدی دەکرێ ؟ .

٢ – لەو کاتەی شۆڕش ١٨ موّوم لە تەمەنی پیرۆزیدا دەکوژێنیتەوە ، ئەو تەمەنی پڕ لە دەستکەوت‌و سەرکەوتن هێرشی ناحەزان دژ بە گەل‌و نیشتمان‌و دوا رۆژی کێشەی نێوان ئێمەو دوژمنان چۆن هەڵیدەسەنگێنن ؟ .

٣ – راتان چی‌یە دەربارەی تێکۆشەر صدام حسین خودا بیپارێزی وەك سەرکردەیێکی مەزن لە مێژووی گەلاندا و رۆڵی ئەم سەرکردەیە لە بواری ئاشتی‌و جەنگ‌و دامەزراندنی عیراقی نوێ‌دا ؟

٤ – دوا ووشەتان بۆ خوێندەوارانی کاروان چی‌یە ؟ .

## بەڕێز یحیی محمد رشید
## سەرۆکی ئەنجومەنی راپەراندنی ناوچەی کوردستان



بەڕێز مامۆستا یحیی محمد رشید جاف وەڵامی تێکڕای پرسیارەکانی گۆڤارەکەمانی بەم شێوەیەی خوارەوە دایەوە :

(بەر لە بەرپابوونی شۆڕشی ١٧و ٣٠ی تەمموزی نەمردا . عیراق لە بارێکی ئاڵۆزو ناهەباردا چ لە رووی کۆمەڵایەتی‌و چ لە رووی رۆشنبیری‌و سیاسی‌دا دەژیا ، ناکۆکی‌و دووبەرەکی توانای ووڵاتی بێ هێز کردبوو ، زوڵم‌و زۆرداریش گەلەکەمانی چەوساندبووەو رژێمی دیکتاتۆری تەواوی خەڵکی تۆقاندبوو . جگە لەمەش ئیمپریالیزمەکان ناکۆکیان پەیدا دەکردو دووبەرەکیان بڵاو دەکردەوەو سامانی عیراقیان بۆ خۆ رادەکێشاو

ئ زری گەلیان دەدا . بەلام بە بەرپابوونو سەرکەوتنی شۆرشی ۱۷و ۳۰ تەمموزی پیرۆز لە ساڵی ۱۹٦۸دا بە سەرۆکایەتی تێکۆشەر صدام حسین (خودا بیپارێزێ) باری پێشوو لابردراو خۆری ئازادیو دیموکراتیەت وولاتی رووناك کردوو بەرە بەرە گەل هەستایەوە سەر پێو دەیەها پرۆژەو دەستکەوت لە سەرانسەری وولاتدا بەرز بۆوەو خزمەت گوزارێکی فراوان پێشکەش بە گەل کرا .

عیراق بەرەو پێشکەوتن هەنگاوی ناو لە نێو نەتەوە پێشکەوتووەکان جێگای خۆی کردەوە . لێرەدا هێزەکانی ئیمپریالیزمو زایۆنیزم دەستیان بە نەخشەکێشانی پڕ لە گوماندا کردوو کۆسپو تەگەرەیان لەبەر دەم شۆرشو سەرکردایەتیەکەی دانا . بەلام بیرو هۆشی پێشکەوتووی سەرکردایەتیە زیرەکەکەمان لە سەروویانەوە تێکۆشەر صدام حسین . خودا بیپارێزێو تەمەنی درێژ بکات ، هەموو هەولو کۆشش و کردەوەی ناپاکی دوژمنانی پووچەل کردو دەستی بەکرێگیراوو نۆکەران براو لەسەر ئەم خاکە پیرۆزە ژیانیان بۆ نەما .

پارتی بەعسی سۆشیالیستی عەرەبو سەرکردایەتی شۆرشی ساڵی ۱۹٦۸ هەموو توانایێکیان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد تەرخانکرد ، ئەو کێشەیەی کەس بۆی نەکرا چارەسەری بکات تەنها حکومەتی شۆرشی ۱۷و ۳۰ تەمموزی نەمر نەبێ .

سەرکردایەتیانو سەرۆکی فەرماندە هەموو ووزەو توانایێکیان بەکار هێناو خستە روو تا لە ئەنجامدا توانیان کێشەی کورد چارەسەربکەن ئەویش بە دەرکردنی بەیاننامەی ۱۱ ئاداری مێژوویی و دەرکردنی یاسای ئۆتۆنۆمی لە کاتی دیاریکراویدا . چارەسەرکردنی کێشەی کورد یەکێتیی گەلو ریزەکانی پتەو تر کردوو برایەتیەکی راستەقینەو راستو دروستی لە نێو عەرەبو کوردو هەموو جەماوەرانی عیراق چەسپاند . بەم جۆرە دەسکەوتێکی مەزن بۆ گەلی کوردمان هاتەدیو جێبەجێ کرا . پاشان میری گەلێ هەنگاوی تری شۆرشگێرانەی بۆ گەراندنەوەی ئاشتیو ئاسایش بۆ ناوچەی کوردستانو پەرەپێدان بە ناوچەی ئۆتۆنۆمی لە گشت روویێکەوە هاوێشتو پارەیێکی یەکجار زۆر بۆ پێشخستنی کوردو کوردستان تەرخان کراو لە ئەنجامدا کوردستان لە بواری کشتوکالو پیشەسازیو پەروەردەو فێرکردنو ئاوەدانیو . . هتد تا بلێی پێشکەوتو گۆرانکارێکی بنەرەتیی تەواوی بە خۆیەوە بینیو خەلکەکەش بەرە بەرە بۆیان روون بۆوە کە سەرکردایەتی شۆرشی ۱۷و ۳۰ تەمموزی پیرۆز لە خێرو خێرخوازیو ژیانی پڕ لە کامەرانی بترازی چیتری بۆ خەلك ناوێ ، بۆیە دانیشتوانی کوردستان بە توندی لە دەوری شۆرشو سەرکردایەتیەکەی سەرۆك صدام حسین کۆبوونەوە .

ئێستاش کورد گەیشتە ئەو بروایە کە پێویستە بەرگری لە کۆمارو شۆرش بکات ، چونکە بەرگری کردن لە شۆرش بەرگری کردنە لە ئۆتۆنۆمیو گەلی کوردو کوردستان . لە سەر کوردی بەشەرەف پێویستە چەك هەلگرێ لە پێناو عیراقو سەرکەوتنی قادسیەی صدامو گیانی خۆی لە گۆرەپانی جەنگدا بەخت بکا بۆ ئەوەی نیشتمان بە سەربەرزی بژی . گۆرەپانی جەنگ شایەتی بۆ پالەوانیەتی کورد دەدات چ لە ناوچەی چوارتاو سێدەکانو گردەمەند چ لە ناوچەکانی تریشدا . ئەم بەلگانەش نیشانەی دلسۆزی کوردە بۆ شۆرشو نیشتمانو سەرۆکە تێکۆشەرەکەی هەر وەها وەلام دانەوەیەکە بۆ درۆو دەلەسەکانی دوژمنانو ناحەزان .

بایەخدان بە ناوچەو جێبەجێکردنی دەیەها پرۆژەو دەستکەوت بۆ خەباتو هەولو تەقەللای تێکۆشەر صدام حسین ، بە شێوەیێکی سەرەکی دەگەرێتەوە بۆ سەرۆکیان ، بە هۆی سەردانی لەگەلێ شارداو گەلێ دانیشتواندا . توانی لە کەمو کوریو پێویستیەکانی خەلکەکە بگاتو چارەسەر بۆ گیروگرفتەکانی بدۆزێتەوە .

هەر بە بۆنەی بیرەوەریی شۆرشی ۱۷و ۳۰ تەمموزی پیرۆزەوە دەلێم : سەرۆکی تێکۆشەر کاکە صدام حسین ،

سەرکردەییەکی گەورەو مەزنە ، ئازایەتی و تواناو هۆشی پێشکەوتووو دڵسۆزی و هتد لە سیفاتی شۆڕشگێڕانەو پێشکەوتووخوازانە لە شەخصی ئەو سەرکردە خۆشەویستە کۆبوویەتەوەو بەرابەرایەتی ئەو تێکۆشەرە مەزنە توانیان دوژمنی ڕەگەزپەرست بشکێنین و لە گشت بەرەکانی جەنگدا سەرکەوتنی گەورە وەدی بهێنین و ئامێری سەربازیی دوژمنی گەلحۆ بەزێنین و تێکبدەین .

خودا پشتیوانمان بێ و تێکۆشەر صدام حسین سەرکردایەتی کاروانی گەلەکەمان بێ بەسەر گشت تەنگ و چەلەمەیێک ، بەسەر هەموو هێزە ڕەشەکان زاڵ دەبین و سەردەکەوین و ڕۆڵەکانی عیراقیش لەیەك سەنگەر بە سەرکردایەتی دامەزرێنەری عیراقی نوێ تێکۆشەر صدام حسین تێدەکۆشن و بەرگری لە خاك و شەرەف دەکەن . سەرکەوتن بۆ شۆڕشی ١٧و ٣٠ی تەمووزەو ڕوو ڕەشی بۆ دوژمنانی گەلەکەمانە .

## بەڕێز خەسرەو شالی
## سەرۆکی زانکۆی صلاح الدین



و : ئەمڕۆ جەماوەری گەلی عیراقمان بە هەموو نەتەوەو کەمایەتیە نەتەوەییەکان ، ئاهەنگ بە بۆنەی تێپەڕ بوونی ١٨ ساڵ بەسەر سەرکەوتنی شۆڕشی ١٧و٣٠ی تەمموزی پیرۆز دەگێڕن . شۆڕشی تەمموز ڕووداوێکی مێژوویی گرنگ و پێویست بوو بۆ هێنانە دیی عیراقێکی نوێ . بەر لە بەرپابوونی شۆڕش ، وولاتەکەمان لە بارێکی نالەباردا دەژیاو هێزە ئیمپریالیستەکان بەردەوام سامانی عیراقیان بۆ خۆ ڕادەکێشا . بەڵام دوای سەرکەوتنی شۆڕش گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی ئەنجام دراو شۆڕش هەر لە ڕۆژی لە دایك بوونیدا گەلێ نەخشەی بۆ خزمەت کردنی ئادەمیزادی عیراق و عەرەبی کێشا . ئێستاش لە دوای ١٨ ساڵ لە سەر لە دایك بوونی شۆڕشدا ، شەقلی ئەم شۆڕشە مەزنە لە هەموو سووچ و قوژبنێکی ئەم وولاتە دەردەکەوێ وەك : خۆماڵی کردنی نەوت و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردو کردنی هەولێر بە بنکەی ئۆتۆنۆمی و پایتەختی هاوینی بۆ عیراق و دامەزراندنی زانکۆی سەلاحەددین . . هتدو جگە لە دەیەها دەستکەوتی گرنگ بۆ گەلی عیراق نەبەزمان .

ئەم هەنگاوە پیرۆزانەی شۆڕشی ١٧و٣٠ تەمموز لە بەرژەوەندیی ئیستیعمارو هێزە ڕەشەکانیتر نەبوون بۆیە ئیمپریالیزم و زایۆنیزم و خومەینیەکان و عەرەب زمانەکان بە توندی یەکتریان گرتەوەو تەگەرەو کۆسپیان خستە بەردەمی ڕەورەوەی مێژوو و کاروانی شۆڕشی گەلەکەمان و گەلێ کردەوەی چەوت و ناشرینیان ئەنجامدا . . بەڵام سەرەڕای هەموو هەوڵ و تەقەللایان ئاواتە بۆگەنەکانیان سەرکەوتنی بۆ نەبووو شۆڕش توانی ڕۆڵەکانی گەل لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوەو بەم جۆرە گشت هەنگاوەکانی دوژمنان مایە پووچ بوون . هێزە ڕەشەکان لەسەر پیلانەکانیان بەردەوام بوون و لە کۆتاییدا بۆیان کرا یاری بە مێشك و تەقلی کاربەدەستانی ئێران بکەن و دژی عیراق قورمیشیان بکەن و هانیان بدەن و هێرشێکی درندانە بۆ سەر خاك و گەل و وولاتەکەمان ڕێك بخەن . بەڵام دوای تێپەڕبوونی نزیکەی شەش ساڵ بەسەر جەنگی سەپێندراو بەسەر خاك و گەلەکەمان شۆڕشمان توانی دلێرانە ڕووبەڕووی دوژمنان ببێت و لە جەنگی قادسیەی صەدامی پیرۆزدا سەرکەوێ و ئەمجارەش هێزە ڕەشەکان نەیانتوانی عیراق بەرەو ڕۆژانی تاریکی ڕابردوو بگەڕێننەوە . بە پێچەوانەی

هەلوێستو پیلانەکانیان ، عیراق هەر بەرەو پێشەوە هەنگاوی ناوەو دەنێ .

رۆڵی سەرۆکی مەزنو تێکۆشەرمان هەڤاڵ صدام حسین ، خودا بیپارێزێ، تەمەنی درێژ بکات ، لە پاراستنی دەستکەوتووەکانی شۆرشو سەربەخۆیی وولات دیارەو سەرۆکیان بەسەرۆکێکی مەزن لە قەڵەم دەدرێتو دەتوانین بڵێین ئەمرۆ ئازادیو زیرەکیی هەموو عیراقیەکان لەکەسایەتی صدام حسین کۆبوویتەوەو هەر کاکە صدامیش بوو ووتی :

(ئەوەی بیەوێ خاکی عیراق داگیربکات پێویستە بەسەر تەرمی دوا سەربازی عیراق تێپەرێ)و بە بۆنەی بیرەوەریی شۆرشی ١٧و٣٠ تەمموزی پیرۆز ، پیرۆزبایێکی گەرم لە گەلو سەرۆکی خۆشەویست دەکەمو داوای سەرکەوتن بۆ جەنگاوە رانمان دەکەم ئیتر هەر بژی عیراقو گەلو سەرۆك . . شەکاوە بێت ئالای شۆرشی ١٧و٣٠ تەمموزی پیرۆز .

## بەرێز سیروان عبدالله
## ئەندامی کاروباری ناوخۆیی



و ١ : ئەو شۆرشەی پارتی بەعسی سۆشیالیستی عەرەب بەرپایکرد ، بەراستی شۆرشی گۆرانگاریو پەرەپێدان بە ژیانی گەلی عیراق مەزنمان بوو . شۆرش خۆشیو شادیو ژیانێکی پر لە کامەرانی لە گشت رووێکەوە لە نێو خەڵکی عیراق بڵاوکردەوە . جگە لەمەش دەستکەوتی گەورەو جۆرا جۆری هێنایە دیو ئەو دەستکەوتووانە دەورێکی باڵایان لە پێشخستنی وولاتدا نواند . لە سەرووی ئەم دەستکەوتانە : خۆماڵی کردنی نەوت بوو کە ئاواتێکی هەرە مەزنی گەلەکەمانو جەماوەری زەحمەت کێشی جیبەجی کردو سامانی ئەم وولاتەی بۆ خاوەنە راستەقینەکەی گەراندەوە . چارەسەر کردنی کێشەی کوردیش ، یەکێتیی نیشتمانیی بە هێزو پتەو کرد . ئەم کارەش رووداوێکی مەزنو گرنگ بوو لە سایەی شۆرشی ١٧و ٣٠ تەمموزی پیرۆزو هەلویستی مرۆڤانەی سەرکردەکانی باری گەلی کوردمانو مافە رەواکانی ئەم گەلە لە چوار چێوەی یەکێتی نیشتمانو بەرژەوەندیی هاوبەشو یەك چارەنووس لە عیراق خۆشەویستماندا هاتە کایەوە .

ئەمرۆش لە سایەی شۆرشدا ، گەلی کوردمان چێژو سوود لە مافە نەتەوەییەکانی وەردەگرێ ئەمەش لە ژێر ئالای شۆرشو سەرکردەی مێژوویی تێکۆشەر صدام حسین ، خودا بیپارێزێ ، چێژ لە مافەکانی وەردەگرێ ئەمیش بە هۆی دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی ، ئەو دەزگایانەی فراوان بوونو پەرەیان پێدرا بە پالپشتی بەردەوامی سەرکردایەتی شۆرش لە سەروویانەوە هەڤاڵی تێکۆشەر صدام حسین ، خودا بیپارێزێ ، ووتە بە ناوبانگەکەشی چاکترین بەلگەیە بۆ سەلماندنی ئەم رایەمان کە دەڵێ :

(بروام بە پەرەپێدانو گەشەسەندنی ئۆتۆنۆمی بێ سنوورە هەر وەها بە هێزکردنی بە هۆی بیرو ئەزموونو دروستکردنی کەسایەتیو پەرەسەندنی بۆ ئەوەی عیراقیەتی گشتمان بەتینتربێ) .

ئەم دەستکەوتەمان بوو بە بەردی بناغەی چەسپاندنی یەکیەتیەکەمانو عیراقیەتیمان ، بۆیە لە سەرمان پێویستە مەردانەو دڵسۆزانە خەبات بکەینو تێبکۆشینو بەرگری لێ بکەینو لە دەوری سەرکردایەتی تێکۆشەر صدام حسین کۆببینەوە چونکە هەر رۆژگار سەلماندی کە ئەم تێکۆشەرە رۆلەیێکی دڵسۆزی گەلی عیراق مەزنمانە .

و٢ : دوای ئەوەی عیراق پاش چەند سالێك بەسەر

سەرکەوتنی شۆرشدا بوو بە ڕەمزی پێشکەوتن‌و بوو بە مەشخەڵێك لە نیشتمانی گەورەی عەرەبداو دوای ئەوەی شوێنێکی کاریگەرو پڕ لە ریزی لە گۆڕەپانی دەوڵەتاندا وەرگرت بە تایبەتی لە بزووتنەوەی بێ‌لایەنی لە پاڵ ئەم گۆڕانکارییەی شۆرش لەم وولاتە تێکۆشەرەی هێنادی ، شتێکی ئاسایی بوو کە لایەنە کۆنەپەرستەکان ئەوانەی پێشکەوتنی عیراق زیانی بە بەرژەوندیان گەیاند ، پیلانیان دانا بۆ دانانی کۆسپ‌و تەگەرە لەبەر دەم کاروانی شۆرشداو ئەو جەنگەی بە سەر وولاتە تێکۆشەرەکەمان سەپێندراوە یەکێکە لەم کۆسپ‌و تەگەرانە ، ئەمەش نزیکەی شەش ساڵ گەلەکەمان‌و هێزە چەکدارەکانی‌و جەنگاوەرە ئازاکانی ڕووبەڕووی دەستدرێژی‌یە درندانەکەی ئێران بوونە .

لەبەر ئەوەی عیراقی‌یەکان ئاڵای ڕاستیان هەڵگرتووەو خاوەن مافن ، هەموویان هەست بەوە دەکەن کە لە سەریان پێویستە قوربانی بدەن‌و گیان فیدابن و تاوەکو سەربەخۆیی وولات بپارێزن‌و چ دەستدرێژییەك کاری لێ نەکات . بۆیە عیراقی‌یەکان یەك دەنگن‌و یەك دەستن‌و ڕەنگن‌و بە سەرۆکایەتی هەڤاڵ صدام حسین سەرکەوتنی گەورە وەدی دەهێنن . لە یەزدان دەپارێمەوە ، هەمیشە گەلەکەمان سەرکەوی‌و تەمەنی سەرۆکمان درێژ بکات ئەو سەرۆکەی عیراقی نوێی دامەزراند .

و۳ : تێکۆشەر صدام حسین یەکێکە لە سەرکردە مەزنەکانی جیهان‌و ڕۆڵێکی بنەڕەتی‌و گەورەی لە بواری ئاشتی لە ئاستی هەرێم‌و وولاتانی عەرەب‌و جیهانی موسلماناندا‌و بزووتنەوەی بێ لایەنی بینیوە . هەر وەها ڕۆڵێکی دیاری کراوی لە دۆزینەوەی گەلێ چارەسەری ئاشتیانە بۆ گەلێ لە گیروگرفتەکانی جەنگی ساردو گەرمدا بینیوە .

ڕۆڵی سەرکردایەتیشی لە بواری جەنگدا پێویستی بە دەست نیشان کردن نی‌یەو ناوی سەرۆکمان لە لیستەی سەرکردە سەربازییە گەورەکان نووسراوە . . بڕوانە ڕۆڵی لە ڕزگار کردنی دیمەشق لە چنگ زایۆنیزمەکان هەر وەها ڕۆڵی لە ڕاگرتن‌و شکاندنی هێرشی خومەینیەکان بۆ سەر وولاتەکەمان‌و وەدی هێنانی چەندەها سەرکەوتنی مەزن ، وەك سەرکەوتنەکانی فەیلەق دوو لە حەوزی مەهران‌و فەیلەق پێنج لە حەوزی حاجی ئومەران لەم دواییانەدا .

دەوریشی لە بنیاتنانی عیراقی نوێ دەورێکی سەرەکی‌و بنەڕەتیە هەر ئەوە عیراقی نوێی دامەزراندووە هەر ئەو بوو عیراقی گەیاندە ریز دەوڵەتە پێشکەوتووەکان . ئۆتۆنۆمیش بۆ کورد هەر لە سایەی ئەووە چەنگ کەوت .

و٤ : داوا لە گشت ڕۆڵەکانی گەلی کوردمان دەکەم لە دەوری سەرۆکی ڕەمز تێکۆشەر صدام حسین ، خودا بیپارێزی ، کۆببنەوە ، تاوەکو سەرکەوتنی مەزن‌و تەواو بەسەر دوژمنان وەدی بێنن .

## بەرێز محمد محیی الدین شریف
## ئەمینداری شارەوانی‌و هاوینەهەوارەکان



و۱ : شۆرشی ۱۷و ۳۰ تەمموزی ئەمر لە ئەنجامی چەند شکستێك لە ئاستی نەتەوەیی‌و هەرێمی بەرپا بووو هەنگاوێکی ئازایانەو دڵسۆزانەبوو بۆ دۆزینەوەی ڕێگایێکی نوێ‌و ڕاست‌و دروست لە ئاستی هەرێم بۆ بزووتنەوەی نیشتمانی لەهەرێمی عیراقیدا .

لە سەر مستوای نەتەوەییش ، بۆ بزووتنەوەی شۆرشگێڕیی

عەرەب بە شێوەیێکی گونجاو لە گەڵ بیروراو ئامانجەکانی پارتی بەعسی سۆشیالیستی عەرەبو بیروراو ئامانجەکانی هێزە نیشتمانیەکانو پێشکەوتووخوازەکان لە عیراقداو لە نیشتمانی عەرەبدا .

دەتوانین بە کورتی دەست نیشانی دەستکەوتەکانی ئەو شۆرشە مەزنە بکەین کە کاریان لە باری عیراقیەکان بە گشتیو گەلی کورد بە تایبەتی کردووە :

١ – چەسپاندنی سەربەخۆیی ئابووریو رزگار کردنی سامانی نەوت لە چنگ کۆمپانیا بێگانەکانداو چارەسەرکردنی باری ئابووریی پاشکەوتووو راپەراندنی شۆرشێکی بەرهەمداری فراوان .

٢ – هێنانەدیی یەکگرتنی نیشتمانیو دامەزراندنی بەرەی پێشکەوتوو .

٣ – کارکردن بە شێوەیێکی دڵسۆزانە لە پێناو چارەسەرکردنی کێشەی کورد بە شێوەیێکی ئاشتیانەو دیموکراتیانە بۆ پتەوکردنی یەکێتیی نیشتمانیو دابینکردنی مافە رەواکانی گەلی کوردمان .

٤ – رزگارکردنی جووتیاران لە چەوساندنو پەرەپێدان بەرۆڵی چینی کرێکارو زەحمەتکێش لە ژیانی رامیاریو ئابووریدا .

٥ – پەرەپێدان بە بزووتنەوەی قوتابیو لاوانو ئافرەتانو یارمەتیدانی رێکخراوەکانیان .

٦ – رێکخستنی هێزە چەکدارەکان لە سەر بنچینەیێکی زانستیانەی نوێو دابینکردنی چەکی تازە بۆ سوپاو مەشقکردن لە سەر بەکار هێنانی چەکی نوێ بە شێوەیێکی باش .

٧ – دامەزراندنی کارگەو پیشەسازی لە سەرانسەری وولاتدا .

٨ – لابردنی نەخوێندەواری .

٩ – چارەسەرکردنی بنەرەتیی فراوانی گشت گیروگرفت لە نێو کۆمەڵگای عیراقیدا .

چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە عیراقدا لە سەرووی هەموو ئەو گیروگرفتانەبوو کە روو بە رووی شۆرش بوونو بۆ ئەوەی هێمنیو ئاسایشو ئاشتی بگەرێتەوە بۆ باکووری وولات ، بەیاننامەی ١١ی مارتی مێژوویيو ئۆتۆنۆمیی بۆ گەلی کوردمان دەرکرد . رۆڵی سەرەکیش لەم بوارەدا بۆ سەرۆکی تێکۆشەر صدام حسین ، خودا بیپارێزێ ، دەگەرێتەوە . ئەمانەی خوارەوەش چەند دەستکەوتێکی مێژوویین بۆ گەلەکەمان :

١ – داننان بە نەتەوەی کوردو مافی نەتەوەی کورد .

٢ – دامەزراندنی زانکۆی سەلاحەددین .

٣ – دامەزراندنی کۆری زانیاری کورد .

٤ – کردنی نەورۆز بە جەژنێکی رەسمیی نیشتمانی لە کۆماری عیراقدا .

٥ – کردنی دهۆك بە پارێزگا .

٦ – بەشداربوونی گەلی کورد لە حوکمداو جێگری سەرۆك کۆمار دەبێ کورد بێ .

٧ – لێبوردنی گشتی بۆ سیاسیەکانی مەدەنیو سەربازی .

٨ – دەستووری عیراق دانی بەم راستیەنا کە گەلی عیراق لە دوو نەتەوەی سەرەکی عەرەبو کورد پێك دێت .

٩ – زمانی کوردی لە پاڵ زمانی عەرەبی بە زمانی رەسمی لە ناوچەی کوردستاندا دەژمێردرێت .

١٠ – پێکهێنانی ئەنجوومەنی یاساداناناو راپەراندنو بەرێزان سەرۆکی هەردوو ئەنجوومەن ئەندامن لە ئەنجوومەنی وەزیران .

١١ – مووچە خۆرە ئیدارییەکان لەو ناوچەیەدا لە کورد پێك دێن .

ئەمە جگە لە چەند دەستکەوتێکی تریش کە نایەنە ژماردنو لە ژێر سێبەری ئەم دەستکەوتانە ئۆتۆنۆمی بەرز دەبێتەوەو پرۆژەو ئاوەدانی لە گشت شوێنێکدا بلاو دەبێتەوە تاوەکو کورد تامو چێژ لە ئاشتیو هێمنی وەربگرێو سەربەست بێ لەژێر سێبەری سەرۆکی تێکۆشەرو خۆشەویست صدام حسین ، ئەو سەرۆکەی شوێنی خۆی لە دڵی هەموو کوردێك کردەوە .

و ٢ : به سەرکەوتنی شۆڕشی ١٧و ٣٠ تەمموزی پیرۆزدا مەیدانێکی کوشندەیی ئاراستەی بەرژەوەندییەکانی ئیمپریالیزم‌و زایۆنیزم له ناوچەدا کرا . به تایبەتی دوای خۆماڵی کردنی نەوتی عیراق‌و لابردنی دەسەڵاتداریی ئیمپریالیزمیەکان له سەر ئابووری نیشتماندا . دوای دەرکردنی ئیستیعمار له وولاتەکەماندا ، هێزە ڕەشەکان سەر له نوێ بۆ پیلان دانان گەڕانەوە بۆ ئەوەی دووباره بۆ ناوچەی بگەڕێنەوە . بەم جۆرە بەکرێگیراوەکانی خۆیانیان هاندا بۆ ڕاگرتنی ڕەورەوەی شۆڕش‌و درێژەدان به داگیرکردنی فەلەستین له لایەن زایۆنیزمەکاندا ، بۆ ڕاپەڕاندنی پیلانه بۆگەنەکانیان خومەینیی بەکرێگیراویان بەکار هێناو چەکێکی زۆری له ئەمەریکاو زایۆنیزم وەرگرت تاوەکو شەڕ له نێوان ئێمەو ئێران بەردەوام بێ‌و تواناو هێزی عیراق لاواز بکەن تاوەکو نەتوانی له پێناو ڕزگارکردنی فەلەستین بەکاریان بێنێ . بەڵام هەر چەندە جەنگ درێژەی پێ بدرێ . سەرکەوتن هەمیشە هەر بۆ ئێمە دەبێ‌و عیراقیش هەموو هێرشێک‌و پیلانێکیان دەشکێنێ‌و لەناو دەبات .

و ٣ : بەڵێ ڕاستە سەرۆکی فەرماندە تێکۆشەر صدام حسین دێتە ریزی سەرکردە مەزنەکانی مێژووی هاوچەرخانە مێژوو بەتیپی زێڕین ڕۆڵی ئەو سەرۆکە تێکۆشەرە له سەر لاپەڕەکانیدا تۆمار دەکات ، سەرۆکمان ئیسپاتی کرد کە پاڵەوانی ئاشتییەو هەوڵ دەدات پەیوەندیی دراوسێیەتی له گەڵ دراوسێکان خۆش بکات‌و پەیوەندیی ڕاست‌و دروستیش له گەڵ دەوڵەتە گەورەو بچووکەکانیش بدۆزێتەوەو بچەسپێنێ هەر وەها بەردەوام بەرگری له مافی گەله بێ دەسەڵاتەکانی کردووەو دەکات .

له گەڵ ئەم ڕاستیانەشدا ، سەرۆکمان پاڵەوانی جەنگیشە ، چونکە توانی ڕوو بە ڕووی دەستدرێژییەکەی ئێران بوەستێ‌و دەرسی کوشندەییان بداتێ‌و بۆ هەموو جیهان بسەلمێنێ کە شارەزاییەکی تەواوو پسپۆڕانەی له جەنگدا هەیەو به واتای وشه سەرکردەیەو له جەنگیشدا ئازاو زیرەک‌و مەلەوانەو هەر ئەو بوو به زیرەکی خۆی دەستدرێژیی پێنجەمین سوپای له جیهاندا ڕاگرت‌و شکاند ، هەر ئەوە سەرکردایەتی جەنگی ڕەواو بەرگریمان به ئازایانەو به درێژایی ئەو چەند ساڵەی ڕابردوو دەکات .

باسی ڕۆڵی ئەو سەرکردە مەزنە لەم چەند دیرەدا بەتەواوی‌و به پێی پێویست ناکرێت‌و به کورتی دەڵێم سەرۆکمان جێگایێکی فراوانی له لاپەڕەکانی مێژوودا گرتووە .

و ٤ : له یەزدانی مەزن دەپاڕێمەوە هەمیشە سەرۆکی خۆشەویستمان تێکۆشەر صدام حسین بپارێزی‌و تەمەنی درێژ بکات‌و هەروەها شۆڕشی ١٧و ٣٠ تەمموز بەردەوام بەرهەم‌و دەستکەوت بدات‌و جەنگ به سەرکەوتنی ئێمە به سەر خومەینییەکان کۆتایی پێ بێت .

## بەڕێز محمد پیرۆز ڕستم
## ئەمینداری پەروەردەو فێرکردنی باڵا



و ١ : سەرکەوتنی شۆڕشی ١٧و ٣٠ تەممووزی پیرۆز به سەرۆکایەتی پارتی بەعسی سۆشیالیستی عەرەب‌و سەرۆکی مەزن صدام حسین ، خودا بیپارێزێ ، گەلی عیراق بەکوردو عەرەب گەیاندە بارێکی پێشکەوتووو باش‌و خوورەوشتێکی شۆڕشگێڕانەی بەرزی له نێو خەڵکدا چەسپاندو بڵاوکردەوەو له

گشت شوێن‌و سووچ‌و قوژبنێکی ئەم وولاتە گۆرانکارێکی تەواو سەری هەڵدا . ئەمەش زیرەکی‌و دووربینیی پارتە سەرکردەکەمان بۆ دەسەلمێنیٚ .

شۆرشی ١٧و ٣٠ تەمووز گەلیٚ دەستکەوتی گەورەی وەك : خۆمالی کردنی نەوت‌و بەرەی نیشتمانی‌و چارەسەرکردنی کێشەی کوردو . . هتد بۆ گەلەکەمانی جیٚبەجیٚ کرد .

ناوچەی کوردستانیش بایەخدانێکی تەواوی لەلایەن سەرکردایەتی پارت‌و شۆرش لە سەرروویانەوە تێکۆشەر صدام حسین ، بەخۆیەوە بینیەوە دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی رۆلی خۆی لە چەسپاندنی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردو هوشیار کردنی خەلك‌و چەسپاندنی گیانی نیشتمان پەروەری لە نێو خەلکی کوردستان‌دا دەبینی ، ئەمە جگە لە دابین کردنی هەموو جۆرە پێویستیەك بۆ گەلی کوردمان لە چوارچیوەی نیشتمانێکی یەکگرتوودا .

و٢ : پارتمان ، پارتێکی شۆرشگێرو پێشرەوەو هەموو جەماوەری گەلەکەمان لە دەوریدا کۆبوونەتەوەو گەلەکەمان ئامادەیە بە هەموو جۆرە چەکێك دژی دوژمنان بجەنگێت . ئێمە خاوەن حەقین‌و بە هێزین دوژمنیش لەهەق دوورەو بۆیە لاوازو بیٚ هێزەو لە شکستی دایە . سەرکەوتن هەر بۆ ئێمەیەو گەلێك رابەری صدام حسین بیٚ مردنی بۆ نیەو مەحالە ببەزی‌و بدۆرێنی .

و٣ : سەرکردەی مێژوویی تێکۆشەر صدام حسین خودا بیپارێزیٚ‌و تەمەنی درێژ بکات ، بە واتای ووشە سەرکردەیەو بە دەگمەن سەرکردەی ئەوها بە درێژایی مێژوو هەلدەکەویٚ یاخود پەیدا دەبیٚ . سەرکردەمان عیراقی نویٚی دامەزراندو بە بیرو هۆشە پێشکەوتووەکەی سەرکەوتنی مەزنی بەسەر دوژمن وەدی هێنا . . سەرۆکمان رۆلێکی بە وەفاو دلسۆزە بۆ گەل‌و سەرکردەیێکی مێژوویی کاروانی گەلەو لە ژێر رۆشنایی بیروراکانی بەسەر تەنگ‌و چەلەمەدا زالیٚ دەبین‌و سەرکەوتن ئەنجام دەدەین .

و٤ : بە بۆنەی تێپەر بوونی ١٨ سالیٚ بەسەر سەرکەوتنی شۆرشە سپی‌یەکەمان شۆرشی ١٧و ٣٠ ـ تەممووزی سالی ١٩٦٨وە پیرۆزبایی لە سەرکردایەتی پارتە تێکۆشەرەکەمان دەکەم . هەروەها سلاو لە سەرۆکی تێکۆشەرو مەزن کاکە صدام حسین (خودا بیپارێزی) دەکەم‌و سوپاس بۆ گۆڤاری کاروان کە ئەم دەرفەتەی بۆ رێکخستم‌و لاپەرەکانی بۆ ئەم ووشانەم ئامادە کرد .

## بەرێز حمید محمد سعید
## ئەمینداری کشت‌وکال‌و سازکردنی زەوی‌و زار



و١ : لە ١٧و ٣٠ی تەممووزی ئەمسالیٚاندا سالی ١٩٨٦ جەماوەری عیراق ئاهەنگ‌و زەماوەند بە بۆنەی تێپەر بوونی ١٨ سالیٚ بەسەر سەرکەوتنی شۆرشی ١٧و ٣٠ی تەممووزی نەتەوەیی‌و سۆشیالیستی بە سەرکردایەتی پارتی بەعسی سۆشیالیستی عەرەب‌و سەرۆکی تێکۆشەر صدام حسین «خودا بیپارێزیٚ» دەگێرن .

شۆرشی ١٧و٣٠ی تەممووزی پیرۆز گۆرانکارێکی تەواوی لە ژیانی خەلکی عیراقدا ئەنجامداو برایەتی‌و دۆستایەتی‌ی لە نێو خەلکدا پتەوتر کردو لە تەمموزی سالی ١٩٦٨داو تا ئەمرۆ گەلیٚ هەنگاوی شۆرشگێرانە هاوێشتراو گەلیٚ دەستکەوتی جۆراو جۆر جیٚبەجیٚ کراو ئەو منالەی لە سالی لەدایك بوونی

شۆرش‌دا لەدایك بووە ئێستا بۆی هەیە چەك لە ڕیزی سوپای عیراقیان هەلگریۆ بێگومان جەنگاوەرێکی باشی لێ هەڵدەکەوێ چونکە لە باوەشی شۆرشدا پەروەردە بووەو گەورە بووە .

شۆرشی ١٧و٣٠ی تەمووزی پیرۆز شۆرشێکی گەورەو مەزنە ، ڕووی عیراقی بە تەواوی گۆری هەر چەندە ناحەزان شەوو رۆژ هەولیان داوەو هەولێ دەدەن بۆ ئەوەی ویستی خەلکی عیراق بخنکێننو چیتر ڕێگا بە شۆرشی ١٧و٣٠ی تەمموز نەدەن هەنگاو بەرەو چەسپاندنی سەربەخۆیی وولات بەوێژیو ژیانێکی پڕ لە کامەرانیو بەختەوەری بۆ گەلی عیراق دابین بکات . بەلام خەیالی ئەو هێزە ڕەشانە خاوەو جەماوەری عیراق بە سەرۆکایەتی تێکۆشەر صدام حسین دەزانێ چۆن شۆرشی خۆی بپارێزیو لە بەرەکانی جەنگدا دژی هێرشی خومەینیی تاوانبار بجەنگیۆ قوربانی بدا .

یەکێ لە هەرە دەستکەوتەکانی شۆرش چارەسەری مەسەلەی کورد بوو کە لە ڕێگای دەرخستنی بەیاننامەی ١١مارتو یاسای ئۆتۆنۆمی چارەسەرکرا بەم جۆرە لاپەرەێکی نوێی پڕ لە برایەتی لە نێوان عەرەبو کورد کرایەوەو پتر لە جاراندا یەکێتی گەل چەسپاو قایم کرا .

لە پالێ چارەسەرکردنی کێشەی کورد شۆرش چەند هەنگاوێکی تری بۆ گەلی کورد هاوێشت وەك دەرکردنی یاسای ژمارە ٩٠ی سالی ١٩٧٥و تەرخان کردنی پارەێکی زۆر بۆ کردنەوەی دەیەها ڕێگاو شەقامو قوتابخانەو کارگەو پیشەسازیی بەرهەمدارو ئاوەدان کردنەوەی ناوچەکە . . هتد .

و٢ : هەر چەندە ئێرانی دوژمن بەردەوام لە شکستی دایە بەلام ئەو هێزە ڕەشە نایەوێ دان بەراستی بنیۆ پەیرەوی ڕێبازی ئاشتیو گفتوگۆکردن لە سەر کێشەی نێوان ئێمەو ئەوان بکات . هەرێمی عیراقیش سەرەرای توانایو سەرکەوتنی بەردەوامی لە بەرەکانی جەنگدا هەمیشە هەر بڕوای بە ئاشتیو گفتوگۆ کردن هەیە بۆ چارەسەر کردنی کێشەی نێوان ئێمە ئەوانو بۆ ڕاگرتنی شەر .

ئەوانەی لە تاریکیدا بۆ لە ناوبردنی عیراق تێدەکۆشنو هەولۆ تەقەلا دەدەن خەیالیان خاوەو جگە لە شکستیو بەزین بەولاوە چیتریان پێ نابرێ . عیراقێك تێکۆشەر صدام حسین ڕابەرایەتی بکات بەزینی بۆ نییەو نابێ .

و٣ : سەرۆکی تێکۆشەرمان هەڤالێ صدام حسین ، خودا بیپارێزیو تەمەنی درێژ بکات . هەموو سیفاتو نیشانەکانی سەرکردە مەزنەکانی مێژووی گەلانی دنیای لێ بەدی دەکرێ . گەر هاتو زانیان کە هەر خۆیەتی سەرکردایەتی هێزە چەکدارەکانمان دەکاتو نەخشەی سەربازیو سەرکەوتنو لێدانی دوژمنی بۆ دادەنێت . سەرۆکمان وەك سەربازێکی بە وەفا سەر لە بەرەکانی جەنگ دەداو وەك هەموو جەنگاوەرێکی بەشەرەف تێدەکۆشیو خەبات دەکاتو ئامادەیی خۆی بۆ وەرگرتنی شەرەفی شەهادە پیشان دەدات ، گەر ئەو ڕاستییانەمان زانی ئەو کاتە گەورەیی ئەم سەرکردە مەزنەمان بۆ دەردەکەوێ لە گەلێ ئەم ڕاستیانەش‌دا سەرۆکمان بەراستی پالەوانی ئاشتیشە هەر ئەوە بەردەوام هەلوێستی خۆی بۆ ڕاگرتنی شەر بەدیار دەخاتو داوا دەکات چیتر خوێن نەرژیۆ هەر ئەو دامەزرێنەری عیراقی گەورەو نوێۆ مەزنە .

و٤ : دوا ووشە دەمەوێ لەسەر لاپەرەکانی گۆڤاری کاروانی خۆشەویست بیلێم : پیرۆزبایی لە گەلی عیراقی مەزن دەکەم بە بۆنەی یادی ١٨ دەمین شۆرشی ١٧و٣٠ی تەمموزی پیرۆز . هەر وەها پیرۆزبایی لە سەرکردایەتی ڕامیاری پارتو شۆرشو لە سەرووەیانەوە تێکۆشەر صدام حسین دەکەم . سلاوو ڕێزم بۆ سەربازانی سەرۆك ئەوانەی شێرانە سنوورمان لە تەماعکاران دەپارێزنو زەبری کوشندە ئاراستەی جەرگی ئێرانی دوژمن دەکەن . ئومێدەوارم گشتمان بە کامەرانیو بەختیاری لەژێر ئالای شۆرش‌دا بژینو بەسەر دوژمنی ئەلقە لەگوێ زال بینو هیوادارم گۆڤارەکەتان هەر لە سەرکەوتن دا بێت .

# ئۆگستین سادق

ل سەریێ بهارا سالا ١٩٢٢ کو هێشتا مللەتێ تۆزا جەنگا جیهانی‌یا یەکێ ژخوە داتقوتاو دکر کو شێنوارێت هلوەشاندنو وێرانکرنێ رادەت ، دڤێ بارو دوخی‌دا ل باژێرەکێ ژووری ، بازێرەکێ بێ دەنگ . . خانێیت یاخێ ییێت ژێهاتی‌و جوان . . رویبارەکێ قەشەنگ ل ناڤ رەزو باغێت پر فێقی دزەلیێت . . ئەڤ دیمەنێت دلڤەکەر تەڤ‌دا ژ چیاییێت بەرزو بلندرا دگرنژن . . دخانیەکێ بچویکێ دلتزمڤە ل شەڤا ١٥ نیسانێ سالا ١٩٢٢ ستێرا مرادا ژخورتە ژنەکێ‌را گرنژی . . خودێ کورەك دایێ .

هوسا ل ڤێ دەمێ بهارێ بێ مشت بێهنا گول‌و گولزارا ل ناڤ کەنیا سروشتێ أوغسطین‌ی چاڤێت خو ل روناهیێ ڤەکرن .

دخێزانەکا بێ قام حەژ ئاخ‌و رەزو باغا دکر ، خێزانەکا جوتیار ل گەل خوشکا خویا مەستر رابو ل مالەکا کو رۆژانە خەلکی قەست دکرێ بداخازا وەرگرتنا شیرەت‌و ئاموژگاریا ژبابێ وی اسحق صادقێ موختار . ئەڤ زارو ل هێرە فێربو دێ چاوا گوهـ دەتە مەزنا ، ژبابێ خو بێ راست‌گوو پشت‌گرێ راستیێ هزرو بیرو رایێت راست وەرگرتن . پاکی‌و خاوێنی‌و سەربلندی ژدایکا خویا هێژا وەرگرتن .

ئەڤ زاروە سال بو سالێ مەزن بو ، ل خاندنگەها سەرەتایی ل دهوکێ سەیدایێت وی زیرەکی‌و چەلەکی د چاڤارا .یتن . ترس‌و ڤینا خودایێ مەزن هەر ژ بچویکاتی تژی دلێ وی وو نەخشێ رێکا ژیانا خوە ژ خوەرا هەلبژارت بو .

ل سالا ١٩٣٣ خاندنا خوە بکوتایی ئانی‌و بابێ وی دەینا بەر خاندنا ئایینی‌و پێ خوە هاڤێتە دەرازینکا پەیمانگەها (مار یوحنا الحبیب) یا کەهنوتا ل بازێرێ مویسل . دووازدە سال ژ جحێلینیا خوە ل ڤێ پەیمانگەهێ بوراندن‌و ژ کانیا فەلسەفێ‌و زمان‌و لاهوتێ ڤەخار .

دڤان سالادا پەندەکا گەشدار بو دراستی‌و دەرون پاکیێ‌داو دبینینا خوەیا شارەزایانەو دروست‌دا بو هەمی کارو بارێت دژیانێ روی ددەن . ل هێرە ژ سەیدا بسپورێت پەروەردێ فێربو چاوا دێ بیتە زەلام‌و چاوا دێ ئوبالێ ب ستو خوەڤە گریت‌و سەخبێریا براو هەڤالێت خو کەت‌و بەرێ وان دەتە رێکا خودێ ، ل هێرە فێری مل پەحنی‌و بێهن فرەهیی بو ل سەر نەخوەشی‌و ئاستەنگێت ژیانێ‌و نەهێلانا زورداری‌و پویچیێ .

ل سالا ١٩٤٥ خاندنا خوە یا کەهنوتی بکوتایی ئانی ، ئینا کرنە کاهن بناڤێ قەشە (أوغسطین صادق) ، ئو هاتە هەلبژارتن کو بکارێ ئەبرەشیا زاخوو نوهەدرا یاگلدانی رابیت . سێ سال رابو راندن ل بازێرێ زاخوو دهوکێ . . سێ سالێت پر بزاڤ‌و بەر ، پشتی هینگێ توشی ئێشەکێ بوو قەستا لبنانێ کر بو چارەسەریێ ل وێری سەرێ دوو سالا کەتە شەرەنیخ‌و هەڤرکییێ لگەل ئێشا خو تاکو دوماهیێ شیایێ‌و پشت لێ قراندی .

پشتی ساخ بوی ما ل (بەیروتێ)و ئەبرەشیا کلدانا ل وێرێ شول کر . کوڤارەکا هەیڤانە دەرێخست بناڤێ بابل . قەشە اوغسطین بێ دویری وەلات‌و کەس‌و کارو هەڤال‌و هوگرێت خو بو ، لێ خەلکێ لبنانێ چاوا نیاسین‌و لگەل رابون‌و رونشتن

ئەڤ بونە هەڤال‌و هوگرو دوستێت وی حەژێ کرن‌و وی حەژ
و ن کر . بو ماوێ ٢٥ سالا خوە داناسین وەکو ستێرەکا گەش ل
بنێ ، عیراقییەکێ ناڤدارو پێڤەهاتی د ناڤ کومەلێ
بەیروتێ‌دا . وەلاتێ وی عیراق هەمیشە ددلێ وی‌دا بوو ژ بیر
نەدکر .

سالێ جارەکێ سەرەدانەك دێینایێ . پشتی شەرێ لبنانێ دەست پێکری‌و ئێتوینا ئاگری سەرچقێت خو گەهاندینە بنەجها وی رابو ژوێرێ بارکرو ل سەرێ سالا ١٩٧٥ زڤری‌ڤە وەلاتێ خو بدلەکێ گەنج پر هیڤی‌و هومێد مینا چیا ، تێ‌یا ئەڤ وەلاتێ شرین پتر ئاڤەدان‌و ب هێز بکەڤیت ، ل هێرە ل دهوکا رەنگین رەندکێت کاری هلدان دێری ئاڤەدان‌و بەرفزەهـ دکەت شیرەت‌و سەخبێری‌یا خورتا دکەت‌و بو چاکیێ پالپیشتیا وان دکەت‌و دبزڤینیت . ژوان‌را یانەکا کومەلایەتی ڤەکر ل ژێر چڤدێری‌و سەرپەرشتیا وی بچالاکی‌و بزاڤێت خوێیت رەوشەنبیری رابون . ل سالا ١٩٨٥ ل ٢ تیرمەهی قەشە وغسطین‌ی مال‌ئاڤایی ژ دنیایێ کر ، ڤەمریا ئەو شەمالکا ئێزیکی ٥٠ سالا روناهی بەلاڤ دکر ، چلك بو ئەوکانیا زەلال ب پر ژ ئەڤین‌و دلنەرمیێ ، ل بازێرێ دهوکێ دەنگێ ناقوسێ هندبو بسەر بازێری ڤە دچو ئاوازێت خەمگین بەلاڤ دکرن ، رondك ژ خوەیێ خوەرا دباراندن . ل دیترا روژێ ئاهەنگەکا مەزن هاتەگێران ، زانایێت ئایینی ژ دهوك‌و موسل‌و زاخوو ئەنکویش‌و کەرکوك‌و هەڤلێر لێ بەرهەڤبون کو دیسان هژمارەکا مەزن یا بەرپسیارو وەلاتی‌یا ژموسلمان‌و فەلاً پشکداری دخاترخاستنا خودێ لێ خوشبوی‌دا کرن .

خودێ لێ‌خوش ئەڤینداری وەلاتێ خوەبو ، بێ‌قام شانازی ب مێژوو چەلەنگیا کورێت وی دکر ل گەل برێت نڤێژکەرا نڤێژێت تایبەتی دکرن ژ بو تەنایی‌و ئاشتیێ .

ل روژا ٩ ئابێ ١٩٨٥ دەستەکا رێڤەبەریا یانا نوهەدرا ئاهەنگەکا تەئبینیا مەزن دبیرهاتنا چل روژکا وی‌دا کر هژمارەکا هەلبەست‌و گوتارا هاتنە خاندن ، باسێ ژیان‌و سەرهاتیا لگەل



تێدا خویا کرن .

د . یوسف حبی یەك ژوان بیێ کو د گوتارا خوەدا ل ژێر ناڤنیشانێ «ئەزم بیێ وی دناسم» دبێژیت : کەسێ مەزن هەرو نابیت‌و دووگەها ژی نابیت من ل لبنانێ ناس کر کاهنەکێ خورتیێ‌و بیرو هزراو نوی ژەنیێ ، من ناسی وەکو مروڤەکێ رەوشەنبیر . . . ئەو ڤالاهی‌یا وی ل لبنانێ هێلای پر نابیت ، ئەگەرچی وی میراتەکێ لپەی خو هێلای هێشتا پەلێت گەشن بێژە گوریا ئاگرینە ، رویدانێت بژان یێت لبنانێ نەکارینە بکەنە خولەپەل‌و خولی . گەلەکێ زانا بو ددانا پرێت هەڤالینی‌و براینێ‌دا لگەل هەمیان ، شانازی ب هەڤالینێت خو هەمی دەما دبر ، لگەل عەرەباو لگەل کورداو لگەل فەلاو موسلماناو صابئیاو هەمی عیراقی‌یا .

خودێ لێ‌خوش دباناڤا رەوشەنبیری‌دا رەوشەنبیرەکێ پێڤەهاتی بو بوخو ب دەلیڤە دیت‌و لشتەکێ مەزن ل بەیروتێ وەرگرت وەکو بنگەهەکا رەوشەنبیری‌و کومەلایەتی‌و شارستانەتی ، داکو ئاڤاهیەکێ موکم دانیت‌و زانینێت خو زێدەبکەت باشترین‌و بنرخترین پەرتوك‌و ژێدەر کەتنە لەپی ، دیسان سەرەدانێت وی بو بازێرێت ئەوروپا بەرێ وی‌دا مەزنترین موزەخانا . خودێ لێخوشبوی هاریکاری‌و پشتەڤانیەکا مەزن دکر بو رەوشەنبیریا کوردی ل دهوکێ . لسەر پرشولی‌یا خوەرا ، دسەر ئێش‌و نەخوەشیێت خوەرا هەمی دەما ل کورو ئێڤارێت رەوشەنبیری ئامادە دبوو باغچێ یانا نوهەدرا دانابو دخزمەتا دام‌و دەزگەهێت رەوشنبیری‌دا ل دهوکێ وەکی ئێکەتیا نڤیسڤانێت کوردو رەوشەنبیری جەماوەرو دەزگەها رەوشەنبیری‌و بەلاڤکرنا کوردی . ئەڤ پشتەڤانی‌یە تم جهێ رێزو شانازی‌یا ئەڤ رەوشەنبیرابو .

● مەتین ●

# چاوگی سادە میحوەرێکە بۆ دروستکردنی چاوگی نوێ لە زمانی کوردیدا

پێشەکی

لە زمانی هەر میللەتێکدا سێ جۆر ووشە هەیە . وەك :

**١ – ووشەی خۆماڵی‌و رەسەنی زمان .**

**٢ – ووشەی وەرگیراو لە زمانێکی ترەوە .**

**٣ – ووشەی دروستکراو لەلایەن کەسانی پسپۆڕو لێهاتوو ئەدیبو نووسەرانی خاوەن زمان .**

ئێمە لەم ووتارەدا سەبارەت ووشەی دروست‌کراو لەلایەن کەسانی پسپۆڕو لێهاتوو ئەدیبو نووسەرانی کورد ئەدوێین .

لە زمانی کوردیدا بەپێی پێوانی زانستی زمان ووشەی نوێ هەیە . ئەم ووشە نوێیە چ چاوگ بێ یان ناو بێ یان ئاوەڵناو بێ یان ئاوەڵکار بێ بۆهەر یەکە لەم جۆرە ووشانە دەستوورێکی تایبەتی هەیە . کە بەهۆیەوە ناوی نوێ دروست‌بووە ، ئاوەڵناوی نوێ‌دروست‌بووە ، ئاوەڵکاری نوێ دروست‌بووە ، هەروا چاوگی نوێ دروست‌بووە ، لێرەدا ئێمە لەسەر ووشەی نوێ ، کە چاوگی نوێیە دەوەستین‌و هەندێك حاڵەتی دروست‌بوونی ئەم چاوگە نوێیە دەخەینە پێش‌چاو تا خوێنەرانی بەرێز ئاشنایەتی لەگەڵدا پەیدابکەین‌و شارەزای چاوگی نوێ بین لە رووی دروست‌بوونەوە .

لەبەر ئەوەی کە چاوگی سادە لە زمانی کوردیدا رۆڵێکی سەرەکی هەیە بۆ دروستکردنی چاوگی نوێ ئەم وتارەم ناونا بە «چاوگی سادە میحوەرێکە بۆ دروست‌کردنی چاوگی نوێ لە زمانی کوردیدا» .

بابەتی باس

چاوگ لە زمانی کوردیدا بابەتێکی زمانەوانی‌و رێزمانی گرنگە ، چونکە سەرچاوەیە بۆ پەیدا کردن‌و وەرگرتنی فرمان ، کە ئەویش لە عاستی خۆیدا ووشەیەکی بنچینەیە ، وەبەشێکی سەرەکی‌یە بۆ دروستکردنی رستە ، کە قسەی کوردی‌یە .

زمانی کوردی بە چاوگ دەوڵەمەندە . لە فەرهەنگی کوردیدا ژمارەیەکی زۆر چاوگ بەرچاو دەکەوێت ، ئەم چاوگانە لەزۆر رووەوە دابەش‌دەبن ، وەك دابەش‌بوونی لە رووی هێزەوە بەسەر تێپەڕو تێنەپەردا ، هەروەها لەرووی دروستبوونیشەوە دابەش‌دەبێ بەسەر چوار بەش هەروەك لە نەخشەی خوارەوەدا دیارە :



وێنەی (١)

بابەتی ئەم باسە چاوگی دارێژراوو لێکدراوو بارگرانە . لەم چاوگانەدا چاوگی سادە بەشداری‌دەکات‌و میحوەرێکە لە دەورەیدا پاشگر پێشگرو ناوو ئاوەڵناو کۆدەبنەوە چاوگی نوێ بەواتایەکی نوێ لە قەوارەی چاوگی دارێژراوو لێکدراو بارگراندا دروست‌دەکەن .

بۆ روونکردنەوەی ئەم بابەتە ، چاوگە نوێیەکان لە قەوارەی خۆیاندا یەکە یەکە باس دەکەین .

**١ – چاوگی دارێژراو**

ئەم جۆرە چاوگە ، چاوگێکە بەپێی نەخشەی خوارەوە دروست‌دەبێت ، کە بریتی‌یە لە :

١ – چاوگی دارێژراو = پێشگر + چاوگی سادە

٢ – چاوگی دارێژراو = چاوگی سادە + پاشگر

هەروا بۆ زێدە شارەزابوون نەخشەی دووەم دەخەینە پێش‌چاو کە بریتی‌یە لە :-



وێنەی (٢)

نموونە بۆ نەخشەی (أ) بریتی‌یە لە :



وێنەی (٣)

دکتۆر ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم
سەرۆکی بەشی زمانی کوردی / زانكۆی سەلاحەددین / [illegible]

لە نموونەکانی سەرەوەدا دیارە کە چاوگی سادە (کردن) میحوەرەو پێشگری (ڕا)ی بەدەوردا هاتووەو چاوگی داڕێژراوی (ڕاکردن)ی دروستکردووە ، چاوگی داڕێژراوی (ڕاکردن) چاوگێکی نوێیەو واتایەکی نوێش دەبەخشێ کە لە وشەی (کردن) زۆر جودایە .

وەنەبێ هەر تەنها پێشگری (ڕا) هەبێ بەدەوری چاوگی (کردن)ی سادەدا بسوورێتەوەو چاوگی داڕێژراو دروستبکات . بەڵکو زۆر پێشگر هەیە بەدەوری چاوگی سادە (کردن) دەسورێتەوەو چاوگی داڕێژراو بەیارمەتی چاوگی (کردن) بەواتایەکی نوێ دروستدەکەن وەك لەنەخشەی خوارەوەدا دیارە :—

پێدا دا ڕوو تێ پێ لێ پێوە ← کردن

وێنەی (٤)

هەروا وەنەبێ لەم زمانەدا هەر تەنها چاوگی سادەی (کردن) هەبێ‌و پێشگر بە دەوری خۆیدا بسوڕێنێتەوەو چاوگی داڕێژراو بە واتایەکی نوێ دروستبکات ، بەڵکو سەرەڕای ئەم چاوگە چاوگی تریش هەیە وەك :

(چوون ، هاتن ، گرتن ، بوون . ماڵین . خستن ، کەوتن . دان ، بردن ، بڕین . نان ، مان . شکان)

چاوگەکانی سەرەوە هەموویان چاوگی سادەن‌و جۆرەها پێشگری جۆراوجۆر وەردەگرن‌و چاوگی نوێ بەواتایەکی دروستدەکەن . لە قەوارەی چاوگی داڕێژراودا خۆیان دەنوێنن هەر وەك لە نەخشەکانی خوارەوەدا دیارە

ڕوو ڕۆ لا دەر لێرا تێرا پێدا
بێ تێ لێ تێك پێك وێك وێ
← چوون

نەخشەی (١)

ڕوو دەر لێ لێرا پێرا هەڵ ← هاتن

نەخشەی (٢)

هەڵ تێدا پێدا پێ
تێ لێ تێك پێك
← گرتن

نەخشەی (٣)

هەڵ پێ تێ لێ پێوە تێدا ← بوون

نەخشەی (٤)

هەڵ ڕا دا ← ماڵین

نەخشەی (٥)

دەر لێ پێش پاش دوا تێك ← خستن

نەخشەی (٦)

بەر ڕێ وێ پێك سەر ژێر
دەر لا پێ تێ هەڵ دا
← کەوتن

نەخشەی (٧)

لێ وێ ڕوو دا پێدا هەڵ
تێ دەر لا تێك پێوە
← دان

نەخشەی (٨)

لا لێ ← بردن

نەخشەی (٩)

دەر هەڵ دا سەر ← بڕین

نەخشەی (١٠)

ڕۆ تێ لێ تێك وێك ← نان

نەخشەی (١١)

لێرا تێرا پێ تێ وێ ← مان

نەخشەی (١٢)

پێ تێ تێك ← شکان

نەخشەی (١٣)

## ٢ - چاوگی لێکدراو

چاوگی سادە بۆ دروستکردنی چاوگی لێکدراویش هەروا میحوەرێکە ، وەك لە خوارەوەدا دیارە ، کە خۆی لەگەڵ ناوو ئاوەڵناوو ئاوەڵکار رێك دەخات . وەك

أ - ناو + چاوگی سادە = چاوگی لێکدراو

ب - ئاوەڵناو + چاوگی سادە = چاوگی لێکدراو

ج - ئاوەڵکار + چاوگی سادە = چاوگی لێکدراو

نەخشەکانی خوارەوە بەتەواوی رۆڵی چاوگی سادە لە دروستکردنی چاوگی لێکدراو روون دەکەنەوە وەك :










نەخشەی (أ ، ب) ئەوەمان پیشان دەدەن ، کە چاوگی (کردن) خۆی لەگەڵ ناوو ئاوەڵناوی (پینەو خۆش) رێکخستووەو لەگەڵ ناوو ئاوەڵناوەکەدا بووەتە میحوەرێك‌و دوو چاوگی لێکدراوی دروستکردووە ، دوو چاوگی نوێ بەواتای نوێ .

هەروا نەخشەی (ج) ئەوەمان پیشان دەدات ، کە چاوگی (کەوتن) بووەتە میحوەرێك‌و ئاوەڵکاری (سەر)ی کردۆتە چاوگێکی لێکدراو بەواتایەکی نوێ . وەنەبێ لەم زمانەدا هەر تەنها ووشەی (پینە) ، کە ناوێکە بتوانێ لەگەڵ چاوگی سادە (کردن)دا خۆی رێکخات‌و چاوگی لێکدراوی نوێ دروستکات ، بەڵکو کۆمەڵە ناوێك هەیە بەدەوری چاوگی سادە (کردن)دا دەسورێنەوەو چاوگی لێکدراو دروست دەکەن .

ئەم چاوگە لێکدراوە کە لە ناوێك‌و چاوگی سادە پێك دێت لە رووی واتاوە واتایەکی هەیە ، واتایەکی یەکگرتوو لە واتای ووشەی ناوەکەو نەخشەی خوارەوە ئەوەمان پیشان دەدات کە چۆن چاوگی سادە (کردن) دەبێتە میحوەر بۆ کۆمەڵە ناوێك‌و چاوگی لێکدراو دروست دەکات .

خێر هێلکە فێر زین ناڵ هاوار نوێژ ئامادە ڕەنگ
دروست نیشان شانە درز دزی باس بۆن کزج ← کردن

نەخشەی (١٤)

وەنەبێ لە زمانی کوردیدا هەر تەنها چاوگی سادە (کردن) هەبێ ، وەك میحوەر خۆی بنوێنێ‌و چاوگی لێکدراو دروست‌بکات ، بەڵکو سەرەڕای ئەوەش کۆمەڵە چاوگێکی تری سادەشی هەیە ، خۆیان لەگەڵ ناو ڕێك دەخەن‌و چاوگی لێکدراو دروست‌دەکەن وەك چاوگەکانی : (بوون . دان . کێشان . خواردن . هەر وەك لە نەخشەکانی خوارەوەدا دیارە :

ئامادە فێر ← بوون

نەخشەی (١٥)

خەبەر گڕێ غار هەوڵ بڕیار
جون پاڵ وەڵام نیشان ئاو ← دان

نەخشەی (١٦)

ئۆ نەفەس ڕۆح سەرما جگەرە بەرد ← کێشان

نەخشەی (١٧)

غەم سوێند نان چێشت ← خواردن

نەخشەی (١٨)

چاوگی سادە (بوون ، کردن) دەتوانێ لەگەڵ ئاوەڵناویش ڕێکخات‌و لەویشدا ببێتە میحوەر بۆ دروستکردنی چاوگی لێکدراو . هەروەك لە نەخشەی خوارەوەدا دیارە :

بەرین برسی تێر تەنگ خوار پان کورت درێژ گەورە بچووك تەسك سوور
زیز توڕە زەرد کەسك شین شەت ورد بێهۆش دڵشاد دڵخۆش نەخۆش سەرخۆش ← بوون

نەخشەی (١٩)

زەرد سوور کەسك گەورە درێژ ئەستوور زراو تەنگ فرە شێت خەست
شل . پەیت توند سەرخۆش بێهۆش ملکەچ سەربەرز دڵشاد دڵخۆش ← کردن

نەخشەی (٢٠)

## ٣ – چاوگی بارگران

هەروەك چۆن چاوگی سادە میحوەر بوو بۆ دروست‌کردنی چاوگی داڕێژراوو چاوگی لێکدراو . ئاواش میحوەرە بۆ دروست‌کردنی چاوگی بارگران .

دروست‌بوونی چاوگی بارگران لە زمانی کوردیدا زۆر دۆخی هەیە . بۆنموونە جاری وا هەیە . چاوگی بارگران لە پێشگرو چاوگی سادەو پاشگرێك ، یان لەگەڵ ناوو پێشگرو چاوگی سادەو پاشگرێك دێت . هەروا بەو جۆرە چاوگی بارگران دروست دەبێت .

له دروست‌بوونی چاووگی بارگراندا چاوگه ساده‌کانی (کردن ، بوون ، خستن ، که‌وتن ، نان ، بادان ، دان ، چوون ، هاتن ، سه‌ندن ، سووتان ، چنین ، پۆشین) ده‌بنه میحوه‌رو خۆیان له‌گه‌ڵ پێشگرو پاشگرو ناوو ئاوه‌ڵناوو به‌شی بێ واتاو ئامراز ڕێك‌ده‌خه‌نو چاوگی بارگران دروست‌ده‌که‌ن .

نه‌خشه‌کانی خواره‌وه به‌ته‌واوی حاڵه‌ته‌کانی چاوگی ساده وه‌ك میحوه‌ر له قه‌واره‌ی چاوگی بارگراندا پیشان‌ده‌ده‌ن .

نه‌خشه‌ی (٢١)

ڕاناوی‌خۆ پێشگر چاوگی ساده

خۆ پێوه کردن ← (خۆپێوه‌کردن

نه‌خشه‌ی (٢٢)

ئاوه‌ڵکار پێشگر به‌شی‌بێ‌واتا چاوگی‌ساده

جێ پێ له‌ق کردن ← (جێ پێ له‌ق کردن

بۆ ئاوه‌ڵناو نه‌بێ؟ بۆ ڕه‌گی‌فرمانه نه‌بێ؟ بۆ ناو نه‌بێ؟

نه‌خشه‌ی (٢٣)

ئاوه‌ڵناو چاوگی‌ساده پاشگر

پان کردن ه‌وه ← (پانکردنه‌وه

نه‌خشه‌ی (٢٤)

ڕه‌گی‌فرمان ناوگر ڕه‌گی‌فرمان چاوگی ساده

ته‌ و ته‌ و

گۆتن ه گۆت کردن ← (گۆته‌گۆت‌کردن

هات و چۆ کردن ← (هاتوچۆکردن

نه‌خشه‌ی (٢٥)

ڕه‌گی‌فرمان ناوگر ناو چاوگی‌ساده

هات و هاوار کردن ← هات‌و هاوارکردن

به‌شی‌بێ‌واتا ناوگر به‌شی‌بێ‌واتا چاوگی‌ساده

بۆ ڕه‌گی‌فرمانه نه‌بێ؟

چه‌ق ه چه‌ق کردن ← چه‌قه‌چه‌ق کردن

له نه‌خشه‌کانی (٢١ ، ٢٢ ، ٢٣ ، ٢٤ ، ٢٥)دا به‌ئاشکرا دیاره ، که چاوگی ساده (کردن) وه‌ك میحوه‌ر توانیویه‌تی خۆی له‌گه‌ڵ جۆره‌ها به‌شه‌کان ووشه‌کانی کوردی ڕێکخات چاوگی بارگران دروست‌کات .

هه‌روه‌ك (کردن)ی ساده چاوگه‌کانی نزیش ده‌توانن خۆیان بکه‌ن به میحوه‌رو خۆیان له‌گه‌ڵ چاوگه‌کانی ساده‌ی تریش ده‌توانن خۆیان بکه‌ن به میحوه‌رو خۆیان له‌گه‌ڵ به‌ش‌و ووشه‌و ئامرازه‌کان‌و پێشگرو پاشگر ڕێکخه‌نو چاوگی بارگرانی واتابه‌خش دروست‌که‌ن .

چاوگی (نان) میجوەرە لە چاوگی بارگراندا

پێشگر | پێشگر | چاوگی سادە → پێ لێ نان

پێ | لێ | نان

نەخشەی (٣٠)

ناو | پێشگر | چاوگی سادە → دان پێ نان

دان | پێ | نان

نەخشەی (٣١)

چاوگی (بادان) میجوەرە لە چاوگی بارگراندا

ناو | چاوگی سادە | پاشگر → سەربادانەوە

لە جیاتی (سەر) (سوکان) باباشتر بوو

سەر | بادان | ەوە

نەخشەی (٣٢)

چاوگی (دان) میجوەرە لە چاوگی بارگراندا

ناو | چاوگی سادە | پاشگر → دڵ دانەوە

دڵ | دان | ەوە

نەخشەی (٣٣)

ناو | پێشگر | چاوگی سادە → پەرە پێدان

پەرە | پێ | دان

نەخشەی (٣٤)

چاوگی (چوون) میجوەرە لە چاوگی بارگراندا

پێشگر | چاوگی سادە | پاشگر → پێداچوونەوە

پێدا | چوون | ەوە

نەخشەی (٣٥)

چاوگی (سەندن) میجوەرە لە چاوگی بارگراندا

ناو | چاوگی سادە | پاشگر → تۆڵە سەندنەوە

تۆڵە | سەندن | ەوە

نەخشەی (٣٦)

چاوگی (سووتان) میحوەرە لە چاوگی بارگراندا

ناو پێشگر چاوگی سادە

(زگ پێ سووتان

زگ پێ سووتان

نەخشەی (٢٧)

چاوگی (چنین) میحوەرە لە چاوگی بارگراندا

ناو پێشگر پێشگر چاوگی سادە

(تەنگ پێ هەڵچنین

تەنگ پێ هەڵ چنین

ئاوەڵناوە

نەخشەی (٢٨)

چاوگی (پۆشین) میحوەرە لە چاوگی بارگراندا

ناو پێشگر چاوگی سادە

(چاو لێ پۆشین

چاو لێ پۆشین

نەخشەی (٢٩)

## ئەنجام

لە نووسینی ئەم ووتارەدا چەند خاڵێك ئەنجام دەدەین ، کە بەپێی لێکۆڵینەوەو لێووردبوونەوە دەرکەوتوون‌و بریتین لەمانەی خوارەوە :

١ – چاوگی سادە لە زمانی کوردیدا ڕۆڵێکی سەرەکی هەیە بۆ دروستکردنی چاوگی نوێ

٢ – چاوگ لە زمانی کوردیدا بابەتێکی زمانەوانی‌و گرنگە .

٣ – زمانی کوردی بەچاوگ دەوڵەمەندە .

٤ – چاوگ لە زمانی کوردیدا لە ڕووی دروستبوونەوە چوار بەشە وەك :

١ – چاوگی سادە

٢ – چاوگی دارێژراو

٣ – چاوگی لێکدراو

٤ – چاوگی بارگران

٥ – هەر چاوگێکی سادە هەموو پێشگرو پاشگرەکانی سەر فرمان وەرناگرێ بەڵکو هەر کۆمەڵە پێشگرێك لەگەڵ چاوگێکی تایبەتیدا ڕێکدەکەوێ‌و چاوگی نوێ بەواتای خۆی دروستدەکات .

٦ – هەموو چاوگە سادەکانی زمانی کوردی پاشگر وەرناگرن ، بەڵکو لەناو هەموو چاوگەکاندا کۆمەڵە چاوگێکی تایبەتی هەیە هەر ئەوانە پاشگر وەردەگرن‌و چاوگی دارێژراوی نوێ بەواتای نوێ دروستدەکەن .

٧ – هەر ناوێك‌و ئاوەڵناوێك‌و ئاوەڵکارێك لەگەڵ هەموو چاوگە سادەکاندا ڕێك ناکەوێ لە دروستکردنی چاوگی لێکدراودا ، بەڵکو بۆ هەر چاوگێکی سادە کۆمەڵە ناوێك‌و ئاوەڵناوێك‌و ئاوەڵکارێك هەیە .

٨ – چاوگی لێکدراو ، کە لە ناوێك‌و ئاوەڵناوێك‌و ئاوەڵکارێك‌و چاوگێکی سادە پێك دێت لە ڕووی واتاوە واتایەکی یەکگرتوی هەیە لە واتای ووشەی ناوەکەو ئاوەڵناوەکەو چاوگە سادەکە جودایە .

## سەرچاوە


١ – دکتور ئیبراهیم عزیز ئیبراهیم ، موحازەرەکانی کۆلێجی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەدین .

٢ – دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف ، وشە ڕۆنان لە زمانی کوردیدا ، بەغدا . ١٩٧٧ .

٣ – دکتۆر ك .ك . کوردۆیێف ، ڕێزمانی زمانی کوردی بەکەرستەی دیالێکتەکانی کرمانجی‌و سۆرانی ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ (بەڕووسی) .

٤ – دکتور چ ، خ بەکایێی ، زمانی کوردەکانی یەکیەتی سۆڤیەت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ (بەڕووسی) .

٥ – دکتۆر ی .ی . نوکەرمان ، لێکۆڵینەوەیەك لە ڕێزمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٢ (بەڕووسی) .

٦ – Mackenzie D.N. Kurdish dialect studies, London 1961 – 1 — 6

٧ – Macaruc E. N. Akkurdish Grammar , New york , 1958 — 7

٨ – عبدالرحمن زەبیحی ، قاموسی زمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، بەغدا .

٩ – عبدالرحمن زەبیحی ، قاموسی زمانی کوردی ، بەرگی دووەم ، بەغدا .

١٠ – لیژنەی زمان‌و زانستەکانی ، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

# یەسو ساوك و چۆبان

هەردەوێڵ کاکەیی

خوێنەری بەرێز :

یەسو ساوك‌و چۆبان باوك‌و کورن «یەسو ساوك» باوکی «چۆبان»ە . ئەم دوو زاتە هەردوکیان شاعیرن‌و لە شیعر نووسیندا شارەزاییەکی چاکیان هەبووە ، داخی گرانم بەرهەمی ئەم دوو هۆنەرە وەکو بەرهەمی هەزارەها هۆنەرو ناوداری نەتەوەکەمان کۆ نەکراوەتەوەو ناویانیش تائێستا بە وون بوویی ماوەتەوە . جا لێرەدا بە دەرفەتی دەزانم چەند دێرێك لە ژیان‌و سەرگوزەشتەی ئەم دوو بەرێزەتان پێشکەش بکەم لەگەڵ هەڵبژاردەیەك لە شیعرەکانیان .

### یەکەم – یەسو ساوك

یەسو ناوی یوسف کوری جەمال کاکەیی یە ، بەناوبانگە بە «یەسو ساوك» یەسو کورتکراوەی «یوسف» ەو «ساوك» یش نازناو یەتی .

ساڵی (١٨٣١ز) لە دێی «قەڵخانلوی گەورە» لە هەرێمی «دووز خورماتوو» هاتووەتە دنیاوە ، بە منداڵی لای مەلاکانی ئەو سەردەمە فێری خوێندن‌و نووسین بووە ، پلەی زانیاری‌و زیرەکی بەرز بووە ، زۆربەی هۆنراوەکانی هەجوی کۆڵکە مەلاکان‌و شێخ‌و دەرەبەگەکانی ئەو سەردەمە دەکات . لە ناوەرۆکی بەرهەمەکانی وا دەردەکەوێت لە نووسین‌و دارشتنی شیعردا بە تایبەتی شێوەی هەجوو دەستێکی بڵندی هەبووە . گەلێ کەس لە پیرە پیاوان‌و زانایانی کاکەیی ناوی ئەم زاتەیان بیستووەو زۆر شتیش دەربارەی دەگێرنەوە . لەگەڵ شاعیری بەناوبانگی کورد شێخ رەزای تاڵەبانیدا (١٨٣٥-١٩٠٩ز) شەرە شیعریان کردووە . لە دەورو پشتی ساڵی ١٨٩٨ی‌ز شیعرێکی بۆ نووسیوە بە ناونیشانی «ئەی شێخ نمازت . ئەی شێخ نمازت» بەڵام بە داخەوە ناتوانین تەنها خشتێك لەو شیعرە بخەینە پێش چاوی خوێنەری ئازیز لەبەر ئەوەی لەگەڵ ئەدەب‌و خەڵکی ئەمرۆدا ناگونجێت چونکە سەرانسەری شیعرەکە جنێوو قسەی ناشیرین‌و تیرو توانجی نارەوایە ، جا پێش ئەوەی هۆنراوەکە بگات بە دەستی شێخ رەزا لە لایەن گرۆی نامەردانەوە سپێرراوە بە دارو دەستەی رژێمی عوسمانلی چەپەڵ ئەوانیش دەست بەجێ دەیگرن‌و لە کونجی بەندیخانەدا زنجیری دەکەن بە تاوانی زەندیق‌و بێ ئاینەوە ، تووشی گەلێ کۆسب‌و دەردەسەری دەکەن لە پاشان دەیانەوێ فەرمانی خنکاندنی بۆ دەربکەن بۆیە سەی خەلیل ئاغا کە سەرەك هۆزی کاکەیی



پەسو ساوك

ـوە ئەو سەردەمەدا شێرانە دەکەوێتە کۆشش و تەقەلا کردن ـکو مەردانە دەتوانێت لە بەندیخانەو خنکاندن رزگاری ـکات . بۆیە دەبینین شاعیر لەم چوار خوانیەدا گلەیی و سەر ـەشتی خۆی لە هەندێ کۆلکە مەلا دەکات و دەڵێ :-

ـە فتوای مەڵلای بێ دین و ئیمان
ـمشان حەبس کەرد چە گۆشەی زیندان
ـەب تۆ بە عەشق رەسوولێ نازدار
مەڵلای گەزاف واچ بکەر گرفتار

سەی وەلی کوڕی سەی سەلیم کاکەیی یە بەتیرە سەیید مستەفایی یە (١٧٨٠-١٨٧٤ز) یەکێکە لە سەرۆك هۆزەکانی کاکەیی ئەو سەردەمە ، لە دێی **«قەڵخانلوی گەورە»** دەنیشت ، ئەم ناودارە بە زیرەکی و وریایی و چاو تیژی و سواری ئازاو بە جەرگ ناوی دەرکردووە ، گەلێ پەسو ساوکی خۆش ویستووەو رێزی لێ گرتووەو هەمیشە دەستی یارمەتی بۆ درێژکردووە ، لە کارو باری گرنگدا بیرو رای سەندووەو زۆر حریش لە قسەی دەرنەچووە ، ئەم زاتە (٩) نۆ کوڕی هەبووە بەناو بانگترین کەسیان ئەمانەی خوارەوەیە کەوا وەچەیان پرش و بڵاو بوونەتەوە بەناو هەموو هۆزی کاکەییدا :-

«سەی کاکی ، سەی شەمسالی ، سەی قاسم ، سەی بەبلخ ، سەی مراد» .

پەسو ساوك ئەم دوو خشتەی شیعرەی لە سەر مردنی باوك و کوڕێکی سەی وەلی و مامی هەڵبەستووە کەوا ئافرەتەکانی هۆزەکەی لەگەڵێ شیوەندا دەیگێڕنەوە :

حەمید) و (سەلیم) شەمامەی دەس بی
هەر یەکێش وە رووی سەد هەزار کەس بی
هەر چە (ئاغجەمەشەت) تا (دامرقاپی)
گشت رۆرۆشانەن پەی ئاغە (کاکی) .

* * *

شاعیرمان لەگەڵ زانای ئاین پەروەری کاکەیی دەروێش ـەزەر گەرمیانیدا (١٨٧٦-١٨٧٥ز) پەیوەندی هەبووەو زانیاریشی لێی بەدەست هێناوە .

لە دەورو بەری ساڵی ١٨٨٨ی ز لە دێی (قەڵخانلوی گەورە) وە بار دەکەن بۆ دێی (هەفتەغار) ی داودە لە هەرێمی (داقوق) لەوێ بەشکارتە کێڵی و سەپانی و جوتیاری و شوانی و گاوانی ژیانی بردووەتەسەر لە پێناوی پەیدا کردنی نان و رۆزی بۆ ماڵ و منداڵەکانی .

شاعیرمان جارێکیان شکارتەکەی پاك کردووە لە خەرماندا عەلی ئاغا کە یەکێك بووە لە سەرۆکەکانی هۆزی (داودە) دەیەوێت زەکاتی لێ وەربگرێت ئەویش رووی لێ دەکاو پێی دەڵێ :

رەئیس (هەفتەغار) ئاغای هەردۆ زەن
تۆخوا عەلی ئاغا گۆزەی نەفت وە چەن
یەکێ چە بەرەی های نەفت های بۆ
چ تەور حوکماتش وی تەورە زەفت مۆ
سەدکە بەگزادەی خاڵوان (گلی)
عەیبێکت هەیە نەختێ وە ملی .

عەلی ئاغا بەبیستنی ئەم شیعرە گەلێ دڵ خۆش بووەو دەستی کردووە بە قاقای پێکەنین و لە زەکاتیش عافی کردووە . رۆژێکی تر عەلی ئاغا بۆ گاڵتەو گەپ سەر دەناتە سەری و پێی دەڵێ :

هۆ یەسوە کۆرە ، هۆ یەسوە کۆرە
جامیٚ ئاو بێرە دەستم بشۆرە
یەسویش لە قسەی خۆی دانامێنیٚو دەست بەجیٚ بەم دوو خشتە شیعرەی خوارەوە وەڵامی ئاغای ناو براو دەداتەوە :
کلاٚوی نەوو بنەر وە سەرت
بلە وە دمای پیشەی پدەرت
پیشەی پدەریت باوەرە وە سۆ
بچرە های پیاز ، یەکیٚ دوو وە جۆ
عەلی ئاغا هیچ دڵی تەنگ نەبووەو بە بیستنی شیعرەکە گەلیٚ دڵی خۆشیش بووەو سەرەرای ئەوە خەلاٚتیشی کردووە .
رۆژێك شێخ رەزای تاڵەبانی تووشی دەبێتە تووشی یەسو ساوکەوەو بۆ گاڵتەو پیٚ کەنین بە شێوە زاری (ماچۆ) پیٚ یٚ دەڵیٚ :
یەسو گاوەکە ، یەسو (گاوەکە) = گاو : گا ، مەبەست لە (بەراز)ە
چێشتان کەرد چەنی سیاە گاوەکە
وەختیٚ برئاما چە زویلاوەکە
شەق و پەقتان کەرد چە کەلاوەکە
یەسویش بەم جۆرە وەلاٚمی شێخ رەزا دەداتەوە :
کاك شێخ هەرەکە ، کاك شێخ (هەرەکە) = هەر : کەر ، مەبەست لە (کەمتیار)ە
دم کولٚو سم خر چەم سیاوەکە
خرەوەبپتان ماڵدارو بیٚ ماڵ
دەورتاندا چەنە وەك پیرە کەماڵ .

* * *

یەسو ساوك لە ساڵی ١٩٠٣ی ز لە دیٚی (هەفتەغار) ەوە دەگوێزنەوە بۆ دیٚی (عەرەب کۆیی) ناوچەی کاکەیی .
شاعیری چەوساوەکان خەلیل منەوەر (١٨٦٣-١٩٢٣ز) لە پارچە شیعرێکدا ناوی هێناوە وا لێرەدا چەند خشتێك لەو هۆنراوەیە دەخەینە بەر چاو :
گیای بەخت من بییەن سە پەلکە
مەعشووقم (هەمین مام ئەحمەد وەلکە)
ژەنیٚ بیٚ کەس بۆ بیٚ دایەو باوك
فێربۆ وە نەغمەی چریکەی چەکاوك
بچرۆ نەغمەی قەتارو لاوك
لایق وە (خەلیل) پەی (یەسو ساوك)
هەنی ئەو لایق نەبۆ وە هیچ کەس
دەك فەلەك قاپی یانەت بۆ دەرووەس
ل ١٠٣ دیوان خەلیل منەوەر

* * *

لە ساڵی ١٩٠٩ی ز لە تەمەنی (٧٨) ساڵیدا یەسو ئەمری خوای کردووەو لە گۆرستانی (حەواشەکان) لە دیٚی (عەلی سەرای) بە خاك سپێرراوە .
نموونەی شیعری گاڵتەو گەپی یەسو ساوك ئەمەی خوارەوەیە :
ئاغا ژەن برێشکە . . .
شاناش وە بان ساج نیم مەن برێشکە
زوڵف گرنج گرنج چوین قوڵف رەشکە
دوو مەمەی زل زل هەر وەکو مەشکە
چەنی کوچکانی گۆناش یەك رەنگ بی
مەواتت لالٚ بی ئەوەند بیٚ دەنگ بی
مشت مشت برێشکە وە دەم مەشانا
مەواتت وەحش رووی بیابانا
نموونەی شیعری غەزەلی ئەمەیە :
کنا نەزانی . . .
کنا نەرای عەشق هێمان نەزانی
خاوەن چەم سیاو وردە خالاٚنی
ساوای نەونەمام چواردە سالاٚنی
مەکەرەم ریسوای عێلٚو خێلاٚنی
دین و ئیمانم مەدەر تالاٚنی



چۆبانی یەسو ساوك

حەیف زەمرووتی بالأت دار سێوه
...ە كە ماچیٚ چەو گۆناو لێوه
...ەی عەنبەرین دوو دورش پێوه
...) نەعەشق دور شێت بیا لێوه

* * *

**دووەم – چۆبانی یەسو ساوك**

چۆبان کوڕی یوسف کوڕی جەماڵە ، لە ساڵی ۱۸۵۹ی ز لە دێی (قەڵخانلوی گەورە) لە خێزانێکی چەوساوە هاتووەتە ...وی جیهانەوە ، هەر بەمنداڵی لە ژێر دەستی باوکیدا فێری خوێندنو نووسین بووە ، باوکی بەناوبانگە بە (یەسو ساوك) ئەم ...وره سوارە شاعیرێکی پایە بەرزی سەردەمی خۆیەتی هەر ئەویش بووەتە هۆی هاندانی چۆبان بۆ ئەوەی بتوانیٚ شیعر بنووسیٚو ببێت بە شاعیرێکی لیٚ هاتوو چۆبان لە تاف لاویدا دەکەوێتە ئەوینی شۆخە کیژێکەوە ناوی (کیژان) بووە ، بەختیارانە لە ساڵی ۱۸۸۹ی ز ئەو دڵدارەی بە نسیب دەبێتو لەگەڵیدا زەماوەندی کردووەو بووەتە هاو ژیانی ، چۆبان وەك شاعیرێکی دڵ تەڕ گەلیٚ شیعری غەزەلی پاراوی بەسەردا هەڵبەستووە ، لەو ئافرەتە سیٚ کوڕی بووە (ئەمین ، سلێمان ، محەمەد) ، ئێستا نەوەی ئەو سیٚ کوڕەی لە دێی (تویلەبەن)و (وەردەك) دادەنیشن هەردوو گوندی ناوبراو دەکەونە ژووری شاری (موصلٚ)ەوە بە (٤٠) کیلۆ مەترێك . شاعیرمان بەناوە ڕاستەقینەکەی خۆیەوە شیعری داناوەو نازناوی نەبووە ، گەلیٚ کەس لە پیرە پیاوانی هۆزەکەی لە ناوچەی گەرمیان شیعرەکانی بە بەردایە بەڵام دەیدەنە پاڵ یەسو ساوکی باوکی چونکە ئەویان زیاتر ناسراوە لە چۆبانی کوڕی لە ناو خەڵکیدا ، هەندیٚ کەسیش شیعرەکانی هەردوکیانی تێکەڵو پێکەڵ کردووەو بە ...وی یەسویشەوە بۆ خەڵکی دەیگێڕنەوە بۆیە ئێمەیش لە سەر قسەی ئەو جۆرە کەسانە لە گۆڤاری بەیان ژمارە (۹۱)ی تشرینی یەکەم ساڵی ۱۹۸۳ی ز هەردو شاعیرمان بە یەك کەس ...یوەو شیعری هەردوکیانیشمان تێکەڵ بە یەك کردووە بەڵام لە

پاش تەقەلاو کۆششێکی زۆر بۆمان ساغ کرایەوە کەوا (چۆبان) و (یەسو ساوك) کوڕو باوکنو هەردوکیانیش شاعیرنو بەرهەمیانیش هەیە . بە پیٚی پلەو شێوەی دارشتنی هۆنراوەکانیانو ناوەکانیانو پرسیار کردن لە زانایان توانیمان زۆربەی ئەم هەرەمەیە لە یەك جیا بکەینەوە . چۆبان هۆنراوەی هەمە جۆری بە دیالێکتی (ماچۆ) هۆنیوەتەوە ، زۆربەی بەرهەمەکانی سۆفیگەریو غەزەلین ، بەپیٚی ئەوەی شێوەی ئەوینی (غەزەلی) زیاترە بۆیە دەتوانین بڵێین شاعیر لە کاتی لاوێتیدا دەستی بە شیعر هۆنینەوە کردووە .

لە ساڵی ۱۹۰۳ی ز.دا لەگەڵ ماڵی باوکیدا لە دێی (هەفتەغار)ەوە بار دەکەن بۆ دێی (عەرەب کۆیی) ناوچەی کاکەیی ، لە پاش هەشت ساڵ واتە ساڵی ۱۹۱۱ی ز لەوێوە بار دەکەن بۆ دێی (وەردەك) لە هەرێمی شاری (موصلٚ) .

شاعیری نەمر بە زانایەکی ئاین پەروەری کاکەیی ئەو سەردەمە دەدریٚ لە قەڵەم ، پیاوێکی گەنم ڕەنگو باڵا ناوەندی بووە ، خاوەن جووتیٚ سمێڵی قیتەڵانە بووە ، پیاوێکی ڕوو خۆشو میوان دۆستو سەر ڕاست بووە مرۆڤی زیرەكو هۆشمەندی خۆش ویستووە . هەق خوازو هەقیقەت پەرست بووە . دۆستایەتی لەگەڵ زانای ئاین پەروەری کاکەیی سەی سلێمانی پەلکە زێڕیندا (۱۸۵٦–۱۹۳۷ز) بەتین بووە .

گەلێ جار لە ڕێی شیعرەوە دژی زۆرداران و دەرەبەگەکانی ئەو سەردەمە ڕاوەستاوەو داوای مافی هەژاران و بێ لایانی کردووە .

کاك چۆبانی شاعیر لە ساڵی ١٩٢٥ی ز کۆچی دوایی کردووەو ماڵ ئاوایی لە نەتەوەکەی و ئەدەب و ئەدەب دۆستان کردووەو لە گۆرستانی گومەتی (شاه هەیاس) لە نزیك دێی (وەردەك) لە سەر لێواری ئاوی غازر (زێی گەورە) بە خاك سپێرراوە . ئەمەیش سێ پارچە هۆنراوەی چۆبانی نەمرە :

« ١ »

یاران چە دەردم . . .
کەس ئاگاش نییەن دۆستان چە دەردم
چە ناڵەی شەوان چە ڕەنگ زەردەم
چە شین و گرین هەناسەی سەردم
خەڵکان گشت ماتەن چە هوناو دیدەم
وێش کەرد بێگانە یار بەرگوزیدەم
بڵێسەی ئاور سینەی زامدارم
جەرگم سیاو کەرد سوچنا دەمارم
سەر تا پا ئەعزای تەن بی وە توتیا
دڵەی لاوازم تك تك تاویا
ئەوەند واتم یار زوبانم بی لاڵ
یار بە چەم نەدیم پشتم بی خرخاڵ
فرە هانام بەرد وە یاوەر وە دۆس
تا وێنەی نەسیم منیش کەندم پۆس
ئەوەند بە دەنگ بەرز من کەردم هەیهاو
بێزار بی هامسا گە مەحروم چە خاو
«چۆبان» فەرد شیوەن مەکەرە تەطویل
تاچینە زیاتر نەویەنی ڕەزیل

« ٢ »

ئەمشەو چە خاودا . . .
ئەمەشەو دیم شیرین چە شیرین خاودا
قرمز بی گۆناش لێوش مەیل ئاڵین
دەم وە خەنەوە ئاما وە باڵین
واتم تۆ بە عەشق زوڵف سیاه مارت
پەی خاتر دیدەی مەست و خومارت
عەشق ماچۆ ماچت دەرمانش پێوە
ماچێ ببەخشە چەو شیرین لێوە
ئاما وە جەواب ئەو خان وێرانە
وات هەتیم پەی ماچ مەبەر دێوانە
ماچ ! ببەخشە ماچ دەس چە گەردەن کەر
لێوو گۆناو خاڵ یەك یەك ماچ بکەر
چە ناز دڵبەر چە شڵپەی ماچ ماچ
ئامام وە خەوەر نە ماچ بی نە واچ
بە «چۆبان» واتەن عەشق وە سۆزەوە
عاشق و ماشووق وە دڵسۆزەوە

« ٣ »

برا فەقیرم . . .
برا چە سەر حەق من تای فەقیرم
فەقیرەن کاکۆم فەقیر باپیرم
فەقیر دایەمەن فەقیرەن پیرم
فەقیر برامەن فەقیرەن یارم
فەقیر خێشمەن فەقیر دەسبارم
فەقیر گشت کەس و براو باوانم
فەقیرەن مامۆو میمزاو خاڵوانم
هەر کەسێ باچۆ وە فەقیر خەراو
ئانە هەتیمچە هەم پوشت و ناپیاو
گەر وات دەوڵەمەن چە فەقیر خاسەن
نەزان و نادان بێ هۆش و کاسەن
کێ دی فەقیران چە ڕۆژ هەیهات
وێنەی ئەغنیا وێشان کەران مات
«چۆبان» وەس واچە حیکایەت فەقیر
دارا وە سەرووەت مەکەرۆت زەویر

علی فتاح دزەیی

# لێکدانەوەی بیروباوەڕی «خانی»

«تێبینی : ئەم باسەش ، بەشێکی دیکەی دەستنووسێکە جیرەی (خانی و مەم و زین ـ ەکەی) . بەداخەوە ، کە دەستم بە بڵاوکردنەوەی کرد ، زنجیرەی بەشەکانیم پچڕاند . ئەوەبوو بەشی پێش کۆتایی ی ، لەژێر ناوی (هونەرەکانی بەلاغەت لە مەمو ـ زین دا) کەوتە ژمارە (٢٤)ی گۆڤاری (کاروان) . هەروەها بەشێکی لەژێر عینوانی ( داستانی مەمی ئالان ـ کە سەرچاوەی مەم و زین ـ ی خانی یە) . لە ژمارە (٣)ی ساڵی ١٩٨٥ی گۆڤاری (نووسەری کورد)دا بڵاوکرایەوە . بەشێکیشی کە (بەراووردکردنی مەم و زین لەگەڵ داستانی مەمی ئالان)ە ، لە ژمارە (٤٣)ی گۆڤاری (کاروان)دا ، کەوتە پێش چاوی خوێنەران . هیوادارم ، کە بەشەکانی دیکەشی بڵاویکەمەوەو ئەگەر بۆیشم گونجا ، لە داهاتوودا لەنێو دوو لا بەرگی کتێبێکدا ، کۆیان بکەمەوە) .

« علی »

### ١ ـ فەلسەفەو تەسەووف لە بیری ئیسلامیدا .

لەوەتی ئادەمیزاد هەستی بەهەبوونی خۆی کردوە ، هەوڵی ئەوەی داوە کە لە رازی هەبوون (وجود) بگات و تەلەسمی ئەم کەون و جهانە لێکبداتەوە . ئەو بیرو باوەڕیانەی ، کە لەم بارەوە کۆی کردۆتەوە ، شێوەیێکی ئەفسانەیی وەرگرتوەو بوە بە ئایینێکی پیرۆزو تەقلیدی ، ئەمجا ، لەو وەختەوەی کە گومانی لەم جۆرە بیرو باوەڕیانەی پەیداکردوەو بۆ وەرگرتن و تاقی کردنەوەی زانیارییەکانی ، هەست و هۆش (حس و عقل)ی بەکارهێناوە ، زانیاری فەلسەفە پەیدا بوە . کەواتا ، لە بنەڕەتا ، فەلسەفە ، زادەی گومان (الشك)ە[1] .

(فەلسەفە)ش ووشەیێکی لێکدراوی یۆنانی ی کۆنەو ، لە دوو ووشەی (فیلۆ = دۆست)و (سۆفیا = دانایی) دروست بوە . لە ئەسلدا ، شارەزایەکانی ئەم لقەی زانیارییان بە (فیلۆسۆفۆس = دۆستی دانایی) ناوبردوە ، لە پاشاندا ئەم زاراوە ، بوە بەناوی زانیارییەکە[2] .

فەلسەفەش بەرهەمی مێشکی یۆنانیەکانەو کۆنترین بیری فەلسەفی دوگەڕێتەوە سەردەمی فەیلەسووفەکانی (ئەیۆنی = کناری رۆژئاوای ئەنادۆل) . (تالیس)و (ئەنەکسیمەندەر)و (ئەنەکسیمینس) ، کە لە سەدەکانی حەوتەم و شەشەمی پێش میلادا ژیاون ، ماددەیان بە ئەسل و بە سەرچاوەی هەبوون (وجود) داناوە . ئەو فەیلەسووفانە ، کە لە جهان راماون ،

دیتوویانه له یێك جۆره شت (مادده) ، پێکهاتووه‌و ، ئه‌م شته‌ش ، هه‌میشه له گۆڕاندایه‌و ، توانایی گۆڕان‌و پێگه‌یینیشی له خودی خۆیدا هه‌یه . ئه‌مجا ، به‌گوێره‌ی ئه‌م رامان‌و دیتنه‌یان ، گوتویانه ئه‌و هه‌موو هه‌بوونی بێ سنوورو پایانه (خودا)یه‌و (خودا)و کایینات یه‌کێکن‌و له یێکتر جودا ناکرێنه‌وه [٣] .

گرنگترین قۆناغی فه‌لسه‌فه‌ی یۆنانی ، له سه‌ده‌کانی پێنجه‌م‌و چواره‌می پێش له میلادا بوه . له‌و ماوه‌یه‌دا ، گه‌شترین ئه‌ستێره ، له ئاسمانی بیری یۆنانیدا هه‌ڵاتوون .

(سۆکرات)و (ئه‌فلاتوون)و (ئه‌ریستۆ تالیس) ، له‌و دوو سه‌ده‌یه‌دا ژیاون‌و هه‌ر یێکه‌یان ، به‌ریز ، مامۆستای ئه‌وی دوای بوه . بناغه‌ی فه‌لسه‌فه‌ی عه‌قلی له‌لایه‌ن ئه‌وانه‌وه دامه‌زراوه ، به‌ڵام ئه‌م فه‌لسه‌فه‌یه‌و زانیاری مه‌نتقیش (Logic) ، له لایه‌ن (ئه‌ریستۆ)وه ، گه‌یاندرایه چله‌پۆپه‌ی‌و بۆیێکه تاهه‌تا نازناوی (مامۆستای یێکه‌م = المعلم الأول)ی بۆ ماوه‌ته‌وه [٤] .

به‌پێی رامانی فه‌لسه‌فه‌ی عه‌قلی ، هه‌بوون (وجود) ، له (هۆ = سبب)و (ئه‌نجام = نتیجة) پەیدابوه . له‌به‌ر ئه‌وه‌ی به پێچه‌وانه‌ی مه‌نتیقیان زانیوه ، که ئه‌م ئه‌نجام‌و هۆیانه به‌بێ سه‌ره‌تابن ، هه‌بوونی هۆی یێکه‌مین (السبب الأول) یان به پیویست داناوه . ئه‌م هه‌بووی پێویست (واجب الوجود)ه‌ش له هه‌موو بارێکه‌وه ، ته‌واوو ئه‌زه‌لی‌و تاهه‌تایه . هه‌ر له ئه‌زه‌لیشه‌وه کاری له (هه‌یۆلا = مادده‌ی بێ دیمه‌ن‌و بێ ره‌نگ‌و بێ شێوه) کردوه‌و بزواندوویه‌تی . ئه‌و هه‌موو هه‌بوونی مادده‌ی‌ی جۆراوجۆره به‌شێوه‌ی (هۆ-و-ئه‌نجام) ، له‌م (هه‌یۆلا)یه‌وه هاتوه‌ته کایه ، به‌ڵام ، هیچ ماده‌یێکی زه‌مانی له نێوانی (هۆی یێکه‌م = هه‌بووی پیویست) و (هه‌یۆلا)دا نه‌بوه . هه‌ر دوویان وه‌کو یه‌ك کۆنن . پێوه‌ندی‌ی نێوانیان وه‌کو پێوه‌ندی‌ی نێوانی (هۆ)و (ئه‌نجام)ه ، هه‌لبه‌ت (هۆ)ش له (ئه‌نجام) له‌پێشتره بێ ئه‌وه‌ی ماوه‌یێکی زه‌مانییان له‌نێواندا هه‌بێ [٥] .

به‌رامبه‌ر به‌رێبازی فه‌لسه‌فه‌ی عه‌قلی ، رێبازێکی دیکه سه‌ری‌هه‌ڵداوه ، ئه‌ویش رێبازی (سۆفیزم) یاخود رێبازی فه‌یله‌سووفه‌کانی سۆفی‌یه که به‌ناوبانگترینیان (ئه‌فلۆتین : ٢٠٣-٢٦٩ زایینی) بوه .

به‌گوێره‌ی رامانی ئه‌م فه‌لسه‌فه‌یه ، (هه‌ست‌و هۆش = الحس والعقل) دوو هێزیان دوو ئه‌مرازی ناته‌واون‌و جێگای باوه‌ری‌و دڵنیایی نین‌و هه‌رگیز ناتوانن له سنووری جهانی ماددی ده‌ربچن‌و زانینی راست په‌یدابکه‌ن . زانینی راست (المعرفة الحقیقیة)ش ، له‌لای ئه‌مانه ئه‌و زانینه‌یه که (گیانی گشتی = النفس الکلیة) خه‌ڵاتی گیانی تاك (=جزئی)ی ده‌کات .

واتا ، گیانی ئاده‌میزاد ، له‌کاتی ژیانی جهانییدا ، توانای هه‌یه بۆ ماوه‌یێکی زۆر که‌م ، خۆی له به‌ندو کۆتی له‌ش رزگاربکات‌و به (گیانی گشتی) بگات . ئه‌مجا له‌و له‌حزه‌ی زه‌مانییه‌دا زانینی به‌راستی په‌یداده‌کات‌و راستی‌ی هه‌بوون (حقیقة الوجود)ی بۆ ئاشکرا ده‌بێ . به‌م بابه‌ته‌ی زانینه‌ش ده‌گوتری (گنۆسیس = Gnosis) یاخود ، (ئیشراق = وه‌حی‌و ئیلهام) [٦] .

بیری (هیندی)ش ، (خوداوه‌ند ، یاخود (راستی‌ی موتله‌ق) به‌هه‌بوویێکی ئه‌وتۆ ده‌زانێ که هه‌رگیز (چاو)و (زمان)و (مێشك) ، ناتوانن شاره‌زاو ئاشنای ببن ، چونکه له هه‌موو شتێکی زانراو جیاوازه‌و گه‌لێك له نه‌زانراو (مجهول)یش بالاتره [٧] .

به‌پێی رامانی بیری هیندی ، زانینی راستی ، له رێگای (یۆگا)وه ، په‌یدا ده‌کرێت . (یۆگا)ش ، به‌واتای دامرکاندن‌و له‌ناوبردنی هه‌موو مه‌یل‌و ئاره‌زوویێکی جهانی مادده‌ییه‌و به‌م هۆیه‌وه ، مرۆڤی (دانا) به‌حاله‌تی (نیرڤانا) ده‌گات‌و له (جه‌وهه‌ری جاویدان) نزیك ده‌بێته‌وه . (نیرڤانا)ش ، واتای ، نه‌مان‌و ئاسایشی تا هه‌تایی‌یه [٨] .

ئه‌م بیرو باوه‌ڕیانه‌ی خۆرهه‌ڵات‌و خۆرئاوا ، هه‌ر له‌مێژه‌وه به‌یه‌کتر گه‌یشتوون‌و له‌گه‌ڵ ئایینه‌کانی عیبرانی‌و زه‌رده‌شتی‌و

ـەوی‌و مەسیحی‌دا ، کاریان لەیەکتری کردوە . کە دینی ـسلامیش پەیدابوە ، لە مەناخێکی فیکری‌ی وەهادا ، ـەشەی کردوەو پەرەی‌سەندوە .

راستی‌یەکەی ، بیری ئیسلامی ، بەهەردوو لقی فەلسەفەو ـسوفییەوە ، بەرادەیێکی ئەوتۆ لەژێر تەئسیری ئەو مەناخەی ـکرییەدا بوە ، کە زۆر جاران ، فەلسەفەو تەسەووف . لەگەڵ ـی ئایینی (= ظاهری شەرع) نەگ‌خاون‌و شێوەی ـووتنەوەیێکی سیاسییان نواندوە .

دینی ئیسلامی ، لە سەرەتای پەیدابەونیدا ، جگە لە ـەلیلەکانی نەقلی ، واتا (قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەر - سلاوی خودای لی‌بێ) ، پێویستی بەهیچیتر نەبوە ، بۆ ـتگرتنی باوەڕییە بنچینیەکانی ، بەڵام کە دەرگای فەلسەفەی ـنی بۆبیری ئیسلامی کرایەوە سەررای دەلیلەکانی نەقلی ـویستی بە دەلیلی (عەقلی)ش پەیدابوو ، بۆ وەڵامدانەوەی ئەو ـسیارانەی کە ئەم فەلسەفەیە دەیهێنایە پێش .

بۆیێکە ، فەیلەسووفەکانی ئیسلام بەتایبەت (فارابی)و ـن‌سینا) ، زۆر هەولیان‌داوە کە فەلسەفەی (ئەفلاتوون)و ئەریستۆ) ، لەگەڵ بیری ئیسلامی بگونجێنن . موعتەزیلەکان)و (ئیخوانولسەفا)ش ، هەمان مەبەستیان هەبوە ، کەچی رەنگی بزووتنەوەی سیاسییان داوەتەوە .

زانایەکانی ئایینی ، بەتوندی بەرامبەر بەبیری فەلسەفی ـەستاون‌و بۆ پاراستنی بیرو باوەڕییەکانی بنچینەیی ، دریغییان ـەکردوە . ئەوەبوو ، کە (ابوالحسن الأشعري – لە ٢٦٠ کۆچی ـتوەتە دنیا) ، پاش ئەوەی کە لە (موعتەزیلەکان) دابڕاوە ، ـوە بەپاڵەپشتی باوەڕییەکانی ئایینی‌ی ئەهلی سوننەت . دوای ـمویش ، (امام محمدی غزالی : ١٠٥٨-١١١١ میلادی) ، ـوە بەیێکە پاڵەوانی ئەم مەیدانەو نازناوی (حجة الاسلام)ی ـەندوە .

(ئیمامی غەزالی) ، کە لە رێبازی فەلسەفەدا ، گومانی ـینی‌ی پەیدا کردوە ، دەلیلەکانی (نەقلی‌و عەقلی) ، گڵپەو گڕی گومانەکەیان دانەمرکاندوە . بۆ وەدەست هێنانەوەی دڵنیایی‌و یەقینی ئایینی پەنای بۆ رێبازی تەسەووف بردوە . ئەمجا لە رێگای (دڵ)ەوە ، نەك لە رێگای (هەست‌و هۆش)ەوە ، بەسەر گومانەکەیدا زاڵ بوەو بەیەقینی ئایینی گەیشتۆتەوە . بۆ تۆڵەسەندنەوەی ئەو گومان پەیداکردنەی ، بەکتێبی (تهافت الفلاسفة)ی ، بەربوەتە گیانی فەلسەفەو ، زەبرێکی کاریگەری لەفەلسەفەی ئیسلامی داوەو لەو ساوە سەری راست نەکردۆتەوە . کتێبی (احیاء علوم الدین)یشی ، بوەتە سەرچاوەی زانیاری تەسەووف ، لەلای ئەهلی سوننەت‌و جەماعەتدا [٩] .

تەسەووف (تصوف)یش ، ووشەیێکی عەرەبی‌یە ، بەڵام ریشەو چاووگی بەتەواوی ساغ نەبۆتەوە کە ئایا لەووشەی (صوف = خوری)ەوە داهاتوە ، بەواتای ئەوەی کە رێڕەوەکانی رێبازی تەسەووف پشتیان لە جهانی ماددی کردوەو جل‌و بەرگی لە خوری دروست‌کراو یان لەبەرکردوە ، یاخود لە ووشەی رۆشنایی (صفاء)ەوە داهاتوە بەم واتایەی کە دڵ‌و دەروونی خۆیانیان لە هەموو ئاوات‌و نیازێکی جهانی پاك کردۆتەوەو جگە لە خۆشەویستی‌ی (خوداوەند) ، عەودالی هیچیتر نەبوون .

تەسەووف ، لە کۆتایی سەدەی یێکەم‌و سەرەتای سەدەی دوەمی کۆچی ، لە جهانی ئیسلامیدا روخساری تەواوی بەدیار کەوتوە . لە ئەسڵدا هەڵوەستێکی ئایینی‌و ئەخلاقی‌ی مرۆڤانی (خواناس)بوە بەرامبەر بە رەووشت‌و ئەخلاقی سەردەمەکەیان . دیارە لەو سەردەمەدا چینێکی دەوڵەمەندو فراوان ، لە کۆمەڵانی جهانی ئیسلامیدا پەیدابوەو ، کۆکردنەوەی سەروەت‌و سامان‌و خۆش رابواردنی ژیانی رۆژانەیان یێکەمین هیواو ئامانجیان بوە . بەرامبەر بەم رەووشت‌و ئەخلاقە پیاوچاکان ، بۆ باری ژیانی سەردەمی پێغەمبەرو هەر چوار خەلیفەکانی (دروودی خوایان لی‌بێ) ، گەڕاونەتەوەو

پشتیان لە نازو نیعمەتی جهانی کردوەو . پۆشینی بەرگی خوریی سادەیان کردوە بەدروشم و نیشانی رێگای خواناسین . هەتا (ئیبراهیم کوری ئەدهەم) ، وازی لە پاشایەتی ی شاری (بەلخ) هێناوەو ئەم رێبازەی گرتوە[10]

(ابو هاشم – ٧٧٨ز) و (حسن البصری – ٧٢٨ز)و (داوود الطائی – ٧٨١ز)و (سفیان الثوری – ٧٧٧ز)و (رابعة العدویة –٧٥٣ز) ، لە سۆفییە ناودارەکانی ئەو سەردەمە بوون[11]

ئاواتی هەرە گەورەی ئەو سۆفییانە (رابعة العدویة – نەبێ کە پاشان باسی لێوە دەکەین) ، ئەوە بوە کە لە سزای رۆژی قیامەت رزگار بن ، چونکە مەترسیی ئەو رۆژە بەجارێك هەراسانی کردبوون .

دوای ئەمانە ، تەسەووفی ئیسلامی ، روخسارێکی دیکەی وەرگرتوە . ئەگەر سۆفیەکانی سەدەی یێکەم و دوەمی کۆچی ، لە ترسی (خودا)و سزای رۆژی قیامەت دەست بەرداری جهانی ماددی بووبوون ، سۆفییەکانی دوای ئەوان ، نە پاداشت و نە سزای ئەو رۆژەیان بەبیردا هاتوە ، بەڵکو عەوداڵی ئەوەبوون کە ئەوەندە لە (پەروەردگار) نزیك ببنەوە ، تاوەکو ئاشنای ناوو سیفاتەکانی ببن و رازی هەبوونیان بۆ ئاشکرا بێ .

گەلێك سۆفیی بەناوبانگ ، لە سەدەکانی سێیەم و چوارەمی کۆچیدا ، لە ئاسمانی بیری ئیسلامیدا درەوشاونەتەوە ، وەکو (ذوالنون المصری – ٨٦٠ز)و (معروف الکرخی – ٨١٥ز)و (بایزید البستامی – ٨٣٤ز)و (سری السقطی –٨٧٦ز)و (جنید البغدادی – ٩١٠ز)و (ابوبکر الشبلی – ٩٤٥ز)و (حسین بن منصور الحلاج – ٩٤٥ز – کوژراوە)[12]

ئەم سۆفییانە ، بەشوێن زانینی راست (عرفان = Gnosis)ەوە ، عەوداڵ بوون . ئەم زانینەش لە زانست (=علم) جودایە کە بەهۆی (هەست و هۆش = الحس والعقل)ەوە پەیدادەکرێ .

زانینی ناوبراو ، زەوقییە ، فەیزو خەلاتێکە ، (خوداوەند) بەمرۆڤی زانیار (عارف)ی دەبەخشێ . جەوهەری ئەم زانینەش ، پێوەندی بە (رازی هەبوون = سر الوجود)ەوە هەیە . ئەم سۆفییانەش ، جگە لە (خوداوەند) ، هیچیتریان بە (هەبوو = موجود) ، نەدەزانێ ، بۆیێکە ، دەیانگوت (لاموجود إلا الله) . ئەمجا ، کە هەبووی بەراستی هەر (خوداوەند) بەخۆیەتی و بەس ، هەبوانیتر ، بەئەو هەموو شتانەی کە هەبوون و ئێستاکە هەن و لەمەولاوە دەبن ، لەو پەری جهانی هەستی یەوە تاوەکو دەگاتە ئادەمیزاد ، گشتیان شیاوی هەبوونن (ممکن الوجود –ن)و ، نموودی ناوو سیفاتەکانی (خودا)ن و پرشنگی جوانی ی ئەزەلی ی ئەو دەنوێنن و لە نەبوون (عدم)ەوە دروستی کردوون . بەرامبەر بەم کەوانەی داکشانە ، کە لە هەورازەوە بەرەو خوار بوەتەوە ، کەوانێکی هەڵکشان ، لە خوارەوە بەرەو هەوراز ، لە ئادەمیزادەوە بەرەو (خوداوەند) بەرزدەبێتەوە ، کە مرۆڤ لە فەیزی ناوو سیفاتەکانی (پەروەردگار)دا . فەنا دەکا (الفناء فی الله)و لە هەبوونی بەردەوامی ناوو سیفاتەکانیشیدا دەیهێڵێتەوە (البقاء بالله)[13]

لێرەدا ، (شەتەحات) ، لەلای هەندێکیاندا سەری هەڵداوەو ، ئەوەبوو کە نەزەربازانی (شەرعی زاهیر = ظاهر الشرع) ، بەرامبەریان وەستاون و باوەریی یەکیەتی هەبوون (وحدة الوجود = Panthism)یان داونەتە پاڵ ، دیارە کە ئەم باوەرەیەش ، پێچەوانەی باوەریی ئایینی ئیسلامە دەربارەی (تەنزیە)ی (خوداوەند)و لە ئەنجامدا گەلێك لە سۆفییانی ناوداری وەکو (مەنسووری حەلاج)و (شهاب الدین سهروردی)و (محی الدین ابن عربی) ، لەم رێبازەدا سەریان داناوە[14]

باوەریی سۆفیەکانی ناوبراویش ، لەم فەرموودەی قودسییە (الحدیث القدسی)ەوە هاتوە ، کە (خوداوەند) بە (پێغەمبەر)ی فەرموە (کنت کنزا مخفیا فأحببت أن أعرف فخلقت الخلق فبی (أو – فبە) عرفونی)[15] .

راستی یەکەی ، سوفییەکانی ئەم رێبازە ، هەرگیز مەبەستیان

ئەوە نەبوە کە ئاشنای (زاتی خودا) ببن ، چونکە (زاتی خودا)
بێنەزەهەو (خۆی) فەرموویەتی (لیس کمثله شیٔ) ، بۆیێکە
مەبەستیان ئەوەبوە کە لە ڕێگای ناوو سیفاتەکانیەوە بیناسن‌و
پێی نزیك ببنەوە . یەکێك لە سیفاتەکانی (خودا)ش جوانی‌یە
(جمال) . ئەمجا ئەو سۆفییانە ، گیرۆدەو پەرۆشی دیتنی پرشنگی
ئەو جوانی‌یە ببوون‌و بڵێسەی (ئەڤینی خودایی = الحب الإلهی) ،
گیانو دڵی ئەو سۆفییانەی وەکو پەروانە سووتاندوەو بەپلەی
(ئیمان)و (مانەوە)ی گەیاندوون . گڵپەو گڕی ئەم ئەڤینە ،
بەجۆرێکی وەها کاری لە (رابعەی عەدەوی) کردوە کە بڵێ :
(خوایە ، گەر من لەترسی ئاگری دۆزەخ تۆ دەپەرستم ، بۆ
دۆزەخم بنێرە . گەر من بەئاواتی بەهەشتەوە تۆ دەپەرستم ، بەهەشتم
پێ مەبەخشە ، وەگەر من ، بۆ (خودی خۆت) تۆ دەپەرستم ،
جوانی‌ی خۆتم لێ مەشارەوە .)[١٦]

ڕۆژهەلاتناسی بەناوبانگ (ئەدوارد براون) لەم بارەوە
دەڵێ : یێکەمین هەنگاوی مرۆڤی سۆفی ، لە شا ڕێگای
تەسەووفدا ئەوەیە کە لە (خودی خۆی) ، ڕزگاری بێ . هەتا
خۆشەویستی‌ی جهانی‌یش ، وا لە (دڵدار)و (دلبەر) دەکا ، کە
خودی خۆیان لە بیربکەن‌و هەریێکە بیر لەویتر بکاتەوە . ئەمجا
لێرەدایە کە جۆش‌و خرۆشی عاتیفەی تەسەووفی ئیسلامی ، لە
فەلسەفەی ساردو بێ گیانی هیندی جودا دەبێتەوە . ئەڤینداری
لەلای سۆفییانی موسولمان ، هەروەها لەلای هەموو گیانبازاندا
لەهەر کوێ‌و لەهەر کاتێکدا بووبن ، ئەو کیمیایە شاهانەیە ، کە
مەعدەنی بێ نرخی ئادەمیزاد ، دەکا بەزێڕێکی نایاب ، هەر
لەبەر ئەوێکەش ، سۆفییەکان گوتوویانە (المجاز قنطرة الحقیقة) .

بەهۆی خۆشەویستی ، ڕێداری ڕێگای تەسەووف ، بەم
پلەیە دەگا کە خودی خۆی لەبیربکات‌و هەر خۆشەویستەکەی
لە پێش چاودابێ ، ئەمجا ، لێرەوە بە پلەیێکی ئەوتۆ دەگا ، کە
بزانی ئەوەی لە خۆشەویستەکەیەوە گیرۆدەی بوە ، ئەو
پرشنگەیە کە لە جوانی‌ی جاویدان (الجمال الأزلی
والأبدی)ەوە ، دەدەرەو شێتەوەو لە هەزاران ئاوێناندا خۆی
دەنوێنی‌و ، کەچی هەرهەمان پرشنگی جوانی‌یە[١٧] .

(ئەفلاتوون) ، کە لە ڕوانگەی فەلسەفەی خۆیەوە
(جوانی)و (خۆشەویستی)ی لێکداوەتەوە ، خۆشەویستی‌ی
دڵدارو دلبەرانی کردوە بەپردێك بۆ گەیشتن بەخۆشەویستی‌ی
خودایی (الحب الإلهی) . لەلای وابوە ، کە (دڵدار) ، لە
سەرەتاوە حەز لە (دلبەر)ێکی جوان دەکات‌و گیرۆدەی دەبێ .
لە پاشاندا ئەوەی بۆ ئاشکرادەبێ کە جوانی‌ی لەش‌و لار ،
لەهەموو کەسانی جواندا یێك بابەتی جوانی‌یە . لەمەوە شەیدای
هەموو شتێکی جوان دەبێ . لەم پلەی تازەیدا ، ئاگای لە
دلبەرەکەی نامێنی‌و جوانی‌ی خەت‌و خاڵی بەبابەتێکی نزم دێتە
بەرچاوان‌و پەرۆشی جوانی‌ی گیانی دەبێ . تاوەکو لە
نکاوێکدا ، ئەو جوانی‌یە هەرە بەرزەی بۆ بەدیاردەکەوێ ، کە
هەر لەسەرەتاوە ئامانجی هەبوونی خۆی بوە .

ئەو جوانی‌یە ئەزەلی‌و تا هەتاییەی ، کە بێ کەمی‌و
کورتی‌یەو ، تەواوییەکەی بێ سنوورو ئەندازەیە ، ئەمەش
پرشنگی جوانی‌ی (هەبووی لەخۆیەوە پێویستە = واجب الوجود
لذاته) . ئیتر (دڵدار) بەرەو ئەو جوانی‌یە موتلەقە ڕادەکێشرێت‌و
نقوومی دەبێ[١٨] .

ئەڤینی خودایی‌و عاتیفەی پڕ لە جۆش‌و خرۆشی تەسەووف
کۆمەڵێك شاعیری ئەوتۆی لە جهانی ئیسلامیدا پێگەیاندوە ، کە
سروودی دڵڕفێنیان تا هەتا دەنگ دەداتەوە . بۆ وێنە :

لە شاعیرانی عەرەب ، (محی‌الدین ابن عربی – ١٢٤٠ز)و
(عمر ابن الفارض –١٢٨٣ز)و لە شاعیرانی فارس (مجدود بن
ادم سنائی – ١١٣١ز)و (فریدالدین عطار – ١٢٣٤ز)و
(جلال‌الدین رومی – ١٢٧٣ز)و (حافظ شیرازی – ١٣٨٩ز)و
(عبدالرحمان جامی –١٤٩٢ز)و لە شاعیرانی تورك (فضولی
–١٥٥٦ز)و لە شاعیرانی کورد (بابا طاهر –١٠١٠ز)و (مەلای
جزیری – ١٤٨١ز)و (ئەحمەدی خانی – ١٧٠٦ز)[١٩] .

هەموو شاعیرەکانی سۆفی مەشرەب کە گیرۆدەی (ئەڤینی

خودایی) بوو بوون ، سەرچاوەی خۆشەویستی‌یەکەیان لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەستنیشان دەکەن ، کە (خوداوەند) دەفەرموێ (وإذ أخذ ربك من بني ادم من ظهورهم ذريتهم وأشهدهم على أنفسهم ألست بربكم قالوا بلى . سورة الأعراف – ئایەتی ١٧٢) ، بەم ئایەتەش دەڵێن (ئایەتی پەیمان) ، بەواتای ئەوەی کە لەو کاتەی (خوداوەند) ، گیانی ئادەمیزادانی ، لە جیهانی لاهووتی‌دا ، دروستکردوە ، پەیمانی ئەڤین‌و وەفاداری‌ی لێ وەرگرتوون ، بۆیێکە ، گیانی ئادەمیزاد ، هەمیشە پەرۆشی ئەوەیە ، کە بەخۆشەویستەکەی بگاتەوە[٢٠] .

گەورەترین شاعیری سۆفی لە جیهاندا (مەولانا جلال الدين رومي) ، لە سەرەتای شاکاری (مثنوی معنوی) یدا ، ئەم بیرە بەرزو ناسکەی بەم شیعرە نەمرانەوە دەربڕیوە :

بشنو از نی چون حکایت میکند
وز جدائیها شکایت میکند

*

از نیستان تامرا ببریده اند
از نفیرم مردو زن نالیده اند

*

سینه خواهم شرحه شرحه از فراق
تا بگویم شرح درد اشتیاق

*

هر کسی کو دور ماند از اصل خویش
باز جوید روزگار وصل خویش[٢١]

*

مەبەستی سۆفییەکانیش لەم گەشتی گەڕانەوەدا ، بە خۆشەویست گەیشتنە . لەم پێگەیشتنەشدا ، یان وەکو دەستەی دوەمی سۆفییەکان ، زانینی راست پەیدادەکەن‌و لە رازی هەبوون (سر الوجود) دەگەن ، یان لەو لافاوی جوانی‌یەدا فەنا دەبن‌و دەمێننەوە کە ئەوانی راکێشاوە . بەڵام ، وەکو باسمان کردوە ، ئەم زانین‌و دیتنە ، لە رێگای دڵەوە دەبێ نەك لە رێگای هەست‌و هۆش . خەڵاتێکە (خوداوەند) بە ئادەمیزادانی هەڵبژاردەی دەبەخشێ ، دوای ئەوەی کە ئەم قۆناغانەی تەسەووف دەبڕن : (التوبة ، القناعة ، الزهد ، الصبر ، التوكل ، الرضا) . لە قوناغی دواییدا ، رێداری ئەم رێگایە ئامادەی ئەوە دەبێ کە بەئاوات بگا ئەگەر یەکێك لەم ئەحواڵانەی بۆ هاتبێ : (القرب = نزیکی . المحبة = ئەڤینداری . الرجاء = ئاوات . الخوف = ترسان . الشوق = پەرۆشی . الأنس = هاورازی .

الطمأنينة = دڵنیایی . المشاهدة = دیدەنی) . لەم حاڵەی دواییدا سۆفی‌ی خواپێداو (وجد)یان (تواجد) دەیگرێت[٢٢] .

(وجد)و (تواجد)یش ، وەکو مووچڕکێك بەلەشی سۆفی‌دا دێت‌و مەستی دەکا . مەستی لە (خودا) نزیك بوونەوەو بە (خۆشەویست) گەیشتن . ئەمەش حاڵەتی نەمانە (فناء)ە . لێرەوە بۆ حاڵێکی سەرووتر بەرزدەبێتەوەو ئاگای لەهیچ شتێك نامێنی‌و هەتا هەست بەهەبوونی (خودی خۆیشی) ناکا . ئەمەش حاڵەتی نەمانی نەمانە (فناء الفناء)ەو لێرەدا پەردە لە نێوانی (پەروەردگار = الخالق)و (پەروەردەکراو = المخلوق)داو لە نێوانی ناسراو = المعروف)و (ناسیار = العارف)دا ، هەڵدەسێت‌و هەموو شتێك دەبن بە (یێك)و جگە لە (خوداوەند) ، هیچیتر نامێنێتەوە . ئەمەش واتای (نەمان لە خوداو بەخودا مانەوە = الفناء في الله والبقاء بالله)یە[٢٣] .

ئەم فەناو نەمانەی تەسەووفی ئیسلامی ، وەکو (نیرڤانا)ی (هیندی) ، حاڵێکی سەلبی نیەو مانەوەی لە دواوەیە . مەبەستیش ئەوەیە کە شەخسییەت‌و کەسایەتی ئادەمیزاد بفەوتی‌و هیچ دەسەڵات‌و خوایشتی تایبەتی‌ی نەمێنێ بۆ ئەوەی بزانێ کە دەسەڵاتی بەراستی ، هەر دەسەڵاتی خودایەو بەس .

کە ئادەمیزادیش خوایشت‌و ئیرادەتی تایبەتی‌ی نەما ، لەخوایشت‌و ئیرادەتی (خوداوەند)دا ، دەمێنێتەوە ، ئەمەش حاڵێکی ئیجابی‌یە نەك سەلبی . لەم پلەیەشدا ، جیاوازی لە

یانی (جەبر)و (ئیختیار)دا نامێنێ‌و ئەو ئیعترازە عەقلی‌یەی کە
موعتەزلەکان (القدریة) ، لە باوەڕی‌ی بەندەواری (الجبریة)ی
ئەهلی سونەتیان دەگرت ، بەجێ نابێ‌و بنچینەی
هەڵدەوەشێتەوە[٢٤] .

دیسان (جلال‌الدین رومی) ، بەم چەند شیعرە نەمرانەوە
بەخشی ئەم بیرەی کێشاوە :

هر شبی از دام تن ارواح را
می رهانی می کنی الواح را

*

می رهند ارواح هر شب زین قفس
مرغان از حکم‌و گفتارو قصص
شب ز زندان بی خبر زندانیان
شب ز دولت بی خبر سلطانیان

*

نی غم‌و اندیشهٔ سودو زیان
نی خیال این فلان‌و ان فلان

*

حال عارف این بود بی خواب هم
گفت ایزد هم رقود زین مرم[٢٥]

*

خفته از احوال دنیا روزو شب
جون قلم در پنجهٔ تقلیب رب[٢٦]

*

جوانترین شیعری ڕەمزی‌ی سۆفییانە ، کە لەبارەی گەشتی
گیانی‌ی تەسەووفی ئیسلامی‌یەوە ڕێکخرابێت ، مەسنەوی‌ی
منطق الطیر)ی (فریدالدین عطار)ە کە بەم شیعرە ناسکانەوە
دەستی پێدەکا :

مرحبا أی هدهد هادی شده
در حقیقت پیك هر وادی شده

*

وی بسر حد سبأ سیر تو خوش
چون سلیمان منطق الطیر تو خوش

پوختەی ئەم هۆنراوە ڕەمزی‌یەش کە (٤٦٠٠) بەیت
شیعرە ، ئەمەیە : کۆمەڵێك باڵندە (کە نیشانەن بۆ گیانی
مرۆڤان) ، کۆدەبنەوەو ڕاوێژی ئەوە دەکەن کە بۆدیداری
(سیمرغ = نیشانەیە بۆ پەروەردگار) ، بچن . پۆپیتە سلێمانە
(=هدهد) ، دەبێتە ڕابەریان .

لەهەر قۆناغێکی ئەم ڕێگایەی سەخت‌و پڕ لە مەترسی‌یەدا
– کە قۆناغەکانی ڕێگای تەسەووفن – هەندێك لە باڵندەکان
ماندوو دەبن‌و هەر دەستەیێك بەبیانوویێك دەگەڕێتەوە دواوەو
گەشتەکە تەواوناکا . لە ئەنجامدا (سی‌مرغ = ٣٠ باڵدار)
دەمێننەوە . ئەو (سی‌مرغ)انەش ، دوای ئەوەی کە بەتەن‌و
بەگیان دەفەوتێن ، سەر لەنوێ ، لەنووری پاکی
(سیمرغ)ەوە ، گیانێکی تازەیان پێ دەبەخشرێت‌و بە دیداری
حەزرەتی (سیمرغ) دەگەن :

جان ان مرغان ز تشویرو حیا
شد فنای محض‌و تن شد توتیا

*

چون شدند از کل پاك انهمه
یافتند از نور حضرت جان همه

*

کە (سی‌مرغ)ەکان تەماشای (سیمرغ) دەکەن ، خۆیان لە
ئەمدا دەبینن‌و کە تەماشای خۆیان دەکەن (ئەو) لە خۆیاندا
دەبینن . کە هەر دوو لا بۆیەکتری دەنوارن ، جگە لەحەزرەتی
(سیمرغ) هیچیتر دیار نابێ . (ئەو دەبێ بە (ئەم)و (ئەم) دەبێ بە
(ئەو) . (سی مرغ)ەکان ، سەریان لەم کارەدا سوڕدەمێنێ‌و بێ
بیرکردنەوە ، تووشی بیرکردنەوە دەبن :

در تحیر جمله سرگردان شدند
این ندانستند تا خود ان شدند

*

خویشرا دیدند سیمرغ تمام
بود خود سیمرغ سی مرغ تمام

*

چون سوی سیمرغ کردندی نگاه
بود خود سی مرغ در ان جایگاه

*

ور بسوی خویش کردندی نظر
بود این سی مرغ ایشان ان دگر

*

ور نظر در هردو کردندی بهم
هردو یك سیمرغ بودی بیش‌و کم

*

بود این یك ان‌و ان یك بود این
در همه عالم کسی نشنود این

*

انهمه غرق تحیر ماندند
بیٚ تفکر در تفکر ماندند

سی‌باڵداره‌کان ، سه‌ریان له‌م کاره ئاڵۆزه ده‌رنه‌کرد . به‌بیٚ زمان‌و به‌بیٚ قسه‌کردن ، پسیاری ئه‌م رازه گه‌وره‌یان له حه‌زره‌تی (سیمرغ) کردو داوایان لیٚ‌ی‌کرد که واتای (من)و (تۆ) یان بۆ روون‌بکاته‌وه . ئه‌میش ، به‌بیٚ قسه‌و به‌بیٚ زمان وه‌ڵامی دانه‌وه که : حه‌زره‌تی (سیمرغ) ، وه‌کو ئاوێنه‌یه‌و هه‌ر که‌سێك ته‌ماشای بکا ، خودی خۆی تێدا ده‌بینیٚ . ئێوه‌ش ، که سی باڵدارن‌و هاتوون سه‌یری ئه‌و بکه‌ن خۆتانی تێدا ده‌بینن :

چون ندانستند هیچ در هیچ حال
بیزبان کردند از انحضرت سؤال

*

کشف این سری قوی در خواستند
حل مائی‌و توئی در خواستند

*

بیزبان امد از انحضرت جواب
کاینه است انحضرت چون افتاب

*

هرچه اید خویشتن بیند در او
جان‌و تن هم جان‌و تن بیند در او

*

چون شما سی مرغ اینجا امدید
سی در این اینه پیدا امدید(٢٧)

*

وه‌کو له پێشه‌وه‌دا گوتمان ، ئامانجی سۆفییانی سه‌ده‌ی سیٚ‌یه‌م‌و چواره‌می کۆچی ، له گه‌شتی ته‌سه‌ووفدا ئه‌وه‌بوه که زانینی راستی په‌یدابکه‌ن‌و له رازی هه‌بوون بگه‌ن .

(محی‌الدین ابن عربی)ش ، که یه‌کێکه له شاعیرو نه‌زه‌ربازه‌کانی گه‌وره‌ی ته‌سه‌ووف ، هه‌مان رێبازی گرتوه ، به‌ڵام هه‌بوون (وجود)ی هه‌م به (خودا) زانیوه‌و هه‌م به (جیهان)و گوتوویه :

گه‌ر له‌لایه‌نی ئه‌و هه‌موو دیمه‌نانه‌ی مادده‌ی‌ی جۆراو جۆره‌وه ته‌ماشای (هه‌بوون) بکریٚ ، ئه‌وا جیهان خۆی ده‌نوێنیٚ . وه‌گه‌ر له لایه‌نێکی وه‌ها ته‌ماشای (هه‌بوون = وجود) بکریٚ ، که هه‌موو (ماناو دیمه‌ن‌و نموودو مومکیناتان) بگرێته‌وه ، ئه‌وه (خوداوه‌ند)ه .

به‌گوێره‌ی ئه‌م رامانه‌ی ، (خۆشه‌ویستی‌ی خودایی)ی کردوه به دوو بابه‌ت :

یێکه‌میان ئه‌وه‌یه که هه‌ندیٚ که‌س ، به‌چاوێکی وه‌ها ته‌ماشای جیهان ده‌که‌ن ، که‌هه‌ندیٚ لایه‌نی جوانی تێدا ده‌بینن‌و هه‌ندێکی (له‌لای خۆیانه‌وه) ناشیرین ، ئه‌م ده‌سته‌یه که هه‌ر نموود‌ه‌کانی جوانیان خۆش ده‌وێت‌و به‌س ، دیاره هه‌ر له‌هه‌ندیٚ نموود‌ه‌کانیه‌وه (خوداوه‌ند) ده‌په‌رستن .

که‌چی ده‌سته‌ی دوه‌میان ، به‌راده‌یێکی ئه‌وتۆ گه‌یشتوون ، که له‌هه‌موو شتێکدا حه‌قیقه‌تی (خودا) ده‌بینن‌و بۆیێکه هه‌موو نموودو دیمه‌نه‌کانی ئه‌م جهانه‌یان خۆش‌ده‌وێ ، چونکه هه‌موو

ـهەموو ، دەلالەت لە (خودای گەورە) دەکەن . ئەم پارچە ـەرەلەشی ، بڕ لەم بیرەی دەکا :

ـد صار قلبي قابلا كل صورة — فمرعى لـغزلان ودير لرهبان
ـبيت لاوثان وكعبة طائف — والواح توراة ومصحف قران
ـين بدين الحب أنى توجهت — ركائبه فالحب ديني وايماني(٢٨)

(عمر ابن الفارض)یش ، هەموو نموودەکانی هەبوون مظاهر الوجود)ی وەکو یێك بەپیرۆز ناسیوەو باوەڕی وەها ـە . کە (مزگەوت)و (کڵیسە)و (بتخانە) . هەر یێکەیان ـلایەنێکی نموودی خودایی دەنوێنن(٢٩) .

ئەم شاعیرە ناسکە ، لە حاڵی دیدەنی (المشاهدة)دا ، ـسەر زمانی (پەروەردگار)ەوە دەڵێ :

حيث غرام أنت لكن بنفسه
وـقاك بعضا منك بعض أدلتي

مـ تهوى مالم تكن فى فانيا
ـم تغن مالم تجتل فيك صورتى .

لە وەلامدا بەزمانی خۆیەوە دەڵێ :

ـلانا مصل واحد ساجد إلى
حقيقته بالجمع فى كل سجدة

*

ومـكان لى صلى سواى ولم تكن
ـلاتى لغيرى فى اداء كل ركعة(٣٠)

راستی‌یەکەی ، ئەم بڕە شیعرانەی (ابن الفارض) ، ـتەواوی دەنگی ئەم دوو بەیتە شیعرانەی (منصور الحلاج) ـدەدەنەوە کە دەڵێ :

ـ من أهوى ومن أهوى أنا
ـن روحان حللنا بدنا
فإذا أبصرتني أبصرته
وإذا أبصرته أبصرتنا

*

لەلای (عبدالكريم الجيلى)ش – کە نەزەربازێکی سەدەی چواردەمی میلادە – ڕاستی‌ی هەبوون (=حقيقة الوجود) یەکێکەو بەس . ئەو هەموو شتە زۆرانەی ئاشکرا (الكثرة الظاهرة) ، نموودی یێك حەقق پەنهان (الحق الباطن)ن .

بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستی گوتوویە :

(زاتی‌خودا) . کە (مونەزەهە) . لە سنووری پی‌زانین‌و ئاشنا بوون بەدەرە . بۆیێکە دەبێ (خوداوەند) لە لایەنی ناوو سیفاتەکانی‌یەوە بناسین‌و بەچاوی دڵ ئاشنای ببین .

(خودای – تعالى) ، لە قورئانی پیرۆزدا ، لەبارەی خۆیەوە دەفەرموێ : (يضل من يشاء ويهدى من يشاء - سورة النحل – ئایەتی – ٩٣) .

ئەمجا ... ر یەکێك لەناوو سیفاتەکانی بێکارە مایەوە (حاشا لله) . واتای ئەوەیە کە نموودو تەجەللای (خوداوەند) بەتەواوی نەبوە . دیارە ئەمەش پێچەوانەی سیفەتی (کمال)ی (خودا)یە .

(خوداوەند)یش (مەحزی چاکی‌یە) . بەلام لە جهانی ناسووتدا ، هەر شتێك بەهۆی پێچەوانەکەیەوە بەدیاردەکەوێ . هەر بۆیێکەش پێغەمبەرەکانی بۆ ئەم جهانە هەناردوە . تاوەکو ئەم دوو لایەنانە بۆ خەڵکی جهانی لەیەکتر جودابکاتەوە .

ئەوانەی کە پێڕەوی پێغەمبەرەکان (دروودی خوایان لی‌بێ) دەکەن . ئەهلی (هیدایەت) دەبن‌و ئەوانەی کە پێڕەویشیان ناکەن ئەهلی (ضەلالەت) دەبن . کەچی ، ڕاستی‌یەکەشی ، هەردوو لا ، وەکو یەکتر ، یێك (زاتی حەق) دەپەرستن ، لە لایەنی هەندێك لەناوو سیفاتەکانیدا(٣١)

لەو هەموو وێنانەی لە پێشەوەدا ، نیشانماندا ، ئەوە ڕوون دەبێتەوە ، کە هەندێك لە سۆفییەکان ، باوەڕی‌ی ئەوتۆیان دەربڕیوە ، کە لە باوەڕی‌ی (حلول) یان (اتصال)یان ، یەکیەتی هەبوون (وحدة الوجود) نزیکن‌و دیارە کە ئەم جۆرە باوەڕیانەش ، پیچەوانەی باوەڕی‌ی ئایینی‌ی ئەهلی سوننەت‌و

جەماعەتن . ئەوەبوو کە سەرەنجامی هەندێکیان بەکوشتن هاتوە[٣٢] .

بەڵام نەزەربازەکانی ئایینی ، هەر نەبێ زۆربەیان ، ئەم سۆفییانەیان بەخاوەنی باوەڕیی راست ناسیونو دەڵێن :

ئەو یەکایەتیی هەبوون (وحدة الوجود)ەی کە بریان لێوەکردوە ، یەکایەتی هەبوونی فەلسەفە نەبوە ، بەڵکو ، حالەتی یەکایەتی دیتن (وحدة الشهود) بوە . ئەمەش ئەو حالەتی نەمان (فناء)ەیە کە تێیدا (خۆیانو مەخلوقاتو خوداوەند) یا لەیێکتر جودا نەکردۆتەوەو هەموو هەبوونو نموودێکیان لەلا ، بوە بە (یێك) . ئەگەرچی ئەمەش بەرواڵەت هەمان واتای یەکیەتی هەبوونی فەلسەفە دەنوێنێ ، بەڵام ئەم حالەتە (عەینی حال)ی خەون دیتنە (الرؤيا المنامية) . سۆفی ، لەم حاڵەیدا لە پایەی (جەمع)دا دەبێ . کەچی کە دەگەڕێتەوە پایەی (فەرق)و لە (مەستی = السکر)یەوە دێتەوە سەرخۆ (الصحو) ، هەمیشە (خۆیو مەخلووقاتو خوداوەند) ، لەیێکتر جودادەکاتەوە[٣٣] .

ئەمجا کە هەندێك لە سۆفییەکان سەرەنجامیان بەکوشتن هاتوە ، لەبەر ئەوەبوە ، بەپلەیێکی ئەوتۆ گەیشتوون کە رازی هەرە گەورە (السر الأعظم) یان بۆ ئاشکرابوەو زانینی راست (المعرفة الحقيقية) یان پەیداکردوە . سەبارەت بەوەی کە ئەم (رازو زانین)ە ، (پەروەردگار) خەڵاتی کەسانی هەڵبژاردەی دەکا ، هەرگیز شیاوی ئاشکراکردن نیە چونکە سەر لە موسوڵمانانی ئاسایی دەشێوێنێ . بۆیێکە کوشتنیان پێویستێکی شەرعی بوە[٣٤] .

رۆژهەڵاتناسی بەناوبانگ (نیکلسۆن)یش ، پشتی هەمان رای گرتوەو دەڵێ :

مادامە سۆفییەکانی موسوڵمان هەمیشە (خودا) یان بە (منزه) زانیوەو لە هەموو شتێکیان جوداکردۆتەوە ، نابێ باوەڕیی یەکیەتی هەبوون (وحدة الوجود)ی فەلسەفەیان بدرێتە پاڵ . ئەو یەکایەتیەی کە ئەوان هەستیان پێ‌ی کردوە ، یەکایەتی دیتن (وحدة الشهود) بوە ، کە ئەنجامی جۆشو خرۆشی عاتیفەی دینی بوە ، نە ، ئەنجامی رامانو لێکدانەوەی هۆشو بیر[٣٥]

ئەم ناساندنە کورتەی زانیاری فەلسەفەو تەسووف ، لە بیری ئیسلامیدا ، پێویستێکی سەرەکی‌یە ، بۆ خوێنەر ، تا وەکو ئاشنابێ لەگەڵ (خانی)و (مەمو زین)ەکەیدا پەیدا بکاو لەوە حاڵی بێ کە . استانێکی سادەی ئەڤینی دڵدارو دلبەرێك نیە . ئیتر با شوێنی (خانی) لە شا رێگای بیری ئیسلامیدا هەڵبگرینو بزانین چ رێبازێکی تەسەووفی گرتوە .

### ٢ – خانی – لە رێبازی تەسەووفدا

هەڵبەت (خانی) ، تاقە شاعیری کوردی ئەم مەیدانە نیە . لەپێش ئەودا ، نەتەوەی کورد ، زۆر نەزەربازو شاعیری سۆفی مەشرەبی لێ هەڵکەوتوەو ، وەکو زۆربەی مرۆڤە هەڵکەوتوەکانی نەتەوەکەشمان ، شوێنەواریان بزربوەو بێ سەرو سۆراخ ماونەتەوە .

ئەوەتا ، لە سەدەی شەشەمی کۆچی (= دوازدەی میلادی)دا ، سۆفییێکی بەناوبانگی کورد ژیاوە کە ناوی (الشيخ أبي محمد ماجد الكردي العراقي) بوە ، کەچی شتێکی ئەوتۆ لە بارەیەوە نازانین[١] .

هەروەها ، شاعیری سۆفی‌ی سەدەی دوازدەمی میلادی (سنائی) ، ناوی سۆفییێکی کوردی هێناوەو بەهاوشانی (ویس القرن)ی داناوەو باوەڕی وابوە ، کە سەدەها ساڵی پێ‌دەوێ تاکو ، دوو پیاو چاکی وەکو (ابوالوفای کرد)و (ویس قرن) ، لە پشتی ئادەمیزاددا ، دێنە دونیا :

قرنها باید که تا از پشت ادم نطفهٔ
بو الوفای کرد گردد یا شود ویس قرن[٢]

کەچی ، هیچ زانیارێکمان دەربارەی نیەو ناشزانین ، لەچە سەردەمێکدا ژیاوە .

(بابا تاهیر – سەدەی یازدەمی زایینی)و (مەلای جزیری – سەدەی پانزەم) دوو شاعیری گەورەی سۆفی مەشرەبی کورد

جێ . بێگومان زۆر شاعیری دیکەشمان هەبوە ، بەڵام ، جیاوازی (خانی) ، لەگەڵ شاعیرەکانی سۆفی مەشرەبی پێش خۆی ، وەکو جیاوازی (ابن عربی) لەگەڵ ابن الفارض)و یان وەکو جیاوازی (سنائی‌و رومی‌و عطار) لەگەڵ (حافظ شیرازی)و گەلێکیتر بوە .

(ابن الفارض)و (حافظ) – بۆوێنە – غەزەلخوانی تەسەووف بوون ، کەچی ئەوانیتر ، هەم شاعیرو هەم نەزەرباز بوون .

(خانی) ، یێکەمین شاعیری کورد بوە ، کە داستانێکی ـفیی . لە قالبی مەسنەویدا ، هۆناندۆتەوەو ، وەکو تەشبیهێکی تەمسیلی یا «مەجازیك» (Metaphor) بەکاری هێناوە ، بۆ روونکردنەوەی ئەم تەعبیرە بەرزەی تەسەووف ، دەڵێ (المجاز قنطرة الحقیقة) ، بەواتای ئەوەی کە ئەڤینی جهانی پردێکە بۆ گەیشتن بەئەڤینی خودایی .

سەررای ئەمەش ، (خانی) ، لەسەر تاپایانی (مەمو زین)دا ، رەنگی بیرو باوەڕییەکانی خۆی دەرێژێ ، لەبارەی ئایین‌و فەلسەفەو تەسەووفەوە ، ئەوەش نیشان دەدا ، کە لە رێگای (فەلسەفە)وە (گومان)ی پەیدا کردوەو ، لەپاشاندا ، لە رێگای تەسەووفەوە بەسەر گومانەکەیدا زاڵ‌بوەو بەیەقینی ئایینی گەیشتۆتەوەو بۆ (شەرعی ظاهر) گەڕاوەتەوە ، وەك لە شوێنی خۆیدا دەستنیشانی دەکەین .

ئەو باسانەی کە لە سەرەتای (مەمو زین)دا ، لێیانەوە دەروە ، پێوەندییان بە سێ باوەڕی بچینەیی ئایینی ئیسلامەوە هەیە کە ئەمانەن : (خوداوەند)و (خەلق)و (جەبرو ئیختیار) .

لەهەر سێ لاوەش ، لە شا رێگای ئەهلی سوننەت دەرنەچوەو بەم جۆرە ، ئەم سێ باوەڕیانەی ئایینی پوختە دەکاتەوە :

یێکەم : (پەروەردگار) :

– (خودای گەورە) ، هەم (زاتێکی مونەزەهە)و هەم ناوو سیفاتی (تەشبیهی)ی هەیە :

مەبەست لە (تنزیە)یش ئەوەیە ، کە تاك‌و بێهاوتاو هەر بوەو هەر دەبێ :

ئەی واحیدی بێ شەریك‌و یەکتا
وەی واجید بێ نەزیرو هەمتا
ئەی باقی‌یی بێ زەوالی دائم
وەی هادی‌یی بێ فەنایی قائم

*

مەبەست لە سیفاتی تەشبیهیش ئەوەیە ، کە سیفاتەکانی (خوداوەند) لە ئەوپەری تەواویدان‌و لەو سیفاتانەی رواڵەتی کە مرۆڤدا دینە بەرچاو ، جیاوازن :

کەس نینە ژ کافرو عوصاتان
مەظهەر نەبتن ژ بۆ سیفاتان

*

کافر بووین ئەم ، بەئیسمی (قەهار)
(غەفارە) کر ئەم کرین گوناهکار .

مەسەلەی (تەنزیە)و (تەشبیە)یش ، یەکێکە لە مەسەلە گرنگەکانی ئایینی ئیسلام‌و باوەڕی‌ی ئەهلی سوننەت لەم بارەوە لەگەڵ بیری فەلسەفی‌و لەگەل موعتەزلەکان‌و موشەبیهەکان یەك ناگرتەوە [۳] .

۲ – خوداوەند ، هۆی یێکەمینی هەموو هەبوونێکە ، بۆیێکە هەبووی پێویست بۆخۆیەتی (واجب الوجود لذاته) . هەبوانی دیکەش ، ئەو هەموو شتانەی کە هەبوون‌و ئێستاکە هەن‌و لەمەولاوە دەبن ، گشتیان شیاوی هەبوونن (ممکن الوجود)ن چونکە بوونیان بەهۆی (خودا)وەیە . شیاوی هەبوونیش ، بێ سنوورو ژمارەن‌و نموودی خوداییِن‌و هەبوونی ئەو دەخەنەروو :

ئەشیا ب حەسەب دەلیل‌و بورهان
نابن چوو ، مەگەر وجووب‌و ئیمکان
واجب ، یەکە زاتی کبرییایە
مومکن پڕە ، جەمعی (ماسوا)یە

*

وی واجبی ، مومکناتی بەرقەع
مومکن دی ژ بۆ خوە کرنە مەتلەع
یەعنی ئەوی پیێ ب بت موبەرهەن
حوسناوی ب دەرکەڤت ژ مەکمەن
دووەم : دروستکردن (الخلق)
١ – خوداوەند ئەو هەموو شیاوی هەبوونانەی لە نەبوون (عدم)ەوەو بەبێ (هەیۆلا) دروستکردوە :
ظاهر کرن ئەڤ قەدەر سەنائع
پەیدا کرن ئەڤ قەدەر بەدائع
هەر یەك ژ عەدەم کرن تە پەیدا
ئیبداع کرن بەبێ هەیۆلا

* *

٢ – خوداوەند هەموو شیاوی هەبوون (ممکن الوجود)ی بەخوایشتو ویستی خۆی پەیداکردووە دەیکا ، نەبە (تەبع)و پێویستی . واتا دەیتوانی دروستیان نەکا . ئەم کردارەی دروستکردنەشی ، حەتمیو میکانیکی نەبوە . واتا پێوەندییان وەکو پێوەندیی نێوانی (هۆ)و (ئەنجام)ی فەلسەفە نیە :
سێیەم : جەبرو ئیختیار
١ – خوداوەند ، لە ئەزەلەوە ، بەسەرهاتو سەرەنجامی هەموو هەبووێکی دیاریکردوە :
نایو قەلەمو کتابو نیشان
تیرو هەدەفو کەمانو کێشان

*

(محکوم علیە)ی بوون ژ تەقدیر
هێز ئیسمی گوناه نەبوویی تەسطیر
کەواتا ئادەمیزاد ، لە کردارو رەفتاریدا بەندەوار (مسیر)ە ، نەك ئازاد (مخیر) .
هەرچی تە ژ بۆمە کر ئیرادە
یەك زەرە نەکر مە لێ زیادە
هەتا (شەیتان)یش ، (خوداوەند) توانای ئەوەی پێداوە کە
سەجدە بۆ (ئادەم) نەبا :
ئیبلیسی فەقیری بی جنایەت
هەندی تەهەبوو د گەل عنایەت
هەر رۆژێ دکر هەزار تاعەت
لەو را کو تەداوی ئیستطاعەت
وی سەجدە نەکر ل غەیری مەعبوود
گێرا تە ل بەر دەرێ خوە مەردوود
٢ – خوداوەند ، لە رۆژی (قیامەت)دا ، ئادەمیزادان زیندوو دەکاتەوەو ، پاداشتی چاکانیان بە بەهەشتو سزای خراپانیان بە دۆزەخ دەدا :
(فی الجملە) مەجوملە خاسو عامان
عاسی ئوشەڤی ئونا تەمامان

*

تێکرا ب شەفاعەتا خوە خاس کە
ڤێکرا ، مە ژ ئاگرێ خلاس کە
کاتی خۆی ، بەرامبەر بەم باوەرییەی ئایینی ، ئیعترازی موعتەزلەکان هاتۆتە پێشەوە ، کە باوەڕیان بە (قدریة) ، واتا ، بەسەربەستیی ئادەمیزاد هەبوو لە کردارو رەفتاریدا .
لەلای ئەمانەوە ، هەر سەربەستییە کە پاکانە بۆ بەرپسیاری ئادەمیزاد دەکا ، دەنا ، پێچەوانەی عەوالەتی (خوداوەند) دەبێ کە ئادەمیزادان بەر پسبار بکا لە سەر ئەو کردارو رەفتارانەی کە خۆی لە ئەزەلەوە بۆی دیار کردوون .
بەرامبەر بەم ئیعترازەی موعتەزلەکان ، دەستەی (ئەشعەری)ی ئەهلی سوننەت ، بیری (جوزئی ئیختیار)ی هێنایە پێشەوە ، بەواتای ئەوەی، ئەگەرچی ئادەمیزاد بەندەوار (مسیر)ە ، بەلام توانایی ئەوەندەی پیێدراوە ، کە تامو لەزەت لە خراپەکاری وەرنەگرێو . ئەوەندەش بەسە بۆ عەدالەتی بەرپسیارکردنی . (خانی)ش ، وەکو هەموو نەزەربازەکانی ئایینی ، هەمان بیری دەربڕیوە :
لێ دایە مە جوزئی ئیختیاری

ـعسـامە ، پەلیدو حیلەکاری

*

ـﻫ ژی برییە ژ دەست مە ، ناچار
ـﻪ مانە ئو لوتفی حەق مەدەدکار

*

ـە پێشەوەدا گوتمان کە (خانی) ، لە ڕێگای فەلسەفەوە ، ـەوچەری گومانو ئەندیشە بوە . ڕاستی‌یەکەی ، شاعیری ـەرباز ، زۆر بەئاشکرایی پەنجەی بۆ ئەم لایەنە درێژکردوەو

. ـەب چە دەبت ژ بۆ مە کۆران
حـەت توو ڤەدی حجابو تۆران

*

ـیـەمە بکەی ئەمی دە عاجز
ـێ پەردە ئو بێ حجابو حاجز

*

دەرپێ (یەقین) بکەت (تەمەووج)
ئەم ژێ بکرین دەمەك (تەفەروج)

*

ـەڤ (ظن)و (گومان)و (علم)و (تقلید)
ـەمیل بین ب عەینی (توحید)

*

ـەسبابو وەسیلە قەت نەمینن
حـەك تە (مسببی) ببینن

*

ـین مەهەیە ب (ذاتی واجب)
ـیمکانیيەتا مە ، بوویە حاجب

*

ئەمجا ، کەخانی ، وەکو (ئیمامی غەزالی) ، لە ڕێگای هەستو هۆش (حسو عقل)ەوە ، بەم هەڵوێستە دژوارە گەیشتوە ، دەبێ ئەم هەڵوێستە چ شۆڕێکی عاتفی لە دەروونیدا پەرپا کردبێ ؟

چۆن لەم تەنگانەی دەروونییەی ڕزگاری بوەو بەیەقینی ئایینی گەیشتۆتەوە ؟

سەرتاسەری سروودی (مەمو زین) ، دڵۆپەی ئاگرینی سۆزو عاتیفەی ئەم شاعیرە بەرزەی لێ دەچکێتەوە .

(خانی دەیەوێ (یەقین)و دڵنیایی ئایینی وەدەست بهێنێتەوە ، پەرۆشی ئەوەیە لە نزیکەوە ، ئاشنای (پەروەردگار) بێ‌و پرشنگی جاویدانی ببینێ . بەڵام کە (هەستو هۆش) ، بەم ئاواتەی نەگەیێنن ، دەبێ لە ئاوێنەی بێ گەردی دڵی پاكو خاوێنی خۆیدا ، تەماشای پرشنگی جوانی‌ی ئەزەلی بکاتو گێرۆدەی بێ‌و دڵنیایی پەیدا بکاتەوە :

غافل مەبە عیشق (فی الحقیقە)
ئەی ڕاهرەو (أقرب الطریق)ە

شاعیر ، لە ئاوێنەی دڵی خۆیدا ، ئەو پرشنگی جوانی‌یەی دیتوە کە بۆی پەرۆش بوە . ئەو جوانی‌یە بەرزو دڵرفێنەی ، کە لە کاتی (ألست)دا ، دیتوویەتی‌و مەستی خۆشەویستی‌ی بوەو پەیمانی وەفاداری‌ی پێداوە[٤] .

ساقی مەی بگر کو ئەز ب دەستم
مەخموورمو مەی نەخواری مەستم

*

گاڤا کو ڤە خوار مەمێ ئو زینێ
ئاخفتی ل من جەهێ برینێ

*

ئەم عاشق ئەگەرچی مەی پەرستن
ئەمما ژ مەیا ألست مەستن

*

ئەو مەی نەوەکی مەیا تە ئاڵە
ئەو مەی ژ جەمالی (ذی الجلال)ە

*

ئەو حوبی حەبیبی پاکزاتە
قنوانی حەدیقەیی سیفاتە[٥]

لەم حالەتەی مەستی‌یدا ، ئەو هەموو شتانەی جۆراوجۆری جهانی ناسووتی‌و ئەو هەموو خەڵکانەی ئایین جیاوازی بەتەجەللاو بەنموونەی یێك راستی‌ی پەنهان (الحق الباطن) هاتۆتە بەرچاوی دڵ :

(فی الجمله) چ ئەووەل‌و چ ئاخر
(ألقصه) چ موئمن‌و چ کافر

*

هەر یەك ژ تەرا وەبوونە (مەظهەر)
ئەو رەنگە دوان توو بوویی (موضمەر)

*

بێ حوسنی‌تە نینەوان وجوودەك
بێ نووری تەنینە وان نموودەك

*

حیکمەت ئەوە (باطنی) ئو (ظاهر)
قودرەت ئەوە (غائبی) ئو (حاضر)

*

نینن تە (تجزؤ)و (تمکن)
ئەمما وە د ڤان دکەی (توطن)

لەو هەموو جوانی‌یە رەنگاو رەنگانەی کە دەشت‌و کێو مێرگ‌و مێرغوزاران دەخەملێنن ، یێك پرشنگی (جوانی‌ی خودایی) دەدیت‌و لەو هەموو ئاوازە خۆش‌و ناسکانەی کە سروشت‌و ژیان هەڵیان دەرێژن ، یێك (سروودی خودایی) دەهاتە بەرگوێ :

هەر یەك ژ نەوال‌و کۆهـو دەشتان
رەهـ شبهەتی گۆشەیێد بهەشتان

*

هەر رەوزە ریازی خولدی ئەکبەر
هەر چەشمە ژ عەینی ئابی کەوسەر

*

هەر کۆهـ ژ رەنگی (توور)ی‌رمووسا)
ژ ئەنواری (تجلی)یی تەییسا

*

هەر نەهرە ژ رەنگی ئەژدهابوون
هەر سەبزە ب موعجیزان (عصا) بوون

*

هەردار ژ فەیزی نەوبەهاری
تێك شوعلە دداد ژ نووری (باری)

*

هەر گول ژ میسالی ئاتەشی توور
یەك مشعەلی بێ قسوورو پڕ نوور

*

هەر مورغی سەحەر ب خوە کەلیمەك
هەر تووتی ئو قومری‌یەك نەدیمەك

*

هەر نەخلە نیدا کونەندە هەرگاه
تەشبیهی شەجەر دگۆ (أناالله)[٦]

شاعیر ، لەم حالەتەی مەستی‌ی گیانیدا ، بۆ پلەیێکی هەورازتر هەڵکشاوەو هەتا (ئەڤینی دڵداران)و (رکی بەدکاران)ی لەیەکتر جودا نەکردۆتەوەو (دڵدار) و (بەدکار)ی وەکو یێك ، بەگیرۆدەو گرفتاری ناوو سیفاتەکانی (یێك زاتی حەق) ناسیوە :

حوسناتەیە زینەتا حەبیبان
رشکاتەیە غیرەتا رەقیبان

*

مەیلاتەیە عاشقان دکێشیت
دەردی تەیە دل ژ بەر د ئێشیت

ئەمیش ، وەکو هەموو ریدارەکانی رێگای تەسەووف ، ئاواتی هەرە بەرزی ، بەخۆشەویست گەیشتن بوە ، تاوەکو لە دەریای ناوو سیفاتەکانی ئەودا فەنابێت‌و بمێنێتەوە . واتا ، هەتا

- ـەی نەمان (فناء) نەگات . هەست بەمانەوە (بقاء)ی خۆی

-

ـــی ژ خوە وی هەبت وجوودەك

ـ ـ ژ خودێ ئەوی نموودەك

*

ـ مەشرەبەیی وەفایی شاهی

ـ ـچتە مەشرەبا (إلهی)

*

ـی نەبتن فەنای موتلەق

ـیتی ئەو بەقایی (بالحق)

*

ئەمجا بۆ ئەوەی بەووردی روونیبکاتەوە کە چۆن (ئەڤینی مەجازی) دەبێتە پردێك بۆ گەیشتن بە (ئەڤینی خودایی)و بۆ ـەوەی گەشتی خاوەن دلآن ، لە جهانی بێ سنووری لاهووتیدا ـتە روو ـو نەخشی ئەو کەوانەی گیانیيە بکێشێ . کە لە ـرۆڤنی خواپێداوداوە بەرەو (پەروەردگار) هەڵدەکشێ . ـەربردەی ئەڤینی (مەمو زین)ی ، کردوە بەوێچوونێکی ـەمسیلی (میتافۆر)و ، ئەگەر چاو لەماوەی زەمانیی نێوانیان ـۆشین ، لە ریزی (منطق الطیر)ی (عطار)ی دادەنێین :

ـەرحا غەمی دل بکەم فەشانە

ـێ ئو مەمی بکەم بەهانە

راستیيەکەی ، شاعیری گەورەمان ، داستانی ئەڤینی ئەو ـلدارو دلبەرەی کردوە بەنموونەی ئەو ئەڤینەی کە بەخۆی ـرفتاری بوەو ، لە شەخسی دڵدارەکاندا . هەموو هەوڵێکی ـرووژانی دەروونیی خۆی دەربریوە :

(مەم) ، هەر لە یێکەم چاوپێکەوتندا . ئەوەندە شەیدای خۆشەویستەکەی دەبێ ، کە لە قوولایی زاتی خۆیدا هەست بە هەبوونی ئەو دەکا :

دڵ بوویە محەلی عیشقی حالا

ڤی حالی دڤێ محەللی ڤالا

*

نینە عەجەب ، ئەر بم حلوولی

من مایە ژ سوورەتێ هەیۆلی

کە دەخرێتە نێو زیندان ، ئازاری لەش و گیانی دەگاتە ئەوپەڕ (کەوێنەیە بۆ ریازەتی سۆفییان)و ، پێوەندیی لەگەڵ دەوروبەری خۆیدا دەپچڕێو جگە لە جوانیی (زین)ێ بیر لە هیچیتر ناکاتەوە :

سۆفیمە ئو سەومەعە نشینم

خۆش تالیبی نووری روویی زینم

دڵو دەروونی ئەوەندە رۆناك دەبێو ، بەحاڵێکی وەها دەگا ، کە لەهەر شتێکدا ، (زین)ێك ببینێ ، واتا پرشنگی ئەو جوانیيە موتلەقە دەبینێ ، کە سەرچاوەی هەموو جوانییێکە ، ئەمەش قۆناغی فەناو نەمانی دڵدارە لە دلبەرەکەیدا :

ئایینەیی دل وە بوو موسەیقەل

سوورەت ، وە ، ب مەعنەیێ موبەددەل

*

ئەو هەیکەلی مەتلەبی مەجازی

بوو مەلعەبی تفلی عیشقبازی

*

ئەڤ مومکنو (ماسوا) سەراسەر

(فی الجملە) ژ بۆ وی بوونە مەنظەر

*

ئەڤ دارو بەرو دەوابو ئینسان

ئەڤ مەعدەنو ئەڤ نەباتو حەیوان

*

هەر یەك د نوما ژ بۆ وی (زین)ەك

مەشهوود ژ هەر یەکێ یەقینەك

بەرە بەرە ، ئەڤینی (دڵدار)و (دلبەر) ، بەرەو (ئەڤینی خودایی) بەرزدەبێتەوە ، تاکو ، هەر دووانیان ، پێکەوە ، بەحالەتی (نەمان لە خودا)و (مانەوە بەخودا) دەگەن ، کە

پایانو ئامانجی گەشتی تەسەووفەو ، شاعیر بەم چەشنە رەنگی رشتوە :

بەرقەك ب عەجەب مەمێ ب سەرکەت
شەوقەك ژ سەری مەمێ ب دەرکەت

*

یەك شوبهەتی رۆژو یەك هەییف بوو
یەك شوبهەتی زێرو یەك ژ زیف بوو

*

ئەو شەمسو قەمەر کو (متصل) بوون
دەر حال ب یەکڤە (مضمحل) بوون

ئەو هەر دوو شەوقەی تێکەڵاوە ، دەبن بەیێك زەرەی رۆناکیو لە دەریای بێ سنووری ناوو سیفاتەکانی (زاتی حەق)دا ، دەتاوێنەوە . ئەوسا هەست بەماناوەی خۆیان دەکەن .

(زین) ، کە لە هەمان کاتدا بێ هۆش کەوتوە ، کە دێتەوە سەرخۆ ، ئەم گەشتەی گیانیو دوو قۆلیەی (خۆی)و (مەم) بەم چەشنە بۆ (میر زێندین) دەگێڕێتەوە :

رووحم ، تە ژ دل دەما (رضا)دا
شاهم تە ژ مولکی دل سەلادا

*

جسمی منی بێ نەوا گران بوو
رووحا منی نا تەوان رەوان بوو

*

دەر حال ژ قالبێ ب دەرکەت
شەوقەك ژ روحا مەمێ ب بەرکەت

*

وان تەرکی کرن سەرایی فانی
ئەو چوونە جهانی جاویدانی

*

دەم هاتنە ساحلی فەنایێ
گاه چوونە ب سەرحەدی بەقایێ

*

(فی الجملە) ژ مەرکەزا تورا بێ
ئەو زەرە گەهانە ئافتابێ

*

قەتعەن نە ب (اتصال)و تەحلیل
مەحزەن نە ب (انفصال)و تەحویل

*

وان رێ کو برن ب جانبی (زات)
باقی گەڕیان ب زاتی ، زەرات

(خانی) ، ئەم حاڵەی (مەمو زین)ی ، کە وێنەی (حاڵی خۆیەتی) ، بە یەکیەتی دیتن (وحدة الشهود) ناساندوە ، نەك بەیێكبوون (اتحاد) لەگەڵ (خوداوەند) . یان بە (حلول)ی مەسیحی ، یان بە (تناسخ)ی (هیندی) :

ئەی دیدەیی دل نەبوویی مەفتوح
ئینکار نکەی تەجەللییا رووح

*

دا فکری نکەی کو ئەڤ حلوولە
یا نەسخە ، خرووجە یان دخوولە

*

دازەن نەبری کو ئەڤ میسالە
یا قەولی زەعیفە ، یا بتالە

*

خەونا توو دبینی ، ئەڤ مەقامە
شەیئەك ژ (شهوود)ە نا تەمامە

ئەمجا کە دڵدارەکان بە پایەیێکی ئەوتۆ گەیشتوون ، جیاوازی لە نێوانی (ئەم)و (ئەو)دا نەماوەو (گشت)و (هێند) یان لەلا بوە بەیێكو بەرزەخی جودایی لە نێوانی (ئەڤینی دلداران)و (رکی بەدکاران) لاچوەو بەتەنیا (کرداری خودایی) خۆی نواندوە . زین ، هنگی ، جەوهەری (بەکر)ی بۆ ئاکشرابوەو ، لە (میر)و لە (تاجدین) . تکای بەخشینی ئەوی کردوە :

ـہر هيڤي دكەم نكەن عينادی
ـەرحەقي ڤی مەنبەعی فەسادی

*

ـەو را كو خودانی ئينس‌و جانان
ـِی خالقي ئەرزو ئاسمانان

*

ـِڒۆ ئەوی حوبی‌دا حەبيبان
ـەنگی ئەوی بوغزی‌دا رەقيبان

*

مەوجوودی كرن دەما ژ مەعدووم
ـەم پێكڤە دلازمين‌و مەلزووم

*

ـەم سۆرگولن ، ئەو ژ بۆ مەخارە
ـەم گەنجن‌و ئەو ژ بۆمە مارە

*

گول حفظی دبن ب نووكی خاران
گەنجينە خودان دبن ب ماران

*

ژ ئەووەل ڤە ئەگەرچی وی جەفاكر
ئاخر ب مەرا ئەوی وەفاكر

*

ـەو ژی د رييا مەدا شەهيدە
ـەحقيق بكەن كو ئەو سەعيدە

*

راستی‌یەكەی كە (خانی) ، بەزمانی (زين)ی ، پاكانە بۆ (بەكر) دەكات‌و لە ئەنجاميشدا دەيكاتە بەهەشتی ، بر لەو ـوەری‌ی سۆفييانە دەكا ، كە (خراپی = بەدی) ، بەواتايێك ـن بەشتێك لە شتەكانی (المتقابلة بالتضاد) دەناسێنێ . واتا : (خوداوەند) ، خراپی‌ی بۆ جهانی ناسووتی تەرخانكردوە ، بۆ ئەوەی چاكی‌ی بەرامبەری‌ی ، بەهۆیەوەی بناسرێت ، چونكە لە جهانی مادديدا ، هەر شتێك‌و هەر واتايێك ، بەهۆی شتێك يان واتايێكی پێچەوانەوە بە دياردەكەوێ[7] .

گاڤا ژ عەدەم خودێ كر ئيجاد
ئەڤ كەون‌و مەكان ژ نووڤە بنياد

*

مەجمووعی (مكونات)ی عالەم
حەتتا ڤە خولاسە نەوعی ئادەم

*

ئەشيا ب حەسەب سفات‌و ئەفعال
ئينانەو جوودێ موختەلف حال

*

مەوجوودی كرن ب هەڤ موعەييەن
أضدادی كرن بە ضد موبەييەن

*

ڤان ئەهلی جەهەننەم‌و عەزابان
ڤان لائقی جەننەت‌و (ثوابان)

*

نابينی كو پێكڤە جوملە زيدن
حكمەت چيە بۆچی پێكڤە نيدن

*

لەورا كو نەبت ئەگەر تەخالوف
تەمييز مەحالە هەم تەعاروف

دەنا نيسبەت بە (خوداوەند) ، (خراپی) هەبوونی نيە چونكە سروشت‌و تەبيعەتی (خودا) ، ناكۆكی‌و (تەقابول) هەڵناگرێ[8] :

يەك روونە ل نك تە كوفرو ئيمان
يەك سوونە ل نك تە خولدو نيران

ئەو هەموو بيروباوەری‌ی سۆفييانەی (كە خانی) لە شاكارەكەيدا دەربڕيون ، ئەنجامی جۆش‌و خرۆش‌و عاتيفەی

ئایینی بوە .

بۆیێکە ، کە لەم تەجروبەی گیانی‌یەدا هاتۆتەوە سەرخۆو لافاوی عاتیفەی نیشتۆتەوە ، بۆئەوەی ڕێگا لە هەموو تانەو توانجی ڕەخنەگران بگرێ فەرموویە :

ئەی موستەمیعی میسال تەسویل
وەی موجتەهیدی قیاس‌و تەئویل

*

خانی کو ژ جامی عیشقێ دین بوو
ئەو شۆرە شەرابی پێ شرین بوو

*

ئەڤ چەندە ڤەخوار ، ئەوی نەهیشیار
ئاگاهی نەما ئەوی ژ گوفتار

*

مەستانەیە ئەو ب کەیفێ مەعموور
دێوانەیە ئەو ب عورفێ (مەغدوور)

*

خولاسە ، دووای ئەوەی کە شاعیری نەزەرباز ، لە ڕێگای هەست‌و هۆش‌و ڕامانی فەلسەفی‌دا ، گومانی ئایینی‌ی پەیدا کردوە ، لە ڕێگای دڵ‌و تەسەووفدا ، بەسەر گومانەکەیدا زاڵبوەو بەیەقینی ئایینی گەیشتۆتەوە . ئەمجا ، وەکو (ئیمامی غەزالی) بۆ ڕارەوی (شەرعی ظاهر) گەڕاوەتەوەو ئەوەها ، پەیامی دینی‌ی ڕاگەیاندوە :

بەس ڤەنجی ژ بۆمە عامیانرا
هەر ئەڤ بەسە بۆمە عاصیانرا

*

ژ ئەووەل ڤە خودێ ب حەق بناسین
هەر چەندی قسوورو کێم‌و کاسین

*

پاشی ددلێ خوە ژێ بترسین
دینی خوە ژ عالمان بپرسین

*

چاوا کو دبێژن ئەم وو سابین
حەتتا کو ژ رووی دنێ فەنابین

*

پالا خوە بدەینە لوتفی باری
بەلکی مە ببەخشیتن ژ ناری

*

ئیتر ، لە کۆتایی ئەم گەشتەی گیانی لەگەڵ (خانی)دا ، لام وایە ئەوە دەچەسپێ ، کە هەر شاعیرێکی پایە بەرزی کورد نەبوەو بەس ، بەڵکو یەکێك بوە لە ریزی هەرە پێشەوەی ڕێدارەکانی ڕێبازی تەسەووف‌و کتێبەکەشی ، سەرچاوەیێکی زانیاری‌ی تەسەووفی ئیسلامی‌یە . هەر بۆیێکەش ، (پاشازادە – مقداد مدحەت بەدرخان) ، لە ژمارە (٢)ی رۆژنامەی (کوردستان)یدا : دەربارەی (مەم‌و زین) نووسیویە :

«ئەڤ کتێب حەمی بەیت‌و شعرن . ئەشکارا ، حکاتا عیشقا دوو جەوانایە ، باطن ، گەلەك مەقسەدو ، حیصەو حکمەت ژێ ، تێن فەهم کرن . لۆما . دڤێ مرۆڤ ب دیقەت بخوونیتن .) . . . . . . . (من ئەڤ کتێب ، جارە نا هن عولەماین تورك‌و عەرەبارە خوندیەو تەرجومە کریە ، حەمییا گۆتیە ، کو ڤێ ڕێدە ، ژڤێ کتێبێ ، چێترمە ، نە دیبە . .)[9] .

## پەراوێزەکان – ١

١ – قصة الفلسفة – ص – ٥٩ . ول ديورانت – تعريب احمد الشيبانى
٢ – تاريخ الفكر العربى – ص – ١٩ . الدكتور عمر فروخ
٣ – هەمان سەرچاوەی پێشوو – ص – ٣١
٤ – قصة الفلسفة اليونانية – ص –٢١٧–٢٢٠ . احمد أمين ، و زكى نجيب محفوظ .
٥ – هەمان سەرچاوە . ص – ٢٢٩–٢٣٠
٦ – تاريخ الفكر العربي – ص : ١٣٢–١٣٤ . الدكتور عمر فروخ
٧ –
THE LEGACY OF INDIA, P. 269
٨ – هەمان سەرچاوەی پێشوو : P. 172 – 174
٩ – تاريخ الفلسفة فى الاسلام : ص – ٢٠٠–٢٣٠ بەپەراوێزەکانەوە) أ . ت . دی‌بور . ترجمة الدكتور محمد عبدالهادى أبو ريده .

هەروەها کتێبی (المنقذ من الضلال – ی – ئیمامی غەزالی) .

–

A LITARARY HISTORY OF PERSIA, vol, 1 , P . 425

– هەمان سەرچاوە : P, 298 . ساڵەکان ، مێژووی مردنیان .

– هەمان سەرچاوە : P. 299 , 351 , 425 . ساڵەکان مێژووی مردنیان .

– هەمان سەرچاوە : P, 441

– هەمان سەرچاوە : P, 431 – 35

– التصوف – الثورة الروحية فی الاسلام . ص – ١٨٠ الدكتور ابوالعلا عفيفی .

–

ALITARARY HISTORY OF PERSIA, Vol, 1, P. 299

– هەمان سەرچاوە : P. 426

– النقد الأدبی الحديث – ص ٢٠٧ – الحاشية . الدكتور محمد غنيمی هلال

– ساڵەکان مێژووی مردنیان .

– فی التصوف الاسلامی وتاريخه – ص – ١٢١ . رينولد نيكلسون . ترجمة ابوالعلا عفيفی .

– نی = نایە رەمزە بۆ گیانی ئادەمیزاد . (نەیستان)یش رەمزە بۆ جیهانی لاهووتی .

– (وجد) سەربەخۆ بەسەر سۆفی‌دا دێ . (تواجد)یش لە رێگای (ذکروسماع)ەوە دێ .

– تاريخ الفكر العربی ، ص – ٣٨٧–٣٨٨ . الدكتور عمر فروخ

– هەمان سەرچاوەو لاپەرەکانی پێشوو .

– سوورەتی الكهف – ئايەتی : ١٧) ، کە (خودا) دەفەرموێ (وتحسبهم أيقاظا وهم رقود)

– تاريخ الأدب فی ايران – من الفردوسی الی السعدی . ادوارد ، گرانفيل براون – ترجمة الدكتور ابراهيم امين الشواربی : ص ٦٦١–٦٦٢ .

– هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص ٦٤٨–٦٥٢

– الصوفية فی الاسلام – ص – ١٠٣ ، رينولد نيكلسون ترجمة –نورالدين شريبة .

– تاريخ الفكر العربی – ص ٤٢٥–٤٢٦ (وحواشی الصفحتين) . الدكتور عمر فروخ .

– التصوف – الثورة الروحية فی الاسلام – ص ٢١٩ – الدكتور ابوالعلا عفيفی

– فی التصوف الاسلامی وتاريخه . ص ١٢٧ – نيكلسون – ترجمة ابوالعلا عفيفی

– اتصال : رامانی فەیلەسووفەکانی سۆفی وەك (ئەفلۆتین)ە .
واتای ئەوەیە کە ئادەمیزاد هەست بەپێوەندی لە نێوانی (خۆی)و (خوداوەند)دا بکا . (اتحاد) ، تەعبیرێکی سۆفیانەو واتای ئەوەیە کە ئادەمیزاد لەگەڵ (خوداوەند)دا تێکەڵ بێ (حلول)یش مانای نموودو دیارکەوتنی (خودا)یە لە ئادەمیزاددا . (بروانە – فی الفلسفة الاسلامية – منهج وتطبيقه – ص ٤١ . الدكتور ابراهيم مدكور)

– تاريخ الفلسفة فی الاسلام – ص ٧٣–٧٤ الحاشية وت .أه دی‌بور . ترجمة الدكتور محمد عبدالهادی أبوريدة .

– فی التصوف الاسلامی وتاريخه – ص – ١٣١ ، ١٥٢ . رينولد نيكلسون . ترجمة ابوالعلا عفيفی .

– هەمان سەرچاوە : ص – ١٢٦ – حاشية وملاحظة المترجم .

## پەراوێزەکان – ٢

– تاريخ الفكر العربی – ص – ٤١٨ ، الدكتور عمر فروخ

٢ – تاريخ الأدب فی ايران من الفردوسی الی السعدی . ص – ٤٠١–٤٠٢ أدوارد گرانفيل براون – ترجمة الدكتور ابراهيم أمين الشواربی .

٣ – بنوارە : الجانب الالهی من التفكير الاسلامی : ص –٥٦–٦٢ . الدكتور محمد البهی . هەروەها : تاريخ الفكر العربی ، ص ٣٤٤ – ٣٤٥ الدكتور عمر فروخ

٤ – دەستنیشانکردنی (ئايەتی – ١٧٢) لە سوورەتی : (الأعراف)ە .

٥ – قنوان = ووشی – هێشوو . بنوارە (المنجد)

٦ – دەستنیشانە بۆ (ئايەتی – ٣٠ ، لە سوورەتی – القصص) . مەبەست لە (كليم)ەك حەزرەتی (موسی)یە كە (كليم‌الله) بوە .

٧ – فی التصوف الاسلامی وتاريخه ، ص ٨٥–٨٩ . رينولد نيكلسون ، ترجمة ابوالعلا عفيفی .

٨ – هەمان سەرچاوەو لاپەرەکانی پێشوو .

٩ – کوردستان ، یەکەمین رۆژنامەی کوردی : ١٨٩٨–١٩٠٢ کۆکردنەوەو پێشەکی‌ی (دکتۆر کەمال فوئاد) . بەغدا – ١٩٧٢ .

## –سەرچاوەکان–

**بەکوردی :**

١ – مەم و زین – احمد خانی . حەلەب – ١٩٤٧

٢ – مێژووی ئەدەبی کوردی – علاءالدين سجادی . بەغدا – ١٩٥٢

٣ – کوردستان – یەکەمین رۆژنامەی کوردی : ١٨٩٨ – ١٨٩٢ . کۆکردنەوەو پێشەکی‌ی دکتۆر کەمال فوئاد – بەغدا – ١٩٧٢ .

**بەعەرەبی :**

١ – قصة الفلسفة – ول‌ديورانت – ترجمة احمد الشيبانی – بيروت

٢ – تاريخ الفكر العربی الی ايام ابن خلدون – الدكتور عمر فروخ – بيروت –١٩٦٦

٣ – قصة الفلسفة اليونانية : احمد امين وزكی نجيب محفوظ . القاهرة – ١٩٣٥

٤ – تاريخ الفلسفة فی الاسلام . ت . ج ، دی‌بور – ترجمة محمد عبدالهادی ابوريدة

٥ – فی الفلسفة الاسلامية – منهج وتطبيقه . الدكتور ابراهيم مدكور

٦ – الجانب الالهی من التفكير الاسلامی – الدكتور محمد البهی

٧ – الصوفية فی الاسلام – رينولد نيكلسون – ترجمة نورالدين شريبة القاهرة – ١٩٥١

٨ – فی التصوف الاسلامی وتاريخه – رينولد نيكلسون – ترجمة : ابوالعلا عفيفی – القاهرة–١٩٥٥

٩ – التصوف – الثورة الروحية فی الاسلام – الدكتور ابوالعلا عفيفی .

١٠ – النقد الادبی الحديث – ٢ جزء – احمد امين – القاهرة – ١٩٥٢

١١ – تاريخ الادب فی ايران – من الفردوسی الی السعدی – ادوارد گرانفيل براون – ترجمة الدكتور ابراهيم امين الشواربی : القاهرة – ١٩٥٤

**بەئینگلیزی :**

١ –

ALITARARY HISTORY OF PERSIA, VOI 1, EDWARD, G. BROWNE, CAMBRIDGE, 1967.

٢ –

THE LEGACY OF INDIA, EDITED BY, G.T. GARRAT, OXFORD, 1967.

# شەڤ و کاشو

(محسن قوچان)

هوگرا من :
من بڕیار دا
ئەو دیارێیت بەری کو ئەز تە بیناسم
بو من هاتین
ل خودانێت وان بزڤڕینم .
هەمی کچکێت کو بەری تە
ل سەر سینگێ من نڤستین
خوهو خوناڤێت رویێت وان
ب هەردو لێڤێت من ڤە رستین
وێنەیێت وان
ژ ئەلبوما خو بینم دەریو . .
ب دڕینم .
بیرهاتنێت وان
د هزرێت خودا
ب کەم هلم . . ب فڕینم .
بەرامبەر ، تو . .
کوڕێ خو یێ ل ژێ گولێ
ناڤێ م لسەر ،
ڕەنگێ سەڕوچاڤێت م لێ . .
تەمبی ب کەی .
دەمێ کو شەڤ دبیتن لغاڤ
دەڤێ گوندێیێت مە دبێنیت
نە روینیت خار . .
دویری شانویا شەرنیخێو
لێبڕێنیت .
کاشویەکی بدە دەستی
کا چەند پەنجەرێت تاری‌نە د گوندێ مەدا
بژکینیت و ب شکێنیت .
نە ئەوبیتن :
چ جار د گوهی‌دا بانگ ب دەی
چیرولکو داستانێت ترسێ . .
بەحسێ عەفریتو ئەجنا .
بلا هی بیت :
گەر وارێ وی هات داگرتن
ببیت گوری
بنڕیت ناڤ چاڤێت دوژمنا

# دوو پارچە شیعر

○

خالد دلێر

○

## یەك قسە ! !

لەخانوێکی بەکرێ دابووم
جێ‌ێ . بێ ڕێ‌وجێ دابووم
باخێکی بچووکی تیابوو
پڕ لە بەردو کەڵەگیابوو
کەبەرد وگیام بژار دەکرد
لەخۆڵ دام‌دەتەکاند . وورد . وورد
کەمن بۆ دەنکێ خاك وابم
واخەمخۆرو چاو لەدوابم
ئاخر چۆن ئەم کوردستانە
بەجێ دێڵم بۆ بێگانە ؟ !

## دەرس و پەند

عەیامێ ئێمە هاوڕێ بووین . عەیامێ
بەبێ یەکدیی نەمان دەخواست . مەرامێ
ئەوەندەم خۆشدەویستی . هەرچی خەوشە( )
لەبەرچاوم بزربوون . وەك نەفامێ ! !
ئەگەر گیانت بویستبام ئۆغرت بوو
ئەگەر ویستبام ئەتۆش ڕۆحت دەدامێ
کەچی ئێستا نەهاتی دەوری داوم
بەلامدا ڕەت‌دەبی . ناکەی سەلامێ ! !
بەدوو خەڵکێکی دەست ڕۆیشتوو کەوتووی
لەڕەفتارت . نەڕاستی‌ما . نەتامێ
بەڵێ پێوەندی ئەوساکەم لەگەڵ تۆ
گەلێ دەرسێکی تاڵ وسەختی دامێ(×)
سوار بگلێ دەبێ تاماوەیێکی ی
قبوول کاخوێنی لێ‌بتکێ . لەزامێ

(٭) – خەوش عەیب – کەموکوڕی
(×) – لەبەر هۆنراوەکەنەیێ . دەگوترێ : دەرسێکی گەلێ تاڵ‌وسەختی دامێ

# بەڵێن

سمکۆ ئەحمەد ڕەشید

ڕێبەندانی ١٩٨٢

هەولێر

بەدوای خۆتا یەکالا کرد
لەگەڵ یەکەم پێچی زریان
لە گوڵستان
بوو بە پرسەی گەڵا ڕێزان
هەر ووشەبوو
لە ئامێزی شیعرەکانم یاخی دەبوو

×

ئەی تۆ نەتووت ؟ !
لە تابلۆی ئەم ژینە ژانە
هەراسان بوویت
ناخی دڵم تۆی میوانە
ئەی تۆ نەتووت ؟ !
هەور بۆ کەل کڕنووشی برد
لە شەوانی ڕێبەنداندا
کاتێ ئاسمان بەکوڵ دەگری
بیە بە من ، دەبم بە تۆ
تاکو خۆزگەی گشت بەخیلێ
بێ بە سۆ

×

–کەچی ئێستا
بەڵێنەکەت سوارێکی ڕم بە دەستەو
سنوور دەبڕێ
لەودیوو پەردە هەڵدەترووشکێ و
لە ئامێزی شەوەرەنگا
تێشک دەگرێ
هەر وێڵێکی گزنگی خۆر
بکەوێتە داوی بەڵێن
بێ‌تێشک دەمرێ . .

ئەوا ئەمشەو
کۆرپەی ووشە زیندانیەکان
مایان گرتووەو ژیر نابنەوە
لە باوەشی دایکیان یاخین
ئاوێزانی بالات نەبن ئاشت نابنەوە

×

کە کۆچت کرد
دەرگای ژانت

# گەردانەی ڕازەکانم

بۆ هەنگاوەکانت شل‌بوون ؟ !
بۆ باڵەکانت لە باڵەفڕێ کەوتوون ؟ !
بۆ مل‌نانێ‌ی بەرەو ئاسۆ ؟ !
ئەوەتا خۆر چاوەڕوانتە
هەورەکانیش بانگت‌ئەکەن
لەنگەر مەگرە
هێشتا زۆرت ماوە بگەی ! !
نەکا پەپوو فریوت‌دا
لەنگەر مەگرە
تا نەگەیتە هەوارگەکەی خۆرو باران لەنگەر مەگرە
تا نەگەیتە شاری سپی ئەستێرەکان

* * *

ئاسمان نیشتمانی هەورە . .و
هەوریش نیشتمانی باران
من بتناسم
هەر ئەو عاشقە شەیدایەی
دڵۆپێ خۆرو بارانی
ئەی ئیتر بۆ لە چەقی ڕێ‌چەقیویت‌و
هەنگاو نانێ‌ی
لەناو لمی ناسۆرێکی نادیارا
لەنێوانی جۆگەلەیەك زامی سپی . .و
زریباریکی ئازارا
ڕەپ وەستاوی
هەنگاو نانێ‌ی . . .
بۆ هەنگاوەکانت شل‌بوون ؟ !
بۆ باڵەکانت لەباڵەفڕێ کەووتوون ؟ !

* * *

تۆ لە هەستما چرایەکی
خوێنەکەم دەکەم بە نەوتی
سروەیەکی پەیامی ئەستێرەکانی
کێشوەری خوێن بۆخوا دەبەی
تۆ لەرەوتی کار مامزی یادەکانمای
خۆرێکی گەورەیت . .و
سیروان ئاوێنەتە
پێغەمبەرێکی سپیت‌و
خاڵە ڕەشەکانی مێژوو ئەسریتەوە
ئەی ئیتر بۆ ؟
بۆ هەنگاوەکانت شل‌بوون ؟
بۆ باڵەکانت لەباڵەفڕێ کەوتوون ؟ !

* * *

**هەوری سمات هێشتا بارانێکی سووری**
**لە هەگبەکەی حەشارداوە**
**زەوی ووشکیش هێشتا تینووی**
**ئەو بارانە شاراوەیە**
**بۆ لە ئاسۆی بیری مێژوو**
**بارانی‌تر ناباریێنی**
**تا ئەرخەوانەکان تێربن**
**بۆ تۆوی گوڵاڵە سوورەی نوێ ناچێنی**
**تا شەونم ئەمجارە بە دڵ**
**گەردی گەڵاو گوڵاڵەکان بشواتەوە**
**بۆ هەنگاوەکانت شل‌بوون ؟**
**بۆ باڵەکانت لە باڵەفڕێ کەووتوون**

# چار پارچە شیعر

## بانگینا نەخوەش

ژ سالۆخدانا دیارە
خویانی ل دوورهیێ سەکنین
ویڤەتر ئەڤرۆ گەفخویێنە
بوومە پەریێ پیڤازیێ
بابەلیسکا دامە بەرخوە
نهینیێیا ب پەروا هەر تێنە
وەك ساڤایێ ژشیرڤەکری
بیرییا مەمکیێ دیا خوە دکم
مینا کەسیێ دخەریك چۆی
پیلێن دژوار سنگیێ سۆتی
ل تەقەکیێ باو بارۆڤەنە
نژدەڤان دیسا وەناکن
دەستو لەپێن بووکا سالیێ
بسكو گولیێن کەفنارنجی
ببینن خەنا ! !
ل خەلکی مرازە لاو پیربن
من مرازە
چزاڤزی نەئێنە کار
کورتو پست ئاشکەرابن
بەرکەل داکەڤنە سەماییێ
ل ئەردیێ خودیێ نەییزابن
ل من مرازە
راستی بێنە هلبێرین
مراز نەبن
رازێن شعر تیێ نخاڤتی
لبەر تییێ ساهییێ ڤەبن ! !

١٩٨٤/٦/٢٩

## ریێ بدنە من دیێبێژم

هیڤیێن من زەریا وانێنە
شەڤو رۆژیێ تێكدبۆرن
ئارمانجو داخواز کانێنە
کۆڤان بخوە سترانن
سینایینە ، شەوق
چریساییا خرانن
ب چ رەنگیێ هەی
لنگێن مرازا دیێڤەبن
شۆرو گلیێن مە هندەکا
هەر گاڤا دبن
دیێ ب خوە بن
هندی چاڤێن مە سێرەدکن
دیێ دناڤ هەڤێسا مە ب خوە بن
ریێ بدنە من
تەڤی جزیری دیێبێژم :
«مەحبووبو خوبو دلبەران
بگری ل وان حەفتیێ دەران

دیٚ خوه ژ شوبباکو پەنجەران
ظاهربکن د هەر عەردەدا»
۱۹۸۳/۱۱/۲۷

## جارەکیٚ ژ جاران

جارەکیٚ ژ جاران
راستیٖ یٚ ! رٖند ببیزه
ئا ل ڤاران
بەریٚ تە دانه
رٖیکەکا بیٚ سەرو بیٚ بەر ،
زمانیٚ تە ژ گەلالووشکیٚ
دەرانین .
ژبۆ رٖیچا خوە وندا کی
شاش بمینی ،
چو ریٚ نەمان ل تە نەبرٖین .
ئافەرین سەد ئافەرین
هیٚژ تە چاڤە بیٖیە پیٚلەك
پیٚلەکا دژوارو بۆش
خەرگەلا چڤتەلیٖیان
ب خەوەرە بیٖ ، سەرگوم بکی
قەسەیەکە
من کریٖیەو لیٚڤەنابم ! !
راستیٖیەکە بسەر هلبوویمەو
ژیٚڤەنابم ! !
تو دلی ب سەریٚ خوە دلی
رٖیبەریٚ تە کولە ، ژانە
بزاڤا تە سەبا مانە

دەنگیٚ تە ، تم ئاشکرایە
دەنگیٚ تە هاوارە ، هانە ! !
۹۸۲/۲/۱۷

## دەرەوا نیسانیٚ

کونەبا جارکیٚ خوە لیٚکدا
کۆرەك بەستن ، هەمیا تیٚکدە
ڤیان دەرەویٚ تاڤکن
خوە ژ زانینیٚ قەنج سافیکن
یەکی فەنا هتلەر ئانین
شەپرزە دانە دەست زانین
رٖابوو نەهشتن . . دۆقەدار
رٖابوو بەربات . . سەر دەڤو زار
رٖابوو ئاگر ، بەس بیٖقام سار
خوەزی شەقاندە سالاٚ پار
دیتنا دیتین
ل ملەکیٚ رٖاستی بوو لەبیٖ
شیٚرگەل هەبیٖ ،
دەرەو بوو با
دەرەو ددەست خوەدە بەبیٖ ! !
ژهنگیٚ وەرە هەتا ئەڤرۆ
دەرەو زڤیٚرە ، دەرەو کاس
ژهنگیٚ وەرە هەتا ئەڤرۆ
دەرەویٚ ، زانینە کراس ! !

۱۹۸٤/٤/۲۹

# بۆ کوێ بڕۆم بە تەنیایی

ئەحمەد شادی

-پایزی/١٩٨٤-

قەلادزێ

«١»

منیش وەك شاعیرانی دی
رازو نیازی خۆشەویستی ،
خۆم هەڵڕێژم ! !
منی تەنیا لە بیروونی ئەشقدام ! !
لە زەندۆڵ و شیوو هەڵدێر
لە شەوە زەنگێکی لێڵ دام . . .
دەمم ناوەتە نێو «تاڵی»و ،
تێر دەیمژم . . .

* * *

منیش وەك شاعیرانی دی
لە ئامێزی تاریکی دام . . .
لە کەلاوەی ساردو سڕی تەنیایی دام
دوورم لە تریفەی چاوانت
لە بۆنی بسك و زوڵفانت
دوور لەرازو بزەو نیگا ! !
لە خەندەی لێو ! ! . . .
لە رازی پاك ! ! . . .
بێ ناز کەوتووم لەبان جێگا ! !

«٢»

بۆ کوێ بڕۆم بەتەنیایی ؟ !
ملی کام کێو بگرمەبەر . . . .
کام لایەك ، ببتە جێ ژوانم ! ؟
یادگاری تۆ ، بۆ منی هەژار
چ . . . بێ . . باشە ؟ ! !

بزێك نەبوو ببڕێتەوە . . . !
تاکە گوڵێکی ، بەهار بوو . .
سیس بوو بوو ، دەگەشێتەوە . . . .

* * *

بۆ کوێ بڕۆم بە تەنیایی ؟ !
خۆشەویستیت ، لە خوێنمدا
قوڵپ دەدا ! ! ! ! .
گوڵیلکەی تۆ . . .
لەسەر سینەی بێ نازمدا ،
ساباتێکی لێ هەڵداوە . . .
بوخچەو بارگەشی تێك نانێ . . .
کۆچ بکا . . . کۆچ . . . ! !
رەگ و ریشەی مژۆڵی تۆ . . .
بۆتە دەوەن لە ناخمدا . . ! !

* * *

بۆ کوێ بڕۆم بە تەنیایی . . . . ؟ !
بیمە ڕێبوارێکی رەبەن ! ! !
گورگیش دەمخۆن لە چۆلایی . .
لە توولە ڕێیان ، لانادەم ،
وێڵی عەشقی پیرۆزی تۆم ! !
بۆ ئەو تاکە گوڵەت . . . شەیدام !
بۆم مەچێنە
درك و داڵ و . . . دەنکە داوت . .
بۆ هەر کوێیەك بچم و نەچم ؛
دێوانەی تۆم . . . .
دێوانەی تۆم . . . . .

شیعری

## عادی ڕۆژکانی

شوکور مستەفا

لە لاتینییەوەی کردووە بە پیتی کوردی

گریداخ گازنە ،
دبێژە سەریٚ من دێشە ،
چیە دەردێ تە ، ژ منرە بێژە ،
ئەڤ چ حالێ کەرو گێژە .
چ تە ڤەشێرم ، چ ژ خوەدێ .
هنگی هەمە ل ڤی ئەردی .
من گەلەك کول‌و دەرد دی ،
تەرا بێژم هێدی — هێدی .
بیرنایێم دێ — باڤێ ئەز ژ کو ئاینم ،
ئەلەگەز ، سیپان ، ئەندوورەك‌و شەنگال .
ل من مانە شاش‌و مەتال .
ئەم هەڤدو شابوون ، بوونە هەڤال .
مە گەلەك دیت ، دەربازکر زەمان ،
مە سار — سەرما دیت ، باو باران ،

پاشێ ل مە ڕابوو تۆفان ؛
نوهێ ڤەبوو هات بوو مێڤان ،
مە قەدرگرت ، دا سەر سەران‌و سەر چاڤان .
گەلەك مللەت هاتن ژ مە پەیابوون ،
مەڤ هەڤ حزکر ، هەڤدو شابوون .
چاوا ئەم دێ تو باڤ ئەو ژی ئەولاد بوون ...
ئالیکی مە دەشت‌و زۆزان ،
ئالیکی گوند ، باژار بوون ،
ئالیکی گول ، سۆسن ، ئالیکی ڕحان ،
شێن‌بوو ، شاێ‌بوو ، هەر دەر دلان ،
مە خوەشی دەربازدکر دەوران ،
دلێ تو کەسی نەدما جیناران .

سال — سالا بوهوری ،
دەوارێ مە زڤری ،
ئۆرتێ هات هلدان مێتی ، جامێرتی
هنەکا ئاڤ ، هنەکا ڕێ ل مە دبڕی
مەو دژمن گەلەکی بەر هەڤ دان ،
گەهـ مە لێخست ، گەهـ ژی ئەوان ،
ئالیکی ڕۆم‌و فارس ، ئالیکی . . . ،
هەڤ شێورین ، گۆتن ئەم چابکن ژ کوردستان .
بینن زێڕ ، زیڤ ، ئەشیاو تالان ،
کوردستان ل هەڤ پارڤەکرن ،
لێ خەلکێ کورد قەبوول نەکر .
هەرچار ئالی هێوارزەکر .
همبەر دژمن سەری ڕاکر .
ئەزو دێرسیم ، گەلیێ زیلان .
مە کورد هەمێزکر ، دا سەر ملان ،
دژمن ئەم دان بەر تۆپ‌و گوللان .
ئێران ڤێ ئالی ، ڕۆم ڤێ ئالی
قەرەچەکرن هەرچار ئالی
شەڤ مە بوو ڕەش ، ڕۆژ بوو تاری .
کورد پڕ کوشتن ب ڤی حالی .
دێرسم دگری ، سیپان دنالە ،
ئەز شەرمدکم ژ خوە ڤی حالی ،
گەلۆ ڕۆژێ ئەم ژی بین خەلاس .
ئازادو سەرفراز ، دەستێ مە بگهێ ئەلەگەز ،
کەس نامینە هێسیرو بەلەنگاز .
دبێ جهێن دۆرب دۆرە ، نە ب زۆرە ،
چەرخەك ل ژێر ، یەك ل ژۆرە .

# چنارخان

چنارخان ئەی نەمامی کوردەواری
چ دڵگیرو چ نەشمیلەو لەباری
چناری یا چنارۆکی گیانی
بەهەشتی تۆ یا نهێنی ژیانی
کە جارجارە بەلاما تێدەپەڕی
زەردەپەر ئاسایی ڕەنگم دەپەڕی
دڵە کوتکێ وادەمگرێ بە تەرزێ
وەك - بی - نێو ئاو لەگەڵیا چۆك دەلەرزێ
ئەوەی هۆشە ئەوەی ئارامە دەمرێ
پەری ئاگام بەرەو سێدارە دەبرێ
مەلی سەرنج بۆ بەینی ئەو مەمانە
پووش دەکێشێ هەتا بیکا بەلانە
کە چاوم لێ دەکەیتو دەم دوێنی
گوڵی عەشقێکی بێگەرد دادەچێنی
لەچاوانتا وون‌دەبم بێ سەروو شوێن
دەسوتێتو دەبرژێت دڵەی پڕ خوێن
هەناسەی پێکەنینت مۆسیقایە
کەمانە جومبشە سەنتوورە نایە
سەرم سورماوە تێناگەم خودایە
چ هەستێكو چ سۆزێکی تیایە
وەرە بەم لەشە پڕ تامو نیانە
دڵی من پێش‌کەشەو بیکە بە لانە
لە باوەشما مەتۆرێ بابی باوان
بنوە تاوێ لەسەر سینگی پیاوان
هەتا ماوم هەتا خوێنم لە کارە
لەناو دڵما چنار نەخش‌و نیگارە

● بیزا ●
١٩٨١

تابلۆیەکی فۆلکلۆری

# چایخانەی پیران

o

حمە أحمد جاف
قەلادزێ
١٩٨٣/٩/١

(پیران) جەم[١] دەبن لە نێو چایخانە
(باپیری) چایچیش ، هەر لە خۆیانە
سەماوەری زەرد ، گیزەگیزی دێ
گۆنگەڵی[٢] گەورە ، ڕووی کردۆتە وێ[٣]
گۆنگەڵێ . . گۆنگەڵی ، پیرەمێردانن
بابو باپیری ، ئێمەمانانن
هەر کەژوور کەوتی ، بە چرە دووکەڵی
بینت[٤] دەگیرێ ، وەختە دڵت هەڵێ
یەك لە بەر پیری ، ئاخ هەڵدەکێشێ
یەك لەوبەری‌یەوە ، قەننە دەکێشێ

خراپەی ، کوری باس دەکا
نەسیحەت کاری تیٚ ناکا
درەنگانیٚ . لە بۆم دیٚتەوە
نە کویٚبووی ؟ مۆر دەبیٚتەوە
دویٚك بە (دامە) لیٚکدی[٥] راماوون
ئاغا»ی لیٚکراو . دوو داشی ماون
. . . ئەو داشەش . . . جا داشە هارە . . .
ت لە خۆیێ ! ! ئەلیٚرە سوارە . . .
**حود** : ها . . . سیغاریٚکی ، لەو تووتنەی دویٚنیٚ
مەنشوورە تووتن ! تووتنی بیتوێنیٚ[٦]
ش پیٚراریٚ ، عەوللا شەمیٚران
ئاوابیٚ ، لە گەلٚ گویٚ دیٚران
(بیتوێنە) تووتنی کردبوو
چوار هۆقیٚکی ، بۆمە[٧] ناردبوو
سەکەت وەگرە ، لویٚچیٚکیت[٨] دەمیٚ
بنە کیسیٚکە ، زۆریت نادەمیٚ
لە بۆیەش بوو ، زۆرم نەدایەیێ
یەم پیٚ گووتی : لیٚم نەکەی غایەیێ
**حر** : سەلامون عەلیٚك . . . بین بیٚ بەلاٚ
**تیکرا** : عەلەیکموسەلام وەرەحمەتوولاٚ
**هەباس** : ئای وە عەلەیکوم ، (مامە خلە) وەتۆی[٩]
یاخودا بە خیٚریٚ ی ، ئەوجا چ . . . دەخۆی
**خدر** : جاریٚ هیچ ناخۆم ، بابحەسیٚمەوە
لە سبحەینیٚ را . . . ئیٚستیٚ[١٠] دیٚمەوە
عەرزم داچاندووە ، بە گوڵە بەرۆژە
**هەباس** : بۆیەت نابینم (خدر) چەندرۆژە ! ؟
**خدر** : رۆژیٚ بۆ رۆژیٚ ، کاریٚك دەبریٚ پیٚم ! ! !
سەرەرای ئەهوەش[١١] ، خەریکی تووتنیٚم
**هەباس** : (قەرەنی) ئەوەش ، شیٚخ ئاورەحمانە
**قەرەنی** : خۆ ئەهوەش (سۆفی) لە مەر خۆمانە

**هەباس** : خۆ واخەریکن ! بەرەو ئیٚرە دیٚن
ئەدی ئەوانەی ، لە پشتەوان[١٢] کیٚن ! ؟
**قەرەنی** : (هەباس) ئەهوانە ، دەڵیٚی غەریبن !
**هەباس** : ئەسەح غەریب نین ، ئەی دەبیٚ کیٚ بن[١٣] ! ؟
**قەرەنی** : ئاخ . . . دەردە پیری . . . چاوت پیٚ دانام ! !
کەس ناناسمەوە . . . تانەگەنە لام
دوێنیٚ . . . پیٚش نویٚژیٚ ، چوومە دوکتەری[١٤]
لووتم کەوتە لووت ، حەمە مەیتەری
**هەباس** : تووخودا پیٚم بڵیٚ : حاڵو ئەحواڵی
**قەرەنی** : دەك خواو پیٚغمبەر ، دەسگرنە باڵی
**هەباس** : خودای لیٚ رازی بیٚ ، زۆر پیاوی چاکە
لە سویٚ ی منداڵان ، گەلیٚك هیلاکە
**هەباس** : لەبیرم چۆوە ، عیلاجت چۆن بوو . . ! ! ؟
**قەرەنی** : مەڵحەمو قەترەی ، دەساڵی کۆن بوو ! !
**هەباس** : کاکی من ئیٚ چاك[١٥] ، هەموو دەفرۆشن
هەرچی کۆنیش بوو ، بەمەی[١٦] دەنۆشن
**قەرەنی** : باپیر . . . چای تازەت . . دەمی کیٚشاوە ؟
**باپیر** : چەند (چا)ی دەفەرموون ، بە هەرتك چاوە[١٧] . .
**قەرەنی** : دەبۆمان تیٚکە ، ئەوەڵ نۆبەرە
تەشق بشکیٚنین ، شەرتێ لە سەرە
**باپیر** : (شەرتو بیٚ شەرتێ مالوومی[١٨] داوە)
چایەکەم . . . چایەو بۆوم[١٩] لیٚناوە
دەك ! باپیری من ، بە قوربانوو بیٚ
دائیمەن خۆشی ، بە سەردانوو بیٚ
(چا)م گوڵی ، سلیٚمان بەگی بانەیە
بۆنی وەك : بۆنی تۆو رازیانەیە
**هۆمەر** : (قەرەنی) دەڵیٚن : هەزاری گویٚزی
هەر لە کرین نایەو دەگیریٚ ریٚزی
**قەرەنی** : (هۆمەر) وەوتۆیە[٢٠] ، بادامیش وەك وی
زۆر گران بەهانو ، ناشکەونە زەوی

**سلێمان** : دە ئەوجا . . . باپیر (دامە)کێ بێنە ! ؟
با لێکدی دەرکەین ، چیدیم مەدوێنە
هەر بە مەرەدی دوێنێکەت دەبەم
**باپیر** : پێشت نەوێرم ، لە گەڵت دەکەم
(مام سلێمان) چیدی توانجان مەهاوێ
باقوڵان هەڵکەم . . . ئەوەی پێ ناوێ
یاری بۆ یاری ، نەك بۆ بردنەوە . . .
**سلێمان** : هەی تەروانیە ؟ ئۆین‌و بەستنەوە
(دامە) فەندێکی (*) ، گەورەو حونەرە
گەر چاك بیزانی ، (ئاغا)م نۆکەرە
وە لەو نایزانی‌و شەران دەفرۆشی
(خەم) خەمی تۆیەو بەمنی دەنۆشی
**سۆفی** : **(سەلیمی بایزی)**[٢١] ، حەیرانێکی بڵێ
بۆ سەر بهوردی[٢٢] ، خا وەنی (نوقڵێ)
داقەنداغێکی ، بۆ بێنە (باپیر)
با داخورپێنێ ، دڵی گەنج‌و پیر
**سلیم** : هەرچەند ، دەنگیشم وەك خۆ نەماوە
ئەو سیغارە گولە ، لەمنی تێك داوە
بەڵام بۆو دەڵێم ، چارم ناچارە
-حەیرانەکەشمان ، (خاڵۆی ڕێبوارە)

* – فەند : واتە هونەر ، بەڵام بەو شێوەیە لەسەر زاری خەڵکی ڕەش‌ورووتی ناوچەکەمان دەق گرتووە . . .

**حەیران** :
(هۆ خاڵە ، خاڵە . . . ئەمنیش ڕێبوارم
ئەمنیش وەکو : تۆ دڵ بریندارم
هۆ خاڵە ، خاڵە ، خاڵەی خوانەناس
بەزەییت دابێ ، بە منی کەساس
هۆ خاڵە ، خاڵە ، خاڵەی تفەنگ لەشان
بۆ گەرمیان دەچی ، یاخود بۆ کوێستان
گەر بۆ کوێستانە ، دەرۆین بە جووت
گەر بۆ گەرمیانە ، ئەمنیش دێم لە دووت)
(پیرە مێردەکان تێکرا وەکو : کۆرسێ سەران دەلەقێنن
-و هاوار دەکەن بە یەك دەنگ :)
هەك جێت بگاتە ، پایەی پادشایان
دەك ڕەحمەتت‌بێ ، لە باب‌و دایان
بەڵێ بەم جۆرە . . . لەو چایخانەدا
یەکێ قسە دەکاو ، یەکێ ڕەت ئەدا
ڕۆژ تائێوارێ ، بەو قسەو باسانە
دەبێتە (گۆنگەڵ) ، لە نێو چایخانە

پەراوێز :
١ جەم : جمع : کۆدەبنەوە
٢ گۆنگەڵ : مەبەست لە کۆمەڵێکی (جماعەتێکی) زۆرە کە شوێنێ کۆیبان دەکاتەوەو دەیکەنە هەراو بگرەو بەردەیەك ، کەس ئاگای لە کەس نی‌یە . . .
٣ – وێ : کورتکراوەی (ئەوێ)یە .
٤ – بینت دەگیرێ : قورگت ئەگیرێ . . .
٥ – لێکدی : لەیەکتری .
٦ بیتوێنێ : ناوچەیەکی بەرفراوان‌و بەپیتی کشتوکاڵیە ، بە تایبەتی (گوڵە بەڕۆژەو توتن) . . کە شاری ڕانیەو شارۆچکەی چوارقورنەی دەئامێز وەرێناوە . . .
٧ بۆمە : کورتکراوەی بۆ (ئێمە)یە . . .
٨ لوێچێك : چەنگێك : مستێك . . .
٩ – وەتۆی : ئەوە تۆی . . .
١٠ – ئێستێ : ئێستا
١١ – ئەهوەش : ئەمەش : ئەوەش
١٢ لە پشتەوان : لە پشتی ئەوانەوە ، لە دوای ئەمانەوە
١٣ – کی‌بن : کێ‌بن
١٤ – دوکتەری : دکتۆری : پزیشك . . .
١٥ – ئێ چاك : ئی چاك : هی باش
١٦ – بەمەی : بە ئێمەی
١٧ – بە هەرتك : بە هەر دووك : بە هەردوو چاو
١٨ – مالوومی : مەعلومی ، زانراوە . . .
١٩ – بۆ وەم : بۆ ئێوەم
٢٠ – وەوتۆیە : ئەم ووشەیە زۆرتر لە سەر لێوانی بەساڵاچووەکانماندا خەریکی هەڵبەزو دابەزن : مەبەستی لە وەکو تۆ ئەڵێی وایە :– واتە کورتکراوەی ئەم چەند ووشانەی سەرەوەیە .
٢١ – سەلیمی بایزی : دەنگێکی زولاڵی حەیرانی کوردی‌بوو ، لە ناوچەی پشدەر . . .
٢٢ – سەربهورد : واتە (سەربردە)یان (بیرەوەری)

# مەلا ئەحمەدو شێخ بێستان سوور

محەمەد عەلی قەرەداغی

ماوەیەك لەمەوبەر شەوێك برای بە نرخم مامۆستا حەسەن محەمەدئەمین پێنجوێنی هات بۆ ماڵمانو بەسەری کردمەوە . .ەوەیەکی خۆشمان بە باسی نووسینو کتێبو بەرهەمی تازەوە .بوارد . لە کاتی گفتوگۆو باسی ئەدەبدا – پاش ئەوەی چەند .دەسنووسو وێنەی دەسنووسم پیشان دا – وتی : منیش هەندێك دەسنووسو شتی کۆنم هەیە حەز ئەکەی بۆت ئەنێرم . .ێ ئەوەی بزانم دەسنووسەکان چینو چییان تێدایە پێشەکی زۆر سوپاسم کردو وتەکەیم بە خەلاتێك زانی .

پاش ماوەیەك بەڵێنەکەی خۆی بردەسەرو دەسنووسەکانی بۆ .ردم . بەلام دەسنووسی چی ؟ ! بە راستی بۆ منی تینووی ئەو .بەتە گەورەترین خەلاتو دیاری بوو . لێرەیشدا جارێکی .یکە سوپاسی بێ پایانی بۆ تازەدەکەمەوە .

ناموێ لێرەدا باسی سەرجەمی دەسخەتەکە بکەم ، جونکە زۆری دەوێتو بە هیوام – خودا یار بێت – چی .لاونەکراوەو بە کەڵکی تێدایە بە گوێرەی دەرفەت ساغیان بکەمەوەو بیانخەمە سەر خەرمانی کەلەپووری ئەدەبی کوردی .

لێرەدا وەك بەرکولێ پارچەیەك شیعری نایابی لێ وەردەگرم . ئەم پارچە شیعرە لە دوو پەرەی شرو قەراخو بیجاخ خوراودایەو کۆتاییشی دیار نیەو ، گومانم بۆ ئەوە دەچێت زۆریشی لێ لەناوچووبێت . دووبارە گومانیشم بۆ ئەوە دەچێت ئەو دوو پەرە لە بنەرەتدا لەم دەسنووسە نەبنو لە شوێنێکی دیکەوە هێنرابن خرابنە ناو ئەم دەسخەتە ، چونکە شێوەی دەسخەتەکە تۆزێك جیاوازی لەگەڵ خەتەکانی ناو دەسخەتەکەدا هەیەو ، دەسخەتەکەیش شرو پەرپووتو پەرەپەرەیە .

بە هەرحاڵ ئەگەر بەشێك لەم دەسخەتە بێتو ، ئاوەکی نەبێت ، ئەوا نزیکەی صەد ساڵێك لەمەوبەر نووسراوەتەوە ، وەك وتمان کۆتاییەکەی نەماوەو نازانرێ کێ دایناوە .

لە سەرەتای لاپەرەی دەستپێکردنەوە نووسراوە : (کەلامی مەلا ئەحمەد) ئیتر هیچ شتێك دەربارەی ئەم مەلا ئەحمەدەو شوێنیو ژیانیو هۆی وتنی شیعرەکانی نەنووسراوە .

یەکێك لە نووسەرانی دەسخەتەکە کوری مەلا ئەحمەد ناوێکە ، گومان بۆ ئەوە دەچێت شیعرەکان شیعری ئەو مەلا ئەحمەدە بن ، بە تایبەتی کە ئەو مەلا ئەحمەدە هاوچەرخی کاك ئەحمەدی شێخ بوەو لە شیعرەکانیشدا ناوی کاك ئەحمەدی بردوە .

ئەگەر وابێ ئەبێ مەلا ئەحمەد لە (بێستان سوور) بووبێت‌و لەوێ مەلا بووبێت ، بەلأم بۆچی گەیوەتە (بانە)و چۆن (بێستان‌سوور)ی بەجێ‌هێشتوە ؟ ئەمانە هەر گومان‌و پرسیارن‌و زۆر شت هەڵدەگرن . با بزانین بەڵکو لەمەولا زیاتر شتمان لە بارەیەوە بۆ روون ببێتەوە .

لە خوێندنەوەی شیعرەکانەوە دەردەکەوێت ئەم مەلا ئەحمەدە پیاوێکی موسوڵمانی راستی لەخوداترس بوەو ، لەگەڵ ئەوەیشدا پیاوێکی ئازاو چاونەترس بوەو ، شتی نابارو نارەوای پێ‌قووبوڵ نەکراوەو ، چاوی لە دیاردەی ناپەسەند نەقووچاندوە . ئەوەتا کە دەبینێ شێخێکی دەست‌بری دین فرۆشی دوور لە رێبازی شەریعەت‌و ، چاوگێرو ، گیرفان‌پرکەر دێتە (بێستان‌سوور)و خەڵك فریو دەدات . . ماموستامان خۆی پێ ناگیرێ‌و ، ئەو رەفتارو کردارەی شێخی پێ قووت ناچێت‌و ، لەو رۆژەدا هیچ دەستەلاتێکی نابێت‌و ، هیچ کارێکی لە دەست نایێت‌و ، تەنها چەکێك کە بە دەستی‌یەوە دەبێت قەڵەمەکەی دەبێت . بۆیە پەنای دەباتە بەرو بیرە تەرو پاراوەکەی لە نووکی قەڵەمەکەیەوە دەتکێتە سەر کاغەزو ئابرووی شێخی پێ دەتکێنێ‌و ، پەردە لە رووی گزیی‌و دەسبریی هەڵ‌دەماڵێ‌و ، شێوەو رەوشت‌و رێبازی شێخی راست بۆ خەڵکی سادە بە زمانێکی سادە - بەلأم تەرو پاراو - روون دەکاتەوەو پارچەیەك شاکاری زیندوو دەکات بە یادگاری ئەو رووداوەو ، پارچە شیعرەکەیشی بۆ ئەوە دەشێ بۆ هەمیشە بکرێت بە سەنگی مەحەکی جیاکردنەوەی شێخی راست‌و خواناس لە شێخی تەڵەکەبازو خەڵك‌فریودەر .

من وای بۆ دەچم ئەم پارچە شیعرە ماوەیەك دەستاو دەست‌و دەماودەمی کردبێت ئەوسا لە جێگەی ئێستەیدا جێگیر بووبێت . بەلأم ئێستە لە شیعرەکان خۆیان زیاتر هیچم بەدەستەوە نی‌یە کە هەندێك لایەنی پێویستی پێ روون بکەمەوە . بۆ ئەم مەبەستەیش زۆرم هەوڵ‌داو گەلێك لەمەو لەوم پرسی ئەنجام بە دەستی خاڵی گەرامەوە . لە بەر ئەوە وام بە باش زانی لەم دەرفەتەدا ئەم ئەندازە بلأوبکەمەوەو ، لە چنگ هەرەشەی لەناوچوونی دەربێنم ، بە هیوای ئەوەی ئەگەر کەسێ شتێکی دەربارە بزانێ روونی بکاتەوەو ئەویش لە عاستی خۆیەوە بەشی خۆی تێ‌بخات .

بۆ ئەوەیش شیعرەکان ، بە گوێرەی توانا ، باش‌و پوخت بنووسرێنەوە ، دوای ئەوەی خۆم چیم پێ‌کرا لەگەڵیان‌کردم‌و نووسیمنەوە . . لە خزمەت ماموستا مەلاکەریم‌و کاك محەمەدی کوریشیدا دووبارە خوێندمنەوەو ، گەلێك یارمەتی‌یان دام . خودا دەست بە تەمەنیانەوە بگرێت‌و وێنەیان زۆر بکات .

## کەلامی مەلا ئەحمەد

هاتە (بۆستان سوور) هاتە (بۆستان سوور)
ماموستا ! شێخێ هاتە (بۆستان سوور)
لە (رۆم) تا (عەجەم) لە خوار تا وەژوور
هەرگیز شێخێ وا ناتە[1] شارەزوور
بنازووم وە صونع پادشای غەفوور
تەمام رووی زەمین پر کەردەن جە نوور
خەڵقی وا دێژن (ئەحمەد) دڵ رەقە
بێ تۆبە دەمرێ جێگەی دۆزەقە
ئیسە وا دڵم ئیخلاصی بوە

تەواو گەیشتگم شەلیقم چوە
حەز ئەکەم ئەتۆیچ دڵت نەرم بویٚ
موخلیصی بوی ، ئاشمشۆت بویٚ
**جەوابی مامۆسا :**
مەلا ! هەرکەسیٚ داناو[٢] فەصیح ویٚ
حاڵی لە مەعنای زێباو[٣] قەبیح ویٚ
کەسیٚ تیٚ نەگا دێژیٚ غەیبەتە
کەسیٚ تیٚ بگا جەزام رەحمەتە
وە کەس نایێژم هەروا باس ئەکەم
باس ئەولیای حەق شوناس ئەکەم
مونکیر سادات پاكنەژاد نیم
تابیع شەیطان ، رەنجوەباد نیم
ئەمجا لەم دنیا هەرکەس راستی وت
هەرکەس عاقڵیٚ وی وێژەی خاسی وت
فەرزە بۆ ئینسان زەکیی و عاقڵیٚ
طەڵەب کا مورشید بیٚ نەقص و کامڵیٚ
ئەر قولاو بدەن لە کاسەی چاوم
شێخ وەلی نەویٚ موخلیصی ناوم
حاکمی دنیایچ تا تەواو نەویٚ
روتبەی حوکمەتی بۆ رێك ناکەویٚ
دەویٚ بەخت و دەرك ، حیلم و ذەکاو خەت
گشت لە لای جەم ویٚ بۆی دەویٚ قودرەت
ئەوسا لایەقە بینیٚیە سەر تەخت
وەرنە کەس نایکا بە حاکمی وەخت
دەویٚ مورشیدیم لە گشت تەواو ویٚ
شارەزای رێگەی خاص و خراو ویٚ
نەك لە هەر عیلم نەخواندە یەك حەرف
وە شۆرەت مورشید وە مەعنا بیٚ صەرف
حساب و عەذاب قەشمەری ناویٚ
تۆبەو طەریقەت سەرسەری ناویٚ

گشت پیاوی دنیا ، گشت گونەهکارین
گشت عاصی و رووزەرد خەجاڵەتبارین
دەویٚ مورشیدمان وەلی کامڵیٚ ویٚ
تا تۆبە قەبوڵیٚ مەقصوود حاصڵیٚ ویٚ
من کوێرو ئەو کوێر ، ئەکەوینە چاڵیٚ
شیشە ئەشکێنین بڕ ناکەین وە ماڵیٚ
کوێر - کوێر ناکێشیٚ بیوا وە رێدا
وە مەطڵەب ناگەن هەر وان لە جێدا
وەك شاباز نەویٚ . . . . . . [٤]
مەلا مەشایخ وەك شاباز نەویٚ
نادیدەی نەناس نەپێکی نە دوور
تەن وە بیٚ ئەرواح نارۆ وە حوضوور
موخلیصی ناوم ، ئاشمشۆی ناکەم
دەویٚ بگەڕێم شێخیٚ پەیدا کەم
* * *
دایم بیٚ باك بۆ ، بیٚخەوف و ئەندێش
وە قووەی باطین عالەم کەرۆ کێش
عولەمای راسیخ فەتوای حساوی
جە لاش نەنیشۆ وێنەی قوتاوی
تەرکی تەکەبور نەکەران تەمام
وێشان بزانان کەمتەر جە گشت عام
موخلیصی ناوم ، ئاشمشۆی ناکەم
دەویٚ بگەڕێم شێخیٚ پەیدا کەم
شێخ مەشغووڵیٚ نەویٚ لە خەڵوەی خۆیدا
(مەردم !) لە خەودا شێت نەکا ، شەیدا
عالم و سەیید شاهیدن بۆ شێخ
بیٚ ئەرواح نەرۆن لە گیان بیٚ درێغ
بۆ تۆبە عالم و سەیید حسێوە
عەوام حەیوانە نایوا وە رێوە
گوناەو صەواب گشت تێکەڵیٚ دەکا

زوبان وه غەیبەت خەڵق چەپەڵ دەکا
خێری خۆی وه زوبان خۆی دەپژێنێ
شەو تەقوا دەکا صوبح دەیرژێنێ
هەر شێخێ طالیب خەڵقێ عەوامە
ئەویش وەك ئەوان ناقیصو خامە
شێخ وەك فریشتە ذەرە پاك نەوێ
پەسەندو مەئذوون شای (لولاك) نەوێ
شیرینی زارش لە دڵدا (مثل)
حەلاوەت نەدا چون مەزەی عەسەل
وێنەی موقناطیس دڵڕوبا نەوێ
پڕعەقڵو پڕفام ، پڕوەفا نەوێ
نەکەرۆ تاراج ئیختیار دڵ
بێ دڵ ئەو نەشۆ مەنزڵ وه مەنزڵ
دنیا پەرستان سەرمەستو مەغروور
بێخەوف لە مەحشەر بێ عەقڵو شوعوور
بە موصاحەبەت ئەوان نەگۆرێ
خوێن لە ریشەی دڵیان بجۆرێ
نەون وه سالیك مەعریفەت تەواو
نەك تەرك فیعل زینای ناحساو
تەحقیق بزانن ، شوعوورتان بوێ
(وەبا)و قەحطی ساڵ لە زینا دەوێ
دووراو دوور وه یاد رابیطەی ئەو شا
مەست نەون وەقتی خەتمەی خانەقا
ئەو شێخە ناقیص ، هیچ تەواو نیە
دەسگیر رێگەی رای صەواو نیە
موخلیصی ناوم ، ئامشۆی ناکەم
دەوێ بگەڕێم شێخێ پەیداکەم

* * *

شێخ وه رەشادێ وەك (حاتەم) نەوێ
شۆرەتی لە رۆم تا عەجەم نەوێ
بێ باك لە ئەوضاع فرەو کەم نەوێ
لە صەرفو ضەرەر دڵ بێغەم نەوێ
وەختی قاتی‌ساڵ لەگەڵ مەخلووقات
وه ئیکرام نەوێ لەگەڵ گشت وڵات.
سەخیو هیممەتدار دڵوافیر نەوێ
نانخۆری لە صەد یەك کەمتر نەوێ
لە رەشیدێ خۆی نەگۆرێ حاڵی
کەمو بێش نەوێ ئەوضاعی ماڵی
خەواص حەدیث (الفقر فخري)
نەزانێ ، نە نازێ بە دەوڵەتگەری
وه حوکم باطین تەمام تێرو پڕ
لە لای کۆ نەوێ لیرەو دانەی دوڕ
هەم موثمیر نەوێ چون طووبای جەننەت
نەیاونۆ وه خەڵق فەیضو بەرەکەت
خانەی وەك خانەی کارخانە نەوێ
کەعبەی طالیبی زەمانە نەوێ
موخلیصی ناوم ، ئامشۆی ناکەم
دەوێ بگەڕێم شێخێ پەیدا کەم

* * *

شێخ وه ئەمری شەرع قاعیدەی وصوول
ناوێ وه ئوستاد عەمەلی مەعقوول
(محضا) بێ ریا پەی خوداو رەسوول
گشت ئەركو میحنەت نەکەرۆ قەبوول
نێكو بەد جە لاش هیچ نەبۆ تەوفیر
نەبۆ وه پەنای هەژارو فەقیر
خۆی قانیع نەوێ وه تەنها نانێ
هەرچی هات وه دەست نەیەژێ : کوانێ؟
بێگانە وه خوێش نزیك نەزانێ
تا عەرصەی مەیدان فەرەس نەرانێ

موخلیصی ناوم ـ ئامشۆی ناکەم
دەویٚ بگەڕێم شێخی پەیدا کەم

* * * *

شێخ (مؤدب)و[٥] وە تەمکین نەویٚ
(قطب العارفين) سەرزەمین نەویٚ
وە رەزای پیران جیٚنشین نەویٚ
لە (پێنج) طەریقەت خۆشەویس نەویٚ
پەسەندو مەقبوولٚ کول مەجلیس نەویٚ
بە وێنەی مەللاح . . .
. . . پەرواز وە هەردوو جەناح
. . . نیگای نەظەر
س وجوودش نەکا وە گەوهەر
. . . . . تیپ سوپایٚ
ب نەکەرۆ هەردەم جە لایٚ
. . .[٦]
. . . نەفسان ئیزرائیل نەویٚ
موخلیصی ناوم ، ئاشۆی ناکەم
دەویٚ بگەڕێم شێخیٚ پەیدا کەم

* * *

قسەی مەشایخ مەعلووم رەواجە
تەمام خاص‌و عام بە شێخ موحتاجە
شێخ موحتاج نیە ، دەویٚ نەگەڕیٚ
دووچاری دەویٚ گشت خێرو شەڕیٚ
نەویٚ وە میهمان گشت مالٚ بیٚ فەڕیٚ
لە هەموو لایٚ سەگ پێی بوەڕیٚ
مالٚی (شبەناك) زۆر تووشی دەویٚ
فەیضی نامێنیٚ ، پەکیٚ ئەکەویٚ
ئەو کەس کە سکەی رەواجی دەکا
نەقدی مەغشووشی بۆ ئیخراج ئەکا
گەڕیان خراپە ـ لایەق پیر نیە
ئەگەر لوقمان بیٚ ، شێتە ، ژیر نیە
پیر خۆی نەگەڕیٚ وە شوێنی دەروێش
ناکا ناغافلٚ نەیکا کەمەندکێش
کەی شاهی مەردان ، یا شێخی گەیلان
فەتوایان داوە بۆ سەیر خێلاٚن ؟ !
ئەو وا ئەزانیٚ زۆر صەواب ئەکا
نەخێر نازانیٚ ـ زۆر خراپ ئەکا !
گەڕیان یانی چون کاك ئەحمەدی شێخ
ریشەی مەعصی‌یەت هۆرکەندش جە بێخ
هەرکەس لە رۆژی ئەزەل طالیب ویٚ
ئەگەر حاضر ویٚ ـ ئەگەر غائیب ویٚ
دیٚ تۆبە ئەکا ، چ لازم سەفەر ؟
نایٚ جەهەنەم (في النار السقر !)
چون سەحرانشین ناشیی‌و ناشەرعە
بیٚ خەبەر جە (روکن) هەم (ئەصل)و (فەرعە)
یەکجار نەك وەك خەلٚق کۆهستان نشین
(أصلا) نازانن وصوولٚ ریٚی دین
دەلٚێن : مەجذووبین ، دەیکەن وە کەلٚەك
ژن دێت وە نێویان دەویٚ رەش‌بەلٚەك
طاعەت بۆ خودا بیٚ ریا نەویٚ
سا خەجالٚەت بن ! چۆن وەها دەویٚ ! ؟
مەلایك صادق طاعەت شوناسن
چون سەنگ مەحەك صەراف خاصن
طاعەت ئەو وەختە کاری تەواوە
لە هەر هەفت ئاسمان ریٚی پیٚ‌گیراوە
دەبیٚ ئاسمانان هەم خوداو رەسوولٚ
لە لای مەلایك تەمام بۆ قەبوولٚ
وەبیٚ وە مەحەك ئیمتیحان کەرۆ
خالٚی جە ریاو غەیبەت‌و درۆ
ئەوسا لایەقی شەئنی خودایە

قەبوولی دەکا چون بێ ریایە
شێخ وە سەیاحەت بچێتە مالآن
فەیض و بەرەکەت بدا بە تالآن
موخلیصی ناوم . ئامشۆی ناکەم
دەوێ بگەڕێم شێخێ پەیدا بکەم

* * *

شێخ عالم نەوێ وە گشت ئەمری شەرع
مەعنای ئەصل و فەرع تەقواو زوهدو وەرع
هەرکەس بنوارێ ئەو وە نامەحرەم
نووری عیرفانیش نە دڵ مبۆ کەم
هەرکەس بنوارێ وە دیدار ژن
ئەویش هیچ نیە ، یەکێکە وەك من !
مەعلوومە سێ‌چار تیکرار نەظەر
زینای تەواوە وە ئایە(٧) خەبەر
مورشید پاك نەکا تائیب لە گوناە
قەمتەری نەکا نەفس رووسیا
موخلیصی ناوم . ئاشۆی ناکەم
دەوێ بگەڕێم شێخێ پەیدا کەم

* * *

شێخ لەت نەکا دڵ نەیکا وە کەواو
تەل‌برژێن نەکا وێنەی باش‌قەصاو
لە هەزار نەفس یا دوو ، یا سێ کەس
هەڵ‌نەوژێرێ وە مەیل و هەوەس
چون هەرچیی و پەرچیی طاعەت نوێنە
ئابرووی مورشیدبەر تۆبەشکێنە
ئەر کەوتە پێوار لە کەس ناترسێ
هەواڵ گاوگۆڵ و کەرەم ئەپرسێ
ئەر خاصیچ بوێ هەر ساڵێ خاصە
ساڵی دوەمین هەر وەك خۆی واسە
هەر چە وە زۆر بێ ئەو بیکا وە کێش

فایدەی نیە ، نابێ وە دەروێش
شێخ نەروا وە رۆح هەر سات لە لاێی
تیر نەوەشێنێ هەر دەم نە جابێ
لە (هیند) تا (عروس) ، لە (شیراز) تا (شام)
مەساف رێی حەق نەکێشێ وە دام
بادەی حەقیقی پێشان نەکا نۆش
یەکجار وەتەنیان نەکەن فەرامۆش
هەرکەس پەرێ وێش جە خەوف مەردەن
دەست نەکەن وە شین وە زاری کەردەن
نەلەرزن وەك بەرخ مافەتە(٨) گرتگ
باوان شێواندن وەك رۆڵە مردگ
نەیان وەستێتۆ وەك حەیوان وە مێخ
دەستی ماچ ناکەم ، پێی نانێژم شێخ
موخلیصی ناوم ، ئامشۆی ناکەم
دەوێ بگەڕێم شێخێ پەیدا کەم

* * * * *

سەیید کاك ئەحمەد سەرچنار نشین
واعیظ و ناصیح قوطبی سەرزەمین
پیری کەرکوك‌شار . شای طاڵەبانی
خەلیفەو وەکیل غەوثی گەیلانی
عوثمانی ثانی شای سیراجەدین
وە رای کول‌دەوڵەت سولەیمان نشین
هیچ‌کام بەرنەدان راگەی حەق جە دەس
هەرگیز نەخستن ئەرك ئەسەر هیچ کەس
لە هەر چوار ئیقلیم مورید ئاوەردەن
داخڵ وە حەلقەی طەریقەت کەردەن
دەروێش ئەو وەختە وە راس دەروێش بۆ
خامۆش و کەم‌خۆر ، ریاضەت‌کێش بۆ
(مدة الحياة) وە جا ئاوەردەن
ئیتر مەیلی فیعل باطیل نەکەردەن

چون وه راست‌کەردەن تەرك فیعل بەد
هەرکەس وه قەد وێش یاوا وه مەقصەد
بەعزێ ناکاملێ وەك (معتزلی)
بە خیلاف ئەڵێن : بووگین بە وەلی
ئەزان خیلافتر جە کەس نەشنەفتە
وه رای شەریعەت یەك یا نە رەفتە
نابەڵەد نە دەشت ئەطوار هەفتە
ئەسباب ئیرشاد هیچ رێك نەکەفتە
دێن ئیرشاد دەکەن وەهەواوهەوەس
دەیکەن وه ئیرشاد هۆز (فلانکەس !)
ناوگیرم نەکرد نەك بێ وه غەیبەت
ئەمما نووسیومە پەرێ نەصیحەت
تەرکی حوبب‌و مەیل دنیا نەکەردە
تەقواو ریاضەت وه جا ناوەردە
وێت لادەر جە فیعل دنیای کەچ حەساو
هەوای نەفسانی ، سەیر تاجی‌و راو
ئەمانە ضیددن لە گەڵ طەریقەت
پێکەوە ناوێ هەواو بەرەکەت
ئەوان گشت بێباك لە رۆژ مەحشەر
راغیب گوناه گوروێ بێ خەبەر
بێگانە جە ئەمر خوداو پێغەمەر
بێ خەوف لە میحنەت جە رۆژ مەحشەر
ناشی‌و نابەڵەد وتیان : مورشیدین
وه روتبەی مەقام وەك بایەزیدین
خەلیفەو وەکیل (غوث الأعظم)ین
لە حەشرو حەساو تەواو بێ غەمین
زانیان مەخلووق جە قاف تا وه قاف
خۆش باوەڕ نیە کەس وەك عێلی (جاف)
دەروێش من ونو ، من پیرتانم
لە رۆژ حەشرا دەسگیرتانم

هەر ریشتان بوێ صاحیب ئیخلاصن
ئیتر مەترسن ئێمە بناسن
لە جیاتی ئاداب تۆبەو تەڵقینیان
رەوان ئەرکان ئیمان‌و دینیان
وێتان هەر بێژن : (یاهو یا علی)
لە پاشی دوو ساڵ دەبن بە وەلی
ئەو خەوف‌و غەفڵەت ، ئەو وێڵ‌و رەفتار
ئەو شورب‌و خۆراك ، ئەو قسەو گوفتار
هیچ نەگۆڕیاگە هەروا باقی‌یە
چاو بۆ نەظەر . . . قی‌یە
شکات چی شکات پاکا . . .
خاصان بیر و خە . . .
بووگە لەم دنیا دەروێش بگرێ
بێژێ چاو بازە . . . ؟ !
زوان زو . . .
دیو خە . . . . . .
دز
(طوعاوکرها) جار جار
دەچن وه مەسجید وەك کولە قف (٩)

## پەراوێزەکان

(١) - ناتە : نەهاتە .
(٢) - لە دەسخەتەکەدا (دانا) بو (و)کەم بە پێویست زانی‌و بۆم دانا .
(٣) - (زێباو) : (زێبای) بوو بەلامەوە هەڵە بوو چاکم کرد .
(٤) - لێرەوە وەك پارچەیەکی نوێ دەست پێ‌دەکات‌و ، دەچێتە سەر شێوەی (تەرجیع بەند) ، بەڵام هەر لە سەر هەمان باس‌و بابەتی پێشووە .
(٥) - لێرەدا (نەوی)ێك هەبوو بە زیادمان زانی‌و لامانبرد .
(٦) - ئەو شوێنانەی خاڵم تێدا داناون دڕاون‌و مشك خواردوونی .
(٧) - (وە ئایە) رەنگە هەڵەی نووسەری دەسخەتەکە بێت‌و ، لە جێگەی خویدا (وەهایە) بووبێت ، چونکە ئایەتێك بەم ماناو مەبەستە لە قورئانی پیرۆزدا نی‌یە .
(٨) - (مافەتە) جۆرە نەخۆشی‌یەکی ئاژەڵە .
(٩) - لێرەدا دەسخەتەکە لێی کەوتووە ، نازانرێ چەندەی لێ لەناوچووە ، شیعرەکان بە ناتەواوی ماونەوە . سەرەتای لاپەڕەی داهاتوو - کە کەوتوە - بە (سرم) نیشانەی بۆ دانراوە .

# کۆچەری

نورالدین أنور بۆتانی



ئەم کۆچەر بوون ، خوەدی پەز وسەوال بوون ، لزۆزانا دەما دبە زڤستان ، دنیا قڕ وپوك وسار دبە .

لەورا بەرفێ گەلی ودەربەند ونهالان دادگرە وڕویێ قادێ ژی مینا فەرشەك سپی . . . سپی دمینە .

مرۆڤ بزۆر هەو کاری ژیانا خوە لور دەرباز بکی ، لێ تێ چاوان ولکو چێری بێ ژپەز وسەواڵێن خوەرا ببینی ؟ .

بێ گۆمانە ، مە نکار بوو ، لەورا هەر ساڵ ددەستپێکا زڤستانێ‌دە ، ئەمێ کۆنێ خوە ڕاکن وبەر بدەشتێڤە وەرن .

لور ئەم دمینن حەیا ببوهاردە ، جار دن ئەمێ ڕابن بەر بزۆزاناڤە هەڕن . ئەگەر تو ژی دزڤستانێ‌دە ، وەری ڤێ دەشتێ هان ، تێ هن ڕێزێن کۆن وڕەشمالان ، کەرێن پەزان ، جۆڵێن بەرخان ، ڕەڤێن قانتر ومەهێن وکەران ببینی .

هەر سال ژی دوو – سێ جاران ئەم خوە ببازاراندە

ـگهێنن وداهاتێن خوه دبن وئالوێریا خوه لـور دکن .
جارنا ژی چەرچی هەنە دنێڤ زۆمان دگەڕن وداهاتێن مە دستینن ودبن بازاران .
لێ دڤا بوو هەر سال ئەم بچوونا بازاران ، قە نە مە بێ ینـڤیێن مال وزاروکێن خوه بستاندا . ئیسال ژی مە کارێ خوه کر وئەمێ بچوونا زۆزانا .
مالا مە لـهەرێ داوی‌یێ زۆمێ دمەشیا ، دەم بەر دەستێ ئێڤار ، ئەم لـڕوبارەك بۆش وپڕ ئاڤ دەرباز بوون . .
ئەم گهانە قونتارا چیاکی بلند ودژوار وئاسێ . لـور دڤا بوو ئەم بەروار دویێ چیایێ دژوار وئاسی‌ێ‌دە دەرباز بن ، لەوڕا ڕیا مە دسەر وێ چیی‌یێ‌دە دەرباز دبوو .
(بازۆ) . . ژ (زەلخێ) . . دایکا خوەڕا گۆت :
داوۆ . . قە بێژە باڤێ من ، بەرە ئەم لـڤر هێورین . حەیا بـسوبێ‌دە ئەم لـڤ چیای دەرباز بن ، نێ دنیا تاری‌یە ونە تاڤە هەیڤە . . .
وەلەهـ . . ئەمێ شەڤ ڕێ ووندا بکن ودچی‌یێ‌دە بمینن .
(زەلخێ) . داخوازا (بازۆ) ژمن‌ڕا ڤەگەڕاند ومن ژی قەبوول کر .
مە بارێن دەڤا لـور دانی وئەو بەرادان بـچەرن ، گەیا لـور زنو ژاڤێن دبوو ئو تێرا شەڤ چێریا پەز وسەووالان هەبوو .
ئەز لـسەر کەڤرەکی ڕوونشتم ومن لـئاسمانێ تەماشا کر ، ئاسمان ساهی بوو ، تنێ ڕەڤێن قاز وقولنگان ، بـگازی وقێڕین دهات ودەرباز دبوو .
لـئالیکێ ڤە ، دەنگێ گرییێ زاروکان ، بارینا بزن ومێشنان ، کارینا بەرخ وکاران .
لـئالیکێ دن ژی ، قەب قەبا کەوان ، ئاوازا شالوول وبلبلان ، چوك چوکا چووك وچفیکان ، خوەش دهات وتەڤلی هەڤ دبوون .
مرۆڤ دویێ ناڤی‌ێ‌دە ، دکەتە هزرەکا کوور کوور ، تە دگۆ قەی تو بێ دجیهانەکا ئەفسۆن کاردا دژی .

ئیجار من هەو لـسەرێ چیا نێری .
من دی پەیایەك ژێردا تێ . من دێنا خوە دایێ کو کەرەك بارکری ژی لـدوو دمەشە . من دەنگ لـ (زەلخێ) کر .
زەلخێ . . . . زەلخێ . . . .
(زەلخێ) گۆ : های لەبێ .
کارێ خوه بکە . وێ . . . . ئەها پەیایەك ژێردا تێ . ئەو دێ ئیشەڤ مێڤان لـبا مە بمینە .
(زەلخێ) گۆ : . . . (حاجۆ) . . مێڤان سەر سەرا وسەر چاڤان ، بەرە بێ .
پەیا زەلامکی ڕاپێچایی بوو . بـتەخمین عەمرێ وی لـدۆر پینجیان دابوو . چاکیتەك فرەهـ ئو مەزن دگەل شەلوالەك پینە کری دبەر دا بوو ، قاما وی کنك . سەر ورەهـ سپی ، بـدەستەکێ هەڤساری کەری لـدوو خوە دکێشا وبـدەستێ دن ژی گۆپالەك کنێری کورت وستوور ددا بەر خوە ، هێدی . . . هێدی . . پشت خوز دمەشیا ونێزیکی لـمە دکر .
ئیدی گها مە وسلاڤ دا .
مە سلاڤا وی ڕاگرت .
من گۆ : ئاپۆ قەووەت بە .
گۆ : ڕەحمە لـدێ وباڤێ تە بە .
من گۆ : ئاپۆ ، تو لـکو تێ وبـکودا دچی بـڤێ ئێڤاریا بەر تەنگ ؟ .
گۆ : برازێ ، چیرۆکا من دوور ودرێژە ، ئەز نکارم نها ژتەڕا ڤال بکم .
من گۆ : دە کەرەمکە ڕوونە وئیشەڤ لـبرازی‌یێ خوه مێڤان بە ؟ .
گۆ : گەلەك مەمنون ، دڤێ ئەز هەڕم وزوو بگهێژم مال ، نها زارۆ لـمال چاڤ لـڕێ‌نە لـهێڤیا من .
من گۆ : ئێ دەرەنگە ! . . تێ چاوان هەرێ ، نێ تو ناگهێژی چ دەرێن ئاڤا ! . .
گۆ : وەلە . . تو ڕاست دبێژی ، لێ ئەز چاوا بکم ؟

قه نه جەنتكەك بچووك تژى باقسمات ب‌منرا هەيە .
ئاخر . . كر . . . نەكر . . . من نەهشت ئەو دەرباز بە .
(بازۆ) . زوو هەڤسارێ كەرى ژێ وەرگرت وبارێ وى داگرت .
دنيا . . . بەره بەره تارى دبوو ، ئيدى ئەو دەنگ وئاوازێن دهاتن ژى ووندا دبوو .
(زەلخێ) چراكێ مه ئانى وڤێخست .
پشتى مه شيڤا خوه خوار ، من كيسكا خوه درێژى ئاپۆ كر .
ئاپۆ جگارا خوه پێچا وڤێخست ، چەند هلم لێدا وگۆ :
وەله برازێ تتونا ته خوەشه ، گەلۆ ته لكو ئانى‌يه ؟
من گۆ : ئاپۆ ئەڤ تتونا زۆزانايه .
زۆزان . . ئى‌ى هى‌ى زۆزان .
وەله زۆزان خوەشن ! . .
لێ هون چما زڤستانا ژى لور نامينن ؟ .
من رەوش وپەرگالا زۆزانا ژئاپۆرا ڤال كر وئەو ژى رند ڤالا من فام كر .
ڤێجه من ژێ پرسى كو چيرۆكا خوه ژمەر بێژى :—
ئاپۆ دەست بچيرۆكا خوه كر وگۆت :
ژبەرى چەند سالان ، دەما ئەز زارۆك بووم ، مه ژيانا خوه لگوندەكى خوەش وئاڤا ، ب‌داهات وهەبوون ، دەرباز دكر .
لێ خودێ قەدەرا مه ووسا ئانى كو ئەم لوى گوندى باركن وبچن بازار .
نها مالا من لوێ بازارێ سەر خەتێ‌يه .
حەيا ب‌دەهـ سالێن بورى دا ژى ئەز پالەكى ب‌هێز وخورت بووم .
ژسوبێ حەيا ب‌ئێڤار دا ، مه ژمالدار وبەر خوەدارانرا كار دكر ، تنێ ئابورا رۆژان ددان مه ، مينەكا رۆژێن بورى ، رۆژێن رەش وگران ، وەكە نها تێ بەر چاڤێ من .
لێ پيريتى گها من ونەما ئيدى ب‌كارم وەكە بەرێ كار بكم ! .
من هزر كر ، گەلۆ ئەز چ بكم ؟ . دڤێ كارەكى بكم وزارۆكێن خوه خوەدى كم .
ئەز رابووم ، دوورى كەرەما حازران ، من ئەڤ كەر ژخزمەكى گوندى خواست .
ئيدى هەرسال چەند جاران ، ئەز كەرێ خوه بار دكم ولوان گوندێن هاوير دۆر دگەرم . . . .
(بازۆ) . ئاخافتنا وى برى وگۆ :—
ما گەلۆ بارێ ته چنه ؟ .
گۆ : لاوۆ . . بارێ من ژهن تشتا تژى‌يه ، ژبيرەكانرا تێدا هەيه ، بازنێ زەندان ، تۆقێ بسكان ، شەهێ پۆر وپەرچەمان .
ئو ژزەلامانرا ، پاكيته وشخاته ، پەرێن جگارا .
ژزارۆكانرا ، گەبۆل وچووكولێته .
ژبل پێدڤێن گشكى مينا سابون ودەزى ودەرزيك وهن تشتێن دن ژى .
ئەز ڤان تشتا تينم ، ب‌هێك دفرۆشم ووان هێكا ژى دبم بازار ب‌پەره دگهۆرم
(زەلخێ) گۆ : باشه ، ته نها ئالوێريا خوه كرى‌يه ، يان نەء . . . ؟ .
نا وەله . . كەچا من . . ما ئەز لكو ئالوێريا خوه بكم ؟ .
سالا پار چەند گوندێن ئاڤا لپشت ڤى چياى ولهێلا هان هەبوون ، ئەز هاتبووم وان گوندان .
لێ ئيرۆ دبينم كو ئەو تەڤ نەمانه ! . . . . هن ژوانا خوه ب‌بازارۆكانده گهاندنه وپرێن وان ژى بوونه كۆچەر وچوونه زۆزانا .
وێ رۆژى ئەم مان حەيا ب‌دەرەنگى شەڤ‌دە ، مه ڤالا دنيايێ دكر ، سوبێ زوو ئەم رابوون ، مه بارێ خوه وبارێ ئاپۆ باركر ، ئاپۆ لبەر دەستوور خواستنێ بوو ، دەما دەنگێ گازينا ديكەكێ هاته گوهێ مه گشان .

# کاروانی

تیلی صالح موسی
دهوك

پێ راوەستایە ل‌بەر دەرازینکا خانی . . هەڤساریێ هێستریێ پێ د دەستیدا . . جووتەکێ سەڤیا پێ هاڤێتیە سەر پشتا هێستریێ . . وەکی تەرمەکی ، ناڤبارکەکا رازاندیە سەر . . وەریسەکێ ل‌دوور ئالاندی ، لبن زکێ هێستریێ پێ شداندی . . .

– نزا من چ ژبیرنەکر ؟ !

پێ د پاخلێد خو دخەتبیت . . گەلەکێ ب‌لەزە ، ئەڤ ئاخڤتنە گوتن !

«ئەڤە من کرە درەنگ نەوەك هەڤالێد من ئەز هێلایم دابچم .»

زاروکێد وی هەمی پێ ژ خەو رابووین . . پێ ل‌دوور دزڤرن ، هەرئێکێ داخازەکێ ژێ دکەت ، دەمێ ڤەدگەریت دا بو دگەل خو بینت ، هندەك پێ داخازا شەکروکا دکەن‌و هندەك پێ دبێژنێ بو مە قەسپا بینە . . .

خاترا خو ژ زاروکێد خوو دەیکا وان خواست . . سەرنشیف ب کولانێدا چوو خوار . . سەرێ هەڤساری پێ د دەستیدا پێ ل‌بەراهیا هێستریێ دچیت . . .

هەمی ل نهێلا بن گوندی گەهشتنە ئێك ، هەر ئێکی ژوان بارەکێ تری پێ داگرتی‌و پێ دانایە سەر پشتا دەوارەکی . . دێ چنە کاروانی .

پشتی گەلەك وەستیاین‌و قویناغەکا درێژ بری . گەهشتنە گوندەکێ دەشتێ . . ل گوندی بوونە مێڤان . روژا پاشتر ژێك بژالەبوون هەر هندەك چوونە گوندەکێ نزیکی وی گوندی . دەست ب فروتنا تری کر . . هەمیا تریێ خو گوهارت ب گەنم‌و ساڤاری . . بارێد خو بارکرن . . جارەکا دی هەمی گەهشتنە ئێك ل ئەوی گوندێ پێشیێ گەهشتنێ . . . هندەك شەکرك‌و رزیانك بو زاروکێد خو کرین ، بەرەڤ گوندێ خو کەڤتنە رێ . کەیفا وان گەلەکا خوشە ، هەمیا بازاریێ خو پێ ب دلێ خو کری ، پێ بەحسێ دەوریێ بەرێ دکەن ، هندەك پێ چیروك‌و سەرهاتیا دبێژن‌و بەحسێ کاروانێد بەرێ دکەن . . هند پێ ب ئاخڤتنێ ڤە دمژویلن پێ بەحسێ بازاریێ خو دکەن .

پشتی هەیامەکێ ب رێ چووین لێ بوو شەڤ ، شەڤێ رێکا وان نەگرت ، بوو درەنگی شەڤ ، دەنگێ گەناورا ل وان ئاڤارا مشەبوو . . گەلی‌و نەهال پێ دەنگ‌ڤەددەن . .

دەوارێد وان پێ دهلنگڤن . . ڤەدجنقن . هندەك پێ ل بەراهی‌یا دەوارا دچن . . هند پێ ل‌دویڤ دچن . دەلیڤەکێ نخافلەتی‌ڤە دەنگەك هاتە گوهێد وان . شەڤ رەش شلقاند . . دەنگ‌ڤەداو تیژتر هاتە گوهێد وان :

– راوەستن ! . . هوین چ کەسن ؟

کاروانی رەق راوەستان . دەوارێد خو راوەستاندن نەزانی دێ چ بێژن . . زانی ئەڤە رێگرن‌و دڤێن کاروانی بشەلینن . .

جارەکا دی شلقەك ڤ بێ‌دەنگی‌یێ کەت‌و ئەو دەنگ دوبارەبوو . . .

– هوین کی‌نە !؟؟ . . هوین ژ کیڤە تێن ! ؟ کاروانی‌یا ب ترسڤە بەرسڤا وان‌دا :

– برا هەوە چ ژ مە دڤێت ؟ . ئەم کاروانی‌نە . ئەم رێڤنگین .

خویکێ بینن . .

– خویکا چ ! ئەم هەژارین مە چ نی‌نەو مە چ دگەل کەسێ نی‌نە . . ئەم رێبوارین . کاروانی‌نە خویکێ ژ کیڤە بینین ؟ ! ئەم چ خویکا نادەین ! . . .

بو پرەڤێنا تڤەنگا ژ هەردوو لا . . دەنگێ شەری گەرم‌بوو . . دەوار بژالەبوون .

ناڤبەینەکێ دەنگێ عەلوی هات . . قێری ژێ بلند بوون . . ئەوان چیا بەرسڤا وی دا . قێری‌یا وی جارەکا دی زڤراندە گوها :

– ئای بابو ئەز کوشتم !

پشتی شەر ڤەمریای . کاروانی‌یا تەرمێ عەلوی دانا سەر پشتا هێسترا وی . . بەرەڤ گوندی کەتنە رێ . . .

پشتی نێزیکی گوندی بووین . زاروك هاتن بەراهیا کاروانی . لێ زاروکێد عەلوی دیت شوینا ئەوێ ناڤبارکا لسەر پشتا هێسترێ د ناڤبەرا هەردوو سەڤی‌یادا . بابێ وان یێ درێژکری‌یە دناڤ هندەك هەژێد چلی‌را لسەر پشتا هێسترێ ! ! !



چیرۆکی : خسرو شاهانی

وەرگێرانی سعید یحیی

یەکێ لە سەرگەرمی‌و خۆخافلاندنی شارنشینەکان . نامە بۆ دۆست‌و ئاشنا نووسینە . . لەو نامانەدا . چ دووربن وچ نزیك . دەردە دڵی خۆیان‌و سەربردەی خزم‌و ناسیاوو دەنگوباسی شار دەنووسن .

ئەو شارەی تیایدا دەژیام . شارێکی بە «با» بوو . کە دەڵێم «با» واتی‌نەگەن باسی شنەوشەماڵ‌و ئەو بایەتان بۆ دەکەم کە لەماوەی مانگێکدا دوو سێ جار هەڵدەکا !

وەك هەموو شارەکانی دیکەی ئەم وولاتە . کە هەریەکەو بەشتێ ناوی دەرکردووەو شوورەتەکەی پێوەندی بە بەرهەمێکی

ـەرەکی‌یەوە هەیە ، وەك : شارە خێروبەرەکەت ، ـرەنوت ، شارەزێر ، شارەمەلا . . شارەکەی ئێمەش شارەبا» بوو . هەر لەبەرەبەری بەیانەوە ، لە باکوورەوە بۆ ـشوور رەشەبای هەڵدەکرد ، پاش نیوەڕۆیش بەپێچەوانە لە ـشوورەوە بۆ باکوور دەگۆڕاو دیاریی سەیروعەجایەبی لەگەڵ خۆیدا دەهێناو شەقامو کووچەو کۆڵانی پیس‌و چەپەڵ دەکرد .

دوانزە مانگی ساڵ ، ئەو بایە لەعنەتی‌یە ، کە هەر لەبای سەرسەر»ی دەکرد . میوانی شارەکەمان بوو . بێگومان شار لە خاكو گەردەلوول‌و خۆڵ بترازێ ، ئەوەی دەرامەتە نەی‌بوو . .

بە قودرەتی خالیق تەنانەت گیاوگۆڵیش لە باخچەکاندا نەدەروان ، تا درەختی گوڵ یا سەوزە . جا ژیانو گوزەران لە شارێکی وادا ، نەك هەر سەختە ، بگرە عەزابێکە بۆ خۆی !

شەوێکیان کە ئەوەی زەوق‌و حەوسەڵەبێ ، لەچنگ بای لەعنەتی‌یەوە نەمابوو ، بەغەیری لە ماڵ روونشتن‌و دەرگە گاڵەدان‌و پەنجەرە داخستن ، ئەوەی کاریش بێ ڕێگەم پێ نەدەبرد . . بۆی دانیشتم‌و دەستم کردە نامە نووسین . یەکێ لەو نامانە بۆ کۆنە دۆستێکم بوو ، کە لە پایتەختدا دەژیا .

نامەم بەدوعاو سلاوو ئەحواڵپرسین دەست‌پی‌کرد . . ئینجا هاتمە سەرباسی شارو نووسیم کە ژیانی شارێکی وا بابردوو نەسیبی گورگی کێویش نەبێ ! دارو دیوار یەکپارچە گەردو خۆڵن‌و ئەم بایە نەگبەتە ماوەی کەس نادا چاو بکاتەوەو شت‌ببینێ ، یا دەم بکاتەوەو شتێ بڵێ !

نامەم خستە زەرفەوەو گەیاندمە سنووقی پۆستە . . دووای چەند رۆژێ ، کە هەر وەك جاری جاران ، لەترسی «با» خۆم لە ژوورەکەمدا قایم کردبوو ، برادەرێکم لێ میوان‌بوو . . لەدەم وچاوو قیافەی نارێك‌و سەخڵەت ، پەشۆکاییم بەدی کرد .

لەدڵی خۆمدا گوتم ، رەنگە ئەویش بەندە ئاسایی لە «با» بێزاربێ ! بەلام هەر ئەوەندەو دانیشت ، ئیدی بە دەنگی پڕ گازاندەو گلەیی لی‌کردن ، گوتی :

— لە حەیاتی خۆم ، پیاوێکی وەکو تۆم نەدیوە !

— بۆ ؟

— بۆ ؟ بێ‌باك و دەست لەگونان درێژتر دانیشتووی‌و دەرگاو پەنجەرەت داخستوون ، نازانی لە دەرەوە چ باسە !

گوتم ، پێت‌وایە بەم تۆفانو رەشەبای‌وا ، لەچەقی ڕێگەدا دەوەستم‌و (با)هەڵدەمژم ؟

سەرێکی بادا وگوتی :

— ئەگەر دەتزانی چ رووی داوە ، باهەڵمژین زەلاتە بوو !

حەشتەبای لێ حاڵی نەبووم . گوتم : چایەکەت بۆ دەم بکەم ؟

وەك بەرووی نێو ئاگردان تەقیەوەو هەڵسایە سەرپێ‌و گوتی :

— چای سەرت بخوا ! کوری باش هەڵسە بیر لەحاڵی خۆت بکەرەوە !

— چی‌بکەم ؟ پێت دەڵێم چای دەخوێتەوە ، وەك پیاو بڵێ‌نا ! ئەمجارە نێوچەوانی گرژکردو هاواری لێ هەڵسا :

— ئیدی رەفاقەتیت ناکەم . . سەد جارم پی‌گوتی ئاگاداری زمانت بە . . ئەوەندە چەنەلی‌مەدە . . شتی قۆر مەنووسە . .

هەڵسە بابرۆین بزانە چ فەرتەنەیەکت لەم شارەدا ناوەتەوە !

— من ؟

— نەخێر من !

دڵم کەوتە هەژان . . کابرا شتێکی پی‌یە . . ئەگینا لە ختوخۆرایی بۆوادەکا ؟ ئێ خۆ من هیچم نەکردووە . . لە

کونجی ژوورەکەمداموو دەرگاو پەنجەرەیشم داخستوون . .
گوتم :
— بۆچی بووە ؟
گوتی : نەخێر هیچ نەبووە ، دەتەوێ چ بێ ؟
داروودەستەی جەنابی قایمەقام بەشەقامەکانی شاردا بڵاوبوونەتەوەو مەزبەتت لە دژ ئامادە دەکەن وئیمزای کاسبکاران کۆ دەکەنەوە . .
— لە دژی من ؟
— بەڵێ دژی جەنابتان
— بۆ چیم کردووە ؟
— بەخۆت بڵێ . . بەزمان درێژێکی وەکو تۆچی ، ئەم شارە بای هەیە یانا ؟ شەقامو دەرو دیوارپیسن پیس‌نین بەتۆچی ؟
قسەکانی دەیانکا ، بەگوێم ئاشنان . . یانی‌چی ؟ ئەمەم لەکوێ گوێ لێبووە ؟ کەێ ؟ لەکوێم خوێندووتەوە ؟
گوتم :
— مەزبەتەکە لەسەر چی‌یە ؟
— مەزبەتەکە دەپازدە میتر درێژەو خەڵکەکە ئیمزای لەسەر دەکەن ، کە شارەکەی ئێمە ئەسڵەن بای نیەو لەسایەی لوتفو مەرحەمەتی جەنابی قایمەقامو شارەوانو سەرۆك دایەرەکانەوە ، شارێکی نموونەیەو لە پاكوخاوێنی‌دا هاوتای نیە . ئەوکەسەی بڵێ بای هەیە یا پیسە ، ئەوە خائینەو داوا لەکاربەدەستان دەکەین بیدەنە دادگاو سزا بدرێ .
گوتم :
— داوا لە کاربەدەستان دەکەن ؟
— بەڵێ داوای سزادانی جەنابت دەکەن
— خەڵکەکەیش ئیمزادەکەن ؟
— ئەی چی‌بکەن ؟ چاریان ناچارە . . من خۆشم ئیمزام کردووە !
سەرم خستە نێو هەردوو دەستەکانم . . کەوتمە دەریای خەیاڵەوە :
«دەبێ‌چیم‌کردبێ ؟ بۆ مەزبەتەم لەدژ دەکەن ؟»
برادەرەکەم هەڵسایە سەرپێ‌و گوتی :
— لەم رۆژانەدا هیچت گوتوە ؟
گوتم :
— بۆچی با مۆڵەتی پیاو دەدا دەم بکاتەوە ؟
گوتی :
— بەم زووانە نامەت بۆکەس رەوانە کردووە ؟
گوتم : خۆت دەزانی من نامە لە دۆستان نابڕم . . پاشان نامە چ پێوەندی بەم مەسەلەیەوە هەیە ؟
گوتی :
— لەو نامەیەدا هیچت لەبارەی شارەوە نووسیوە ؟
گوتم : لەیەکێکیاندا . . بەڵێ . .
گوتی :
— کەواتە خۆیەتی . . کابرا ، تۆ بۆ دەڵێی شارەکەمان بای هەیەو پاكو خاوێن نیە ؟
— باشە نامە نووسین وگلەیی من لەبا ، چ پێوەندی‌یەکیان بەشکاتەوە هەیە ؟ من نامەم بۆ برادەرێکم نووسیوە !
— ئەوانیش کاریان بەو نامەیەی تۆوە هەیە . . نامە کەوتۆتە دەست کاربەدەستانو لەپارێزگاوە بەنووسراوێکی توندوتیژەوە بۆ قایمەقام رەوانە کراوەو داوای لێکۆڵینەوەو روونکردنەوەیان کردووە . . ئێستا زانیت بۆ مەزبەتت لەسەر دەکەن ؟
لە داخان ئاگرم بەردایە جگەرەیەك وگوتم :
— بەرای تۆچی بکەم باشە ؟
— هیچ بەمن مەڵێ . . من هیچ نازانم . : خۆت چۆنی بەباش دەزانی وابکە . قایمەقامو تەواوی لێپرسراوانی شار لێت توورەن‌و خوێنیان حەلاڵ کردووی !
ئایەت‌و کورسی‌یەکم خوێند . . گوتم : جا ئەوە بای هات . . پیاو دەبێ بڵێ بای نایە ؟
گوتی :
— ئا بەڵێ . . بۆچی خەڵکی دیکە زمانیان نیە ؟

سبەینەی رۆژی دوواتر ، دوو کەسیان رەوانەکردو بردمیانە
...ی قایمەقام . خۆی لەپشت مێزێك دانیشتبوو ، لە
...کەوەیش جەنابی لێپرسراوی دادو لێپرسراوی دارایی و
...تنبیری و ئاسایش و پۆستەوتەلگراف . . لێپرسراوانی دیکەیش
...کەمێ دوورتر لەوانەوەو چەند کەسانێکی بەرێزی شاریش
...وی تەماشاچی ، بەشداری‌یان کردووە .

بەئیشارەتی دەستی جەنابی قایمەقام ، تا بەردەم مێزەکەیان چوومە پێشەوە . . کابرا دیقەتێکی دام وپاشان تەماشای یەکەیەکەی لێپرسراوانی کرد . هۆڵ کش وماتەو کەس نقەی لێوە ...یە . قایمەقام کاغەزێکی لەچەکمچەی مێزەکەیەوە دەرهێناو ئەمری کرد :

– ئەم نامەیە بەدەنگی بەرز بخوێنەوە !

خەت خەتی خۆمەو دەیناسمەوە . . هەمان نامەیە ، بەر لە مانگێکەوە بۆ دۆستەکەم رەوانەکردبوو . . چۆن کەوتە دەست قایمەقام ؟ نازانم !

دەستم بەنامە خوێندنەوە کرد ، تا گەیشتمە ئەوەی «ژیان لە شارێکی وادا نەسیبی گورگیش نەبێ . . دارودیوار یەکپارچە تۆزاوی و نەگبەتی دەبارێ . . ئەم بایە لەعنەتی‌یە ، نەدەهێڵێ هیچ ببینین و هیچ بڵێین» ، کە لە ناکاو جەنابی قایمەقام وەك شێر نەراندنی : سەگی سەگ باوك ، ئەمەکێ بوو ، وا بەدەنگی بەرز نامەی خوێندەوە ؟

عەرزم کرد : من بووم

– ئەی بۆچی نووسیوتە ، لەم شارەدا کەس دەم ناکاتەوە قسە بکا ؟

– بەڵێ قوربان

– چی ، بەڵێ قوربان ؟ ئەم جەنابانەی وا لێرەدا دانیشتوون دەیانبینی ؟

– بەڵێ قوربان

– خەڵکی شار کەلەولای هۆڵ دانیشتوون دەیانبینی ؟

– بەڵێ قوربان

– ئەی بۆچی نووسیوتە : لەم شارەکەدا کەس هیچ نابینێ ؟

– بەڵێ قوربان

– وەلاّمم بدەرەوە !

– قوربان تێ‌نەگەیشتم

– ئێرە بای هەیە ؟

– نەخێر قوربان . . بەلاّم . .

– بەلاّم چی ؟

لە پەنجەرەوە تەماشای دەرەوەم کرد . . رەشەبایەکە مەپرسە . . لە گەردو خۆڵ بترازێ هیچ دیارنیە . ویستم بڵێم : لێرەنا ، بەلاّم لەوێ ئا . . کە لەناکاو چاوم بەچاوی لێپرسراوی (داد) کەوت . . یارۆ لە توورەیی‌یان داوەکانی سمێڵی دەجاوی .

– بڵێ . . بەلاّم چی ؟

– بەلاّم هیچ قوربان . .

– بای هەیە ؟

– نەخێر قوربان

– ئەی بۆ نووسیوتە با هەیە ؟

– تێ‌نەگەیشتووبووم قوربان . . لەوە زیاتر هیچم نەبوو بنووسم !

– کەهیچت نەبێ بنووسێ ، دەبێ باسی ئێمەبکەی ؟ هەرچی بۆ ئەم شارەمان کردووە هەمووی بسڕیەوە ؟

– قوربان ئەمجارە ببەخشن . . ئیدی نامە چیە نانووسم . .

– چی‌چی . . ببەخشین . . ئێمەت ڕسواکرد ، کاربەدەستانی بەرزت مەشغوول‌کرد ، سومعەی شارەکەت برد ، کەچی داوای بەخشین دەکەی ؟

– بەڵێ قوربان

قایمەقام ملی کورت و گۆشتنی وەرگێڕاو دیقەتی نەخشەی هەڵواسراوی بان‌سەری کردو گوتی :

– ئەم نەخشەیە دەبینی ؟

– بەڵێ قوربان

– نەخشەی کوێیە ؟
– وابزانم هی شارەکەی خۆمانە
– تەماشای چواردەوری نەخشەکە بکە . . چ دەبینی ؟
– وێنەی درەخت وسەوزەی لێکێشراوە . .
– دەزانی ئەمانە چن ؟
– نەخێر قوربان . . چوزانم
– ئەمانە ئەو دارستانە دەسکردانن کە لەبەر دەستن وبریارە دەورو بەری شار بپۆشن وبەری «با» بگرن . . تێگەیشتی ؟
– بەڵێ قوربان . . تێگەیشتم
– کەتێگەیشتی . ئەم نامەیەت بۆ نووسی ؟
– قوربان ئەوە بەر لە تێگەیشتنبوو . .
قایمەقام قەڵەمێکی لەبان مێزەکە هەڵگرتو دایە دەستمو کاغەزێکی بۆ رەوانەکردمو گوتی :
– ئەوەی دەیڵێم ، بیانووسە . .
– بەسەرچاو قوربان
– بنووسە . . شارەکەمان لەئەنجامی کۆششو هەوڵی بەردەوامی جەنابی قایمەقامو جەنابی شارەوانو لێپرسراوە بەرێزەکانی دیکەی شار ، پاکترین شاری سەر رووی زەمینە . . بنووسە . . لێرەدا نەك تەنها (با)نیە بگرە لەسایەی جموجۆڵی کاربەدەستانی ناوم بردنو لەبەر دارستانی هەمە جۆرو تۆنێڵە خوارخێچەکان ، چەند ساڵ دەبێ . با رووی خۆی وەرگێراوەتە بیابانو لەشارەکەماندا لەشنە بای بەهاران بترازێ هیچی تر هەڵناکا . . نووسیت ؟
– بەڵێ قوربان
– ئیمزای بکە
– بەسەرچاو قوربان
– ئێستاش لە حزوور ئەم بەرێزانەو لەحزوور دانیشتووانی شاردا ، بەدەنگی بەرز بڵێ : بمرێ با
– بمرێ با
– بڵێ . . مردن بۆ خائینو بەکرێ گیراوان .
– مردن بۆ خائینو بەکرێ گیراوان .
– بڵێ . . هەربژین خزمەتگوزارە دڵسۆزەکانی شار .
– هەر بژین خزمە تگوزارە دڵسۆزەکانی شار
پاشان رووی‌کردە نووسەری دادگاو گوتی :
– بریاری دادگا بەم شێوە بنووسە . .
«لەبەر ئەوەی تاوانبار لەبەردەم ئامادەبووانیدا نامەی رۆژی . . . . بەدرۆخستەوە کە مەبەستی ئەوەبوو دەوری لێپرسراوە دڵسۆزەکانی شار لەبەر چاوی کاربەدستانی پارێزگا بشێوێنێو بەپێی بربرە (٢)ی بەندی (ب)ی مادە (٢٤٧٩٦٦)ی یاسای سزادانی گشتیو رەچاوکردنی وەزعی تایبەتی تاوانبار . دووای ئەوەی کە ناوبراو پەشیمانی خۆی دەربری . . دادگا بریاری‌دا تاوانبار بۆ ماوەی (٦) مانگ ، رۆژی (٣) جار وهەر جارەی سەعاتێکی تەواو لە گۆرەپانی شەقامی گشتی‌ی شاردا بچێتە بان ئەو تەختەیەی بۆی دروست دەکرێو بەهەموو هێزو توانای هاواربکا : «بمرێ با» . ئەمەو دادگا کۆتایی هات» .
گریانم لە قورگدا وەستابوو . . نەمدەزانی چی بکەم . . دادپەروەرێ نەبوو شکاتی لابکەم .
دەستەی بەرێزی دادگا یەك بەدووای‌یەکەوە هۆڵیان جێهێشت . پۆلیسێك هاتو دەستی گرتم ، بۆ ئەوەی بریاری دادگا جێبەجێبکەم . بەڵام هەرکە پێمگەیاندە شەقام . لەنێو کەردو خۆڵو رەشەبا ، پۆلیسم وونکرد : نەمدەتوانی چاوم بکەمەوە وهاوار بکەم وبڵێم : «جەنابی قایمەقام . . . دادپەروەرە بەرێزەکان . . ئەگەر ئەمە «با» نەبێ ئەی چی‌یە ؟
بای لەعنەتی ماوەی نەدام ، دەم بکەمەوە . . ویستم گلەیی لای کەسێك بکەم ، بەڵکو ئەمە خوایە لای جەنابی قایمەقام شەفاعەتم بۆ دەکا . . بەڵام شەقامێکی کش‌ومات وشارێکی خامۆشو بابردوو . . تەواوی دەرگاکان داخراون . . تەنها (با) نەبێ وەکو گورگی برسی هێرشی دەهێناو ئەوەی بکەوتایە بەر شالاوی لەگەڵ خۆیدا دەیبرد !

# منداڵەکان



●

نووسینی :ـ زکریا تامر

●

گۆڕینی : نیشتمان عبدالله

●

## (١) لە شەودا

منداڵەکە لە شیرین خەودا بوو . کاتێك جنۆکەکە لەژێر زەمینە تاریکەکەوە . بەنهێنی بۆلای سەرکەوت . بەدەنگێکی نەرمو نیان . پیی ڕاگەیاند :

– بۆ ناو دەریات دەبەم .

منداڵەکە بەسەرسامیەوە ووتی :

– دەریا چی‌یە . نازانم ؟ .

جنۆکەکە ووتی :

– دەریا منداڵێکە ئاوی خۆش‌دەوێ . دوو چاوی شینی هەیە . . لەو کاتەدا منداڵەکە گوێی لە هاژەی دەریایەکی تووڕە بوو ، بەنیگەرانی‌یەوە چرپاندی بەگوێی‌دا

– دەریام خۆش‌ناوێ .

– کەواتە چیت خۆش‌دەوێ ؟ .

– بێستانم خۆش دەوێ .

جنۆکەکە بەگاڵتە پێکردنێکەوە پێ کەنی و سەری ڕاوەشاند ، دووبارە پرسی یەوە :
– بۆچی بێستانت خۆش دەوێ ؟ .
– بێستان سەوزە .

دووبارە جنۆکەکە ووتی : دەتبەم بۆ ناو دەریا . . .

بەدەریا قایل بوو ، منداڵێك نەبوو ، بەڵکو پیاوێکی باڵا بەرزی ناوشان پان بوو ، لە سنگیا گیا سەوز بوو بوو ، منداڵەکە لە ترسا دەلەرزی ، بەڵام نەی ئەتوانی بگری ، دەریا لە جنۆکەکە نزیك بووەوە ، کاتێك بەدەستە زێڕینەکانی باوەشی پێدا کرد ، لەپڕ لێك بوون ، هەروەك خوێ لە ئاودا توانەوە .

منداڵەکە لە ترسا بەئاگاهاتەوە ، دەلەرزی ، بەدەنگێکی بەرز گریا ، دایکی نووستوو گوێ ی لە نوزەی نەبوو ، ماوەیەك بەتەنیا مایەوە ، دەگریا ، بەپشتا خۆی بەسەر پێخەفە بچووکەکەی دا دابوو ، وورده وورده گەڕایەوە بۆ باوەشی خەونەکانی ، بێستانەکە پێ کەنی ، درەختەکان سەوزبوون ، پاساری یە بچوکەکان ، چوونە سەر لق و پۆپەکان ، دەیان جریواند ، رووباریش سروودێکی ئاوداری تەری دەووت ، منداڵەکە دڵ خۆش بوو ، بەڵام خۆشی یەکەی زۆری نەخایاند ، جنۆکەکە گەڕایەوە ، بەردەوام دەی چرپاند بە گوێ ی دا :
– دەت بەم بۆ ناو دەریا .

ئەو کاتە جنۆکەکە ئافرەتێکی دەم هەراش بوو ، ڕق و کینە لە چاوە گەورە گەشەکانی دەباری ، منداڵەکە بەقیژەیەکی ترسناك ، دایکی بەئاگا هێنایەوە ، بە ڕاکردن چوو بۆ لای ، پاشان بەسۆزەوە ، لە باوەشیا پاڵ کەوت ، ئەویش نووساندی بە سنگیەوە ، هێوری کردەوە ، بە دەنگێکی نزم و هێواش ، دەی لاواندەوە ، بەڵێنی دایە ، گەر بخەوێت ، دوو کۆتری سپی بۆ دەهێنێ .

بێستان لەو کاتەدا ئافرەتێك بوو ، لەسەر گازی پشت کەوتبوو ، لە خۆشیا پێ دەکەنی ، لە ئاسمانی شینی پان و بەرین دا ، دوو کۆتر دایان لە شەقەی باڵ ، پاشان کۆترێکی بچکۆلە ، بووە سێ هەم و دوایان کەوت و ئاوی خۆش نەدەویست .

### (٢) (حەشارگەی مانگ)

منداڵەکە بەدایکی ووت :
– دوێنێ شەو ، مانگ لە ئاسمان دابەزیە سەر زەوی ، پەرداخێك ئاوی خواردەوە .

دایکەکە زەردەخەنە گرتی و ووتی :
– کە لە تەمەنی تۆدا بووم ، مانگم بینی پرتەقاڵێ دەچنی .

منداڵەکە ووتی :
– مانگ ماڵی هەیە ؟ .

دایکەکە وەڵامی نەدایەوە ، منداڵەکە بەشان هەڵ تەکاندنەوە پرسی :
– بەرۆژ مانگ بۆ کوێ دەچێت ؟
– خۆی دەشارێتەوە .
– لە کوێ ؟ .
– کەس نازانێ ، حەشارگاکەی .
– بۆچی خۆی دەشارێتەوە ؟ .
– ئێمە بەشەو دەنوین ، بەڵام مانگ بەرۆژ دەنوێت .

منداڵەکە بێ دەنگ بوو ، هیچ ووتەیەکی تری لە دەم دەرنەچوو ، بەڵکو لەو کاتەوە بریاری دا ، بەشوێن حەشارگەی مانگ دا بگەڕێت ، کاتێك کە گەورە دەبێت .

### (٣) خۆر هاوڕێمە

منداڵەکە نەی توانی ، سەرکەوتوو بێت ، لە هەوڵ

دانەکەی‌دا بۆ ئەوەی رووبەرووی ، تیشکی خۆرەکە بێت‌و چاوەکانی کراوە بێت ، بەبێزاریەوە سەری دانەواند ، بەدایکی ووت :

– خۆر رق لێمە .

دایکەکە ووتی :

– خۆر هەموو کەسێکی خۆش‌دەوێ .

منداڵەکە هەر دەیووت :

– خۆر خۆشی ناوێم .

رۆژ بەهەنگاوە سستەکانی کۆچی‌کرد ، خۆرە روو گرژە کەشی لەگەڵ خۆیدا برد لە شەودا ، بارانێکی زۆر باری ، پاشانیش ، بەیانی سپی شی‌دار هات .

کاتێك منداڵەکە لە باخچەکەیاندا ، چۆلەکەیەکی دۆزی‌یەوە‌و لە خۆشیا هاواری‌کرد ، لەکاتێکا چۆلەکەکە لەسەرما ، دەلەرزی باران تەری کردبوو ، دەستی‌کرد بەنان دانی چۆلەکەکە ، پارچە نانی بۆ وورد دەکرد ، بەلام چۆلەکەکە ، هەر لاواز بوو ، لە سەرما ، لە ترسا دەلەرزی .

منداڵەکە ، کە بۆی دەرکەوت ، چۆلەکە هەر کاتێك بێت دەمرێت ، دلّ تەنگی‌و ناهەمواری باڵی بەسەردا کێشا ، بەلام کاتێك هەورە چڵکنە بۆرەکان رەوینەوە لە ئاسمان ، خۆریش سەر لەنوێ دەرکەوتەوە ، چۆلەکەکە ، دەستی‌کرد بەدەنووك جولاندن‌و دان خواردن بەخۆشی‌یەوە ، پاش ماوەیەکی زۆر کەم ، باڵەکانی دا بەیەك‌داو فڕی ، منداڵەکە سەیری خۆری کرد ، لە چاوانیا ترس‌و سوپاس‌و ماڵ ئاوایی ، تێکەڵ بەیەکتر بوون ، پاشان بۆ رووە ئاڵتوونی‌یەکەی ، پی‌کەنی ، پی‌کەنینێك ، کە هی کەسێك بڕیاری‌دا ، تا کۆتایی خۆشی‌بوێت .

## (٤) مامزی دیل

منداڵەکە ، بەرێگایەك‌دا دەڕۆی ، کە هەمووی دەنگە دەنگ‌و ژاوە ژاو بوو ، لە ترسان پەنجە بچووکەکانی توندکردبوو لە دەستی دایکیا . لەپڕ وەستا هاواری کرد :

– ئەمە چی‌یە ؟ .

بەدەست ئاماژەی کرد بۆ دوکانەکە ، کە مریشك‌و باڵداری دەفرۆشت . مامزێك وەستابوو ، تەوقێکی چەرم لە مل ئالابوو ، نەی دەهێشت دەربازبێت‌و را بکات .

دایکەکە ووتی :

– ئەمە پی‌ی دەڵێن مامز .

– لە کوێ‌وە هاتووە ؟ .

– لە بیابانەوە .

– بیابان چی‌یە ؟ .

– بیابان ، شوێنێکی فراوانە ، زەوی‌یەکەی بە لم داپۆشراوە

– لم چی‌یە ؟ .

– لم دەنکە خۆڵێکی نەرمی زەردباوی زۆر بچووکە .

– ئەی بۆچی مامزەکە هاتۆتە ئێرە ؟ .

– راوکەرەکان هێناویانە بۆئەوەی بیفرۆشن .

– ئەوەی بیکرێت ، چی لی‌دەکات ؟ .

– سەری دەبڕێ چونکە تامی گۆشتەکەی زۆر خۆشە منداڵەکە مامزەکەی هاتە پێش چاو ، لە کاتێکا راوەستابوو ، لە ترسا دەلەرزی‌و زەرد هەڵگەڕا بوو ، چاوە گەشەکانی حەزی لە گریان دەکرد .

منداڵەکە لەرزی ، هەستی کرد ئەمیش ، رۆژێ لەڕۆژان مامزێکە ، بەبیابانی فراوان‌دا دەپەڕێتەوە ، دەستی کرد بە گریان .

بیابانیش لەو کاتەدا ، لە خەیاڵی منداڵەکەدا ، زەوی‌یەکی بەر فراوان بوو ، کە لمی زەرد باوو ، دای پۆشیبوو ، تەنها مامزو راوکەر تیا دەژی .

**کۆتایی**

* – سەرچاوە / الرعد (قصص) زکریا تامر



# ڕوحانەت

**نووسینی گی دی موپاسان**
**نەوزاد عبدالله ئاغا باوە لە ئینگلیزی‌یەوە کردوویە**
**بە کوردی**

کۆمەڵێك پێکەوە دانیشت بووین دەربارەی دەست بەسەراگرتنی موڵك قسەمان دەکرد کە گیروگرفتێکی مەسەلەیەکی یاساگەری تازە بوو . نزیکەی لای ئێوارە بوو چەند هاوڕێیەك بووین لە خانووێکی کۆنی گەڕەکی ڕێودۆگرانیل دانیشت بووین . هەر یەکەمان بەسەرهاتێکی ئامادەکرد بوو کە دەی ویست بیگێڕێتەوە . بەسەرهاتێك کە ڕاست بێت . ئەنجا پیرەمێرد مارکۆس دی لاتۆر ساموئێل کە تەمەنی هەشتاو دوو ساڵ بوو هەستا ، خۆی بەسەر تاقی کوورەکەدا چەماندەوەو بەدەنگێکی لەرزۆکەوە وتی :

منیش مەسەلەیەکی سەرسوڕهێنەر دەزانم ، شتێکی هێند سەرسوڕهێنەر کە تا ئێستاش لە لێکدانەوەو باسکردنی لە ناو خۆمدا ڕزگارم نەبووە . ئێستا نزیکەی پەنجاو شەش ساڵ بەسەر ڕووداوی ڕووداوەکەدا تێپەڕیوە کەچی هێشتا تاقە مانگێکیش ڕەت نەبووە کە تی‌ ی‌دا جارێکی دی خەون بەو کارەساتەوە نەبینم . نیشانەو جێ پەنجەکانی ترس . ئەگەر لێم تی‌بگەن . لەو ڕۆژەوە تا ئێستا لێم نەبۆتەوە . بۆ ماوەی پێنج دەقیقە ترسێکی کوشندەی وا کەوتە دڵمەوە کە بۆ هەتا هەتایە سامێکی کوشندەی تێکەڵی ڕۆحم کرد .

دەنگە دەنگی سەیرو غەریب ناخی دڵم لە ترساندا دەلەرزێنن ئەو تارمایی‌یە بەحاڵ بینراوانەی شەو بەجۆرە

ـەزوویێکی شێتانەوە کڵپەم لێ هەڵدەستێنن‌و وام لێ دەکەن لە
ـسـندا بفرم ، بەکورتی بەشەو زۆر دەترسم .

ئاه ، نا تا بەم تەمەنەم گەیشتووم ئەم شتەم هەرگیز لای کەس نەدرکاندووە ! ئێستا دەتوانم هەموو شتێك بڵێم ، لە تەمەنی هەشتاو دوو ساڵیدا حەز ناکەم خۆم وا دەربخەم کە دەمەوێ چاونەترس‌و ئازا خۆمتان پیشان بدەم بەرامبەر ـەترسێکی خەیاڵی . لەمەوپێش هەرگیز نەترساوم‌و بەرامبەر گەورەترین ترسی کوشندە ڕاوەستاومەتەوە .

مەسەلەکە هەر بەتەواوی‌سەری لێ شێواندم‌و شڵەژاندمی‌و هێندە بە قووڵی‌و سەرسوڕهێنەری‌و سامناکانە ترساندمی بەجۆرێك وای لێ کردم کە هەرگیز بۆ کەسی نەگێڕمەوە . مەسەلەکەم لە قووڵایی دەروونا شاردەوە ، لەو قووڵایی‌یانەدا کە نهێنی‌یە برین کولێنەرەوە ئازاردەرکانی دەروون نهێنی‌یە تەریق کەرەوەکان‌و لاوازی‌یە نەدرکێندراوەکانی ژیانمان خۆیانی تێدا حەشار دەدەن . مەسەلەکە ڕێك بەو جۆرە ناگێڕمەوە کە رووی‌دا بەبێ هیچ هەوڵێك بۆ روونکردنەوە . هیچ گومانی تێدا نی‌یە کە دەتوانرێت روون بکرێتەوە مەگەر لە کاتی ڕوودانی مەسەلەکەدا من شێت بووبم ، بەلام شێتیش نەبووم‌و بۆشتان دەسەلمێنم ئێوەش چۆنتان پێ خۆشە وا بیربکەنەوە . ڕاستی مەسەلەکە ئاسایی بەم جۆرە بوو :

مانگی تەمموزی ساڵی ١٨٢٧ی زایینی لە (ڕیۆن) بووم ، ڕۆژێکیان بەلای کەناری بەندەرەکەدا دەڕۆیشتم تووشی کابرایەك بووم کە هەر لە خۆمەوە وام زانی دەی ناسم بەلام بێ ئەوەی بیرم بکەوێتەوە کە کێ‌یە . بەئەنقەست ڕۆیشتنەکەمم هێواش کردەوە تا بوەستم کابرا تێم گەیشت‌و زانی چیم مەبەستە ڕاوەستا تەماشایەکی کردم‌و هەردوو دەستی گرتم .

کابرا هاوڕێ‌یەکی تافی هەرزەکاری خۆم بوو . یەکێك بوو لە هاوڕێ گیانی بە گیانی‌یەکانم . پێنج ساڵ بوو نەم دی بوو ، بەلام ئەو لەوە دەچوو نیو سەدە تەمەنی بەسەر چوو بێت ، سەری بەتەواوی سپی بووبووو بە کۆمە کۆم بەری‌دا دەڕۆیشت هەر وەك بەتەواوی شکەستی هێنابێ . کابرای هاوڕێم بەسەرسوڕماوی‌یەکەمی زانی‌و بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕامەوە . بەدبەختی‌یەك سەر ڕێی ژیانی پێ گرت بوو بەتەواوی ژیانی تاڵ کردبوو .

هاوڕێکەم شێت‌و شەیدای کچێکی گەنج بووبووو دوایی هێنابووی ، بەلام پاش ساڵێك لە بەختیاری‌یەکی خوایی‌یانەو سۆزو خۆشەویستی‌یەکی نەرم‌و نیان‌و ڕاست‌و ڕەوان کچە بە هۆی نەخۆشی دڵەوە دەمرێ ، زیاتر لەوانەیە لەتاو خۆشەویستی بووبێ ، دڵی بەرگەی نەگرتووەو مردووە .

کابرا هەر لە هەمان ڕۆژی ناشتنەکەیدا کۆشکەکەی بەجێ هێشتووەو هاتبوو بۆ ماڵەکەی لە ڕیۆن لەوێ بەتەنیایی ژیانی دەگوزەراندو غەم ڕۆژ بەڕۆژ دڵی دادەکرۆشت ، هێند سەیر بووبوو هەر لەوە دەچوو کە بیر لە خۆکوشتن بکاتەوە .

کابرا پێی وتم ئاه ئێستا کە تۆم دیوەتەوە تکات لێ دەکەم کە پیاوەتی‌یەکم لەگەڵ بکەی ، بچیت بۆ خانووە کۆنەکەم‌و لەناو مێزەکەمدا — لە مێزی ژووری نووستنەکەماندا چەند کاغەزێکی تێدایە زۆر زۆرم پێویستن‌و دەبێ بۆم بهێنی . ناتوانم خزمەتکارێك وەیان پارێزەرێك بنێرم چونکە لەم کارەدا ژیری‌و وریایی‌و نەدرکاندنی مەسەلەکە گرنگە . تازە خۆم ، هیچ هێزێك نی‌یە لە دنیادا بم‌جوڵێنی تا پێ بخەمەوە ناو ئەو ماڵە ، کلیلی ژوورەکەت دەدەمێ کە لە وەختی ڕۆیشتنمدا دام‌خستووەو هەروەها کلیلی مێزەکەش هەروەها ناونیشانێکیشت دەدەمێ کە بۆ باخەوانەکەمی هەڵدەی تا دەرگای کۆشکەکەت بۆ بکاتەوە بەلام ئێستا وەرە بەرچاییم لەگەڵ بخۆ دوایی خۆمان مەسەلەکە ڕێك دەخەین .

منیش پەیمانم‌دا کە ئەو پیاوەتی‌یە بچووکەی لەگەڵ بکەم . چونکە خۆ هیچ هەڵەیەکی تێدا نەبوو . ماڵەکەی نزیکەی چەند میلێك لە (ڕیۆن)ەوە دوور بووو بەئاسانی بەولاخ بەسەعاتێك دەگەیشتی .

لە کاتژمێری دەی بەیانی ڕۆژی دوایی گەیشتمە ماڵەکەی ،

پێکەوە بەرچاییان کرد بەڵام ئەو هەر هیچ قسەی نەدەکرد .
کابرا تکای لی‌کردم کە بی‌بەخشم ، کابرای بۆخۆی وتی کە فکرەی ئەو گەشتەی کە من پەیمانم پی‌داوە تا بچمە ژوورەکەیەوەو دیمەنی بەختیاری‌یە جوانەمەرگەکەی بەتەواوی هەرەسیان پی هێناوە لە راستیدا کابرا زۆر سەیر وروژا بووو شلەژا بوو وەکو ئەوەی کێشەیەکی سەیر لە رۆحی‌دا سەری هەڵدابێت .

دوا جار کابرا تی‌ی گەیاندم کە دەبێت چی بکەم ، شتێکی زۆر ئاسان بوو ، دەبوو بچم دوو بەند نامەو رۆڵێك کاغەزی لە یەکەم چەکمەجە کە لە لای راستی ئەو مێزەوەیە کە کلیلەکەیم پی‌یە ، بۆ بهێنم . دوا جار کابرا پی‌ی وتم : «حەز ناکەم پێت بڵێم تەماشایان مەکە .»

لە راستیدا ئەو تێبینی‌یەی هاوری کۆنەکەم پەستی کردم ، منیش بە رەقی ئەوەم پی‌وت کە ئەو قسەیەم پی ناخۆشە ، کابرا دەمی تێکەڵ‌و پێکەڵ بووو وتی : «بمبوورە زۆر خەفەت‌بارو دڵتەنگم» ئەنجا دەستی‌کرد بەگریان . منیش ئیزنی سەعاتێکم لی وەرگرت تا بچم پەیمانەکەم بەجی بهێنم .

— «کەژەکەی زۆر سازگارو خۆش بوو ، بە چوار ناڵە بەناو کێلگەکاندا تی‌پەریم گوێم بۆ خوێندن‌و جریوەی کەندەسمەکان شل کردبوو ، لە رۆیشتنمدا کە شمشێرەکەم بە پووتەکەم دەکەوت ئاوازێکی مۆسیقایی خۆشی هەبوو . گەیشتمە ناو دارستانەکەو ئەسپکەم تاودا ، لە رۆیشتنمدا لق درەختەکان لە دەم‌و چاوم دەخشان‌و جار جار منیش بەدەم گەڵایەکم لی دەکردنەوەو دەم جوو . ئەو بەختیاری‌یە پاکەی ژیان هەستێکی وروژاوو دڵخۆشی‌یەکی لە باس نەهاتووو جۆرە سەرخۆشی‌یەکی سەیری تێدا دەبووژاندیتەوە .

هەر کە لە کۆشکەکەی نزیك بوومەوە تەماشایەکی گیرفانم کرد تا وەکو ئەو تێبینی‌یەی کە دابوویمی بۆ باخەوانەکە ، بدۆزمەوە ، کە بینیم نامەکە لە زەرف خرابووو داخرابوو هەر بەتەواوی سەرم سورما ، ئەوەندە سەرم سورماو تێك‌چووم بەجۆرێك کە خەریك‌بوو بگەرێمەوە بی ئەوەی کارەکەش جی‌بەجی بکەم . بەڵام وام بیرکردەوە کە ئەگەر وا بکەم بەو کارە شلك لە خۆمدا دروست‌دەکەم . لەوانەیە هاورێکەم ئاسایی نامەکەی خستبێتە زەرفەکەوەو دای‌خستبی بی ئەوەی خۆشی لەو بارە ناهەموارەی خەیاڵی‌دا ، ئاگای لی بووبی .

«کۆشکەکە لەوە دەچوو بیست ساڵ بی چۆڵ کرابی دەرگاکەی کرابووەوە بەڵام هێند رزیوو کۆن بوو سەرت پی‌ی دەسورما کە چۆن بەدیوارەکەوە وەستاوە . رێگاکە گیای لی روابووو سەوزە گیا تا سەر ئەژنۆ هات بوو ئینجانە گوڵەکانیش لە ناو گیاکەدا نقووم بووبوون‌و بنکەکانیان دیار نەمابووو لەوە نەدەچوو کە لەسەر بنکەکانیان دانرابن .

بەو تەقە تەقە توندەی کە لە دەرگاکەم‌دا پیرە مێردێك لە ژوورێکەوە دەرکەوت کە وا دیاربوو بە بینینم سەری سورمابی ، کاغەزەکەی لی وەرگرت‌و خوێندی‌یەوە ، جارێکی دیکەش خوێندی‌یەوە دیقەتێکی دایەو ئەنجا لەبەری پێمەوە تا تەوقی سەرم پی‌ی‌دا روانیم‌و کاغەزەکەی خستە گیرفانی‌یەوە ، دوا جار وتی :

باشە ! ئێستا تۆ چیت دەوێت ؟

منیش بەکورتی وەڵامم دایەوە : پێویستە بزانیت کە چیم دەوێت چونکە نامەی گەورەکەتت خوێندەوە ، دەمەوی کە بچمە ناو کۆشکەکەیەوە .

کابرا لەوە دەچوو کە پەست بووبی وتی : ئەنجا دەتەوی کە بچیتە . . . . . . . بچیتە ژووری ژنەکەیەوە ؟

منیش ئارامم لەبەر برا : وسەیرکە ! باشە تۆ بریارت‌داوە کە لێم بکۆڵی‌یەوە ؟

کابرا بەسەرسورمای‌یەکەوە دەمی تێکەڵ‌و پێکەڵ بوو : نەخیر ——— گەورەم ——— بەڵام ئەوە چونکە ——— ئەوەیەکە ——— لەوەختی ———
لە وەختی مردنی ژنەکەیەوە تا ئێستا نەکراوەتەوە . ئەگەر بەزەحمەتی نازانی لێرە پێنج دەقیقە چاوەری بکە بچم تا

———— تا بزانم ئەگەر ———— .

منیش بە توورەیی‌یەکەوە قسەکەم بەکابرا بری : چاوت تێرە بێ ! ئەوە بۆ کوێ لێ دەخوری ، تۆ ناتوانیت بچیتە ژوورەکەیەوە چونکە کلیلکەکەی بەمنە .

کابرا هیچ قسەیەکی نەما ، وتی کەواتە دەوەرە گەورەم تا ڕێگاکەت پیشان بدەم .

– قادرمەکانم پیشان دەو بەجێم بهێڵە ، خۆم ئیشی خۆم باش دەزانم‌و پێویست بەتۆ ناکات .

– بەڵام ——— گەورەم ——— لە ڕاستیدا ———

منیش ئەم جارەیان بەتەواوی توورە بووم : تکایە بێ دەنگ بە دەنا فێردەکرێیت چۆن بێ دەنگ بیت ، پاڵێکم پێوەناو یەکسەر وەژوور کەوتم .

لە ژووری چێشت لێنانەکەوە چوومە ژووری ، دوو ژووری دی هەبوون کە خزمەتکارەکەو ژنەکەی تێدا دادەنیشتن دوای ئەمانە لە تەنیشت هوڵێکی گەورەوە گەیشتمە قادرمەکان ، کە پیێ‌دا سەرکەوتم ، ژوورەکەی کە هاوڕێکەم دیاری کردبوو ، ناسیمەوە .

بەئاسانی دەرگای ژوورەکەم کردەوەو چوومە ژووری ، ئەپارتمانتەکە ئەوەندە تاریك‌بوو کە لە سەرەتادا هیچ شتێکم نەبینی کەمێ هەنگاوەکانم هێواش‌و کورت کردنەوە ، بۆنی ژوورێکی تاریك‌و چۆڵ‌و پڕ تەپ‌و تۆز ، ژوورێکی وشك‌و مردوو بەسەرمدا هات . پاش ئەوەی چاوم لە تاریکایی‌یەکدا ڕاهات‌و روون بووەوە بەئاسانی هەموو شتێکم دەبینی ، قەرەوێڵەیەکی گەورە جێگەیەکی تێکدراوی لەسەر بوو جێگەکە رووت‌و بێ سەرچەف بوو هێشتا دۆشەگەکەو سەرینەکانی لەسەر بوو ، لەسەر یەکێك لە سەرینەکان چاڵێك دروست بووبوو کە لە جیێ ئانیشك یان سەر دەچووو لەوە دەچوو کە پێش ماوەیەك کەسێکی لەسەر نووستبێ .

کورسی‌یەکان هیچیان لەجیێ خۆیان نەبوون دیقەتم دا دیتم دەرگایەك کەبەسەر ژوورێکی یەك کەسی‌یەوە بوو درزێکی تێ کرابووو دانەخرا بوو .

لە پێشدا چوومە کن پەنجەرەکەو کردمەوە تا وەکو هەندێ ڕۆشنایی بێتە ژوورەوە ، بەڵام دەسکی دەرگاکە هێند کۆن‌و قایم بوو بۆم نەکرایەوە تەنانەت ویستم بەشمشێرەکەم بیان شکێنم بەڵام هەر بێ سوود بوو ، لەبەر ئەوەی هەوڵە بێ وچانەکەم بۆ کردنەوەی دەسکی دەرگاکە بێ سوود بوو ، ئەو خەیاڵەشم لە مێشکی خۆم دەرکرد ، هەستام‌و چوومە لای مێزەکە .

لەسەر کورسی‌یەك پاڵم دایەوە ، سەرچەفی سەر مێزەکەم لابردو چەکمەجەکەی کە پیێ وت‌بووم ، کردمەوە ، چەکمەجەکە پڕ بوو لەشت . من تەنها سێ بەند کاغەزەم دەویست کە دەم‌زانی چۆن بیان‌دۆزمەوە ، دەستم کرد بە گەڕان بەدوای بەندە کاغەزەکاندا .

کاتێ کە چاوم بڕی‌بووە کاغەزەکان‌و دیقەتم دەدانێ تا بیان خوێنمەوە ، گوێم لێ‌بوو ، وەیان زیاتر بابڵێین هەستم کرد کە خشپەیەك لە پشتمەوە هات ، زۆر گرنگیم پیێ‌نەدا . چونکە وام بەبیردا هات کە شەماڵێك لە پەنجەرەکەوە هاتووەتە ژووری‌و پەردەکانی لەراندۆتەوە . بەڵام پاش نزیکەی ئاوا دەقیقەیەك جووڵەیەکی دی کە هەست پیێ نەدەکرا مووچووڕکێکی ترسناکی بە هەموو لەشمدا هێنا . ئەو جووڵەیەم ، بەهۆی غیرەت‌و خۆ بەپیاو زانیم ، هێند بەشتێکی لاوەکی دانا تەنانەت ئاوڕێکیشم لێ نەدایەوە . دوایی دووەم بەند کاغەزیشم دۆزی‌یەوە ، خەریکی ئەوە بووم کە دەست بخەمە سەر بەندی سێهەمیان ، لە پڕێکدا هەناسەیەکی قووڵ‌و پڕ ئازار لە پشتمەوە هەڵکێشرا ، وەکو کابرایەکی شێت بەجۆرێك لە جیێ خۆم هەڵبەزیمەوەو دەرپەڕیم کە چەند پیێ‌یەك لەو لاوە ڕاوەستامەوە . هەرکە خۆم هەڵدایە ئەو لاوە ، ئاوڕێکم دایەوە دەستم بەسەر شمشێرەکەمەوە بوو ، بڕوا بکەن ئەگەر بهاتایەو شمشێرەکەم بەلا قەدمەوە نەبووایە وەك ترسنۆکێك تێم دەتەقاند .

– ژنێکی کەڵەگەت جلێکی سپی لەبەربوو لە پشت ئەو

کورسی‌یەی کە پێش ماوەیەك لەسەری دانیشت بووم ڕاوەستا بووو وتی‌ی دەڕوانیم .

موچورکەیەکی وا بەلەشمدا هات کە هەستم‌کرد کەوتمە ناو ڕابووردوو هیچ کەسێك لێم تێ‌ناگا مەگەر خۆی بکەوێتە ئەو بارەوەو هەستی پێ بکات . هەست بەو ترسە سامناکە بکات . لە کاتی وادا مێشك‌و بیر خاودەبنەوەو ڕادەوەستن ، دڵ لە لێدان دەکەوێ هەموو لەش هەروەك ئیسفەنج خاوو لاواز دەبێ هەروەك ئەوەی کە پیاو ژیانی کۆتایی بێت .

من بڕوام بەڕوحیانەت نی‌یە ، بەلام لەگەڵ ئەمەشدا ئەو ترسە کوشندەیەی ئەو مردووە وا بەسەرمدا زاڵ‌بوو ، لەو چەند ساتەدا لە هەموو کاتێکی‌تری ژیانم زیاتر ، لەو ئازارە لەرادده بەدەرەی ئەو ترسە سەروو ئاسایی‌یەیەوە ، ترسام . ئەگەر بهاتبایەو ژنەکە وەقسە نەهاتبایە هەر لەوێ لە ترسان ڕوحم دەردەچوو . بەلام کەوتە قسەکردن ، قسەکردن بە ئاوازێکی شیرین‌و دەنگێکی دڵتەنگ بە جۆرێك هەموو دەمارەکانمی هێنایە لەرزین . ناتوانم پێتان بڵێم کە هێمن بوومەوەو هاتمەوە هۆش خۆم . نەخێر ! ئەوەندە ترسابووم کە خۆشم نەم دەزانی چی دەکەم . بەلام هەندێ شانازی کە لەناو قولایی دەروونی مرۆڤدان‌و پاشماوەی غەریزەی ئازایەتین لە مرۆڤدا ، وایان لی‌کردم ، هەرچەندە بەزۆریش بوو کە خۆم ڕاگرم‌و دڵئارام خۆم بنوێنم .

وابزانم بەهۆی خۆم‌و بەهۆی ئەو ژنەوە بەتەواوی سەرم سوڕماو ڕاوەستام . هەرچی‌یەك بوو‌بێت ژن یان خێو ! دوایی زانیم ! چونکە لەکاتی دەرکەوتنی تارمایی‌یەکەدا بیرم لە هیچ نەدەکردەوە تەنها ئەوە نەبێت کە دەترسام .

ژنەکە وتی : ئاە بەڕێز ! دەتوانی چاکەیەکی گەورەم لەگەڵ بکەی ؟

منیش ویستم وەلام بدەمەوە بەلام مەحاڵ بوو بتوانم یەك وشەش بدرکێنم تەنها دەنگێکی گڕ لە قوڕگمەوە هاتە دەرەوە .

ژنە دەستی‌کرد بەقسەکردن : ها ئەو چاکەیەم لەگەڵ دەکەی ؟ دەتوانی ڕزگارم بکەی ، چاکم بکەیتەوە من زۆر خراپ ئازار دەچێژم‌و دەتلێمەوە ، ئاە ئازار دەچێژم ، چۆن ئازارێك دەچێژم ! ئەنجا ژنە بە هێواشی لەسەر کورسی‌یەکەی من دانیشت .

ژنە تەماشایەکی کردم‌و وتی : ها ئەو چاکەیەم لەگەڵ دەکەی ؟

منیش بەسەر لەقاندنێك وەلامم‌دایەوە بەڵێ ، دەنگم تا ئەو کاتەش هێزی لەبەر برابوو .

ئەنجا ژنەکە شانەیەکی لە قاوغی پشتی کیسەڵ دروست‌کراوی بۆ درێژکردم‌و بۆڵەیەکی لێوە هات : ها پرچم شانە بکە ئاە ! پرچم شانە بکە ، تەنها ئەمە من چاك‌دەکاتەوە ، دەبێت پرچم شانە کرابێت ، سەیری سەروسیمام کە چۆن ئازارێك دەچێژم پرچیشم هەروەها ئازارم دەدات .

پرچی ئافرەتەکە پەرش‌و درێژو ڕەشێکی قیرین بوو لەبەر چاوی من وا دیار بوو کە بەسەر پالپشتی کورسی‌یەکەدا شۆڕ بووبێتەوەو لە ئەرزەکە دەخشا .

بۆچی ئەو شانەیەم بەمووچورکەیەکەوە لێ وەرگرت‌و ، بۆچی دەستم لەو گورزە پرچە ڕەشە درێژەی‌دا کە هەر لەگەڵ دەست‌لێدانی هەستێکی ساردو سامناکم کرد ، وەکو ئەوەی دەست بەسەر پشتی مارێکدا . بخشێنم ؟ ئەمەیان شتێکە ناتوانم وەلام‌بدەمەوە .

ئەو هەستە ئێستاش بەسەر پەنجەکانمەوە ماوەو ئێستاش کە بیری لێ‌دەکەمەوە لەرزم لێ‌دێت .

پرچی ئافرەتەکەم شانە کرد ، نازانم چۆن دەستم دا لەو گورزە پرچە ساردانە . پرچیم لوول کرد ، هۆنیمەوەو خاوم کردەوە .

ژنە هەناسەیەکی هەڵکێشاو سەری دانەواند لەوە دەچوو کە بەختیارو دڵخۆش بێت . لەپڕ وتی : سوپاس : شانەکەی لە دەست ستاندم‌و بەو دەرگایەی کە بەحاڵ کرابۆوەو هەر

ـكی تێ‌كرابوو بۆی دەرچوو .

ـەیبێ بۆ ماوەی چەند ساتێك لەوێ مامەوەو سامێكی ـە بەسەرمدا هات هەروەك لە پاش مێردەزمە ڕاپەڕیبێتم . ـێ هەتەوە هۆش خۆم ، ڕامكردە لای پەنجەرەكە پاش ـەو تەقەلایەكی زۆر پەنجەرە داخراوەكەم كردەوەو گورزە ـێیەك ژوورە تاریكەكەی ڕووناك كردەوە . یەكسەر خۆم ـیە بەر ئەو دەرگایەی كە ژنەكە لێوەی ونبوو . بینیم ـگ كە داخراوەو هەر ناشجوولێت !

ئەنجا ئارەزووی تێ تەقاندنێكی شێتانە بەسەرمدا زاڵبوو . هەروەك ترسێكی كوشندە ، ئەو ترسەی كە سەرباز لە كاتی جەنگدا دەیچێژێ ، سێ پاكەتە كاغەزەكەی سەر مێزە كەوەكەم هەڵگرت‌و بۆی دەرچووم ، چوار پلە قادرمەم بەهەنگاوێك دەبڕی ، كاتێ خۆم دیەوە ، لە دەرەوەم . بۆ خۆشم نازانم چۆن چاوم بەئەسپەكە كەوت لەو لاوەو خۆم هەڵدایە سەر زینەكەو بەچوار ناڵە بۆی دەرچووم .

تا نەگەیشتمە ماڵەكەی خۆم لە ڕێون هەر ئاوڕیشم نەدایەوە ، ئەسپەكەم دایە دەست سەربازەكەم كە نامەهێنەرم بوو ، چوومە ژوورەكەم‌و دەستم‌كرد بەبیركردنەوە .

بۆماوەی سەعاتێك هەر لێكم دەدایەوەو مەسەلەكەم دەهێنایەوە بەرچاوی خۆم كە داخوا خەڵەتاوی دەستی هەست ناتەواوی‌یەكەم بووبم یان نا ! بێگومان من یەكێكم لەو نەخۆشی‌یە دەروونی‌یە پێ نەزانراوانە هەبوو ، یەكێك لەو نەخۆشی‌یە ترسناكە ئەقڵی‌یانەی كە دەبنە هۆی دروست‌بوونی موعجیزە ، موعجیزەیەك كە تەنها هێزە سەرووسروشتی‌یەكان تواناكانی ئەویان هەبێ .

وام لێ‌هات بوو بڵێم كاتێ‌كە لە پەنجەرەكە نزیك بوومەتەوە دیمەنێكم بینیوە هەستم بەتەواوی تێك‌چوو بووو چاوم ڕەشكەو پێشكەی كرد بوو . هەر بەرێكەوت سەیرێكی سەرسنگی خۆم كرد كلاوە سەربازی‌یەكەم گورزەیەك پرچی درێژی پێوە بوو هەمان پرچە درێژە ڕەشەكەی ژنەكە كە لە بنكەكەیانەوە بە كلاوەكەمەوە نووسابوو . منیش بە دەستێكی لەرزۆكەوە تاڵ بەتاڵ مووەكانم هەڵكەندو فڕێم‌دان .

دوایی سەربازە نامەهێنەرەكەم بانگ‌كرد . زۆر شێوا بووم ئەوەندە وروژا بووم كە توانای ئەوەم نەبوو ئەو ڕۆژە بچم هاوڕێكەم ببینم‌و هەروەها حەزیشم دەكرد كە زۆر بەتەواوی سەرگوزشتەو بەسەرهاتەكانی بۆ بگێڕمەوە . كاغەزەكانی كە داوای كردبوو بەسەربازێكدا كە خۆی كاغەزێكی دابوویەو ڕێی دابوو كاغەزەكانی بدەمێ ، بۆم نارد . پاشان هاوڕێكەم بەتایبەتی بەدوایدا ناردم ، پێیان - وت بوو كە نەخۆش كەوتووم ، گرە بردوومی ئا لەو بابەتە نەخۆشی‌یانەیان پێ وت بوو . لەوە دەچوو هاوڕێكەم بەتەواوی كەوتبێتە دڵەڕاوكێ‌وە .

بۆ سبەینێ ، بەرەبەیان چووم بۆ ماڵەكەی‌و بڕیارم دا بوو كە هەموو شتێكی بەڕاستی پێ بڵێم بەڵام ئەو لە ئێوارەی ڕۆژێك پێش ئەو ڕۆژەی من بچم چووبووە دەرەوەو نەگەڕابووەوە . ئەو ڕۆژە جارێكی دیكەش چوومەوە هەر لەوێ نەبوو . هەفتەیەك چاوەڕێم كرد هەر دەرنەكەوتەوە .

دوای ئەوە دەسەڵاتدارانم ئاگادار كرد ، لیژنەیەكی پشكنین دامەزرێندرا بەڵام نە پاشماوەی شوێنەكەی‌و نە چۆنیەتی ون بوونەكەشی دۆزرایەوە .

لە دواییدا لیژنەیەكی دیكەی پشكنین دامەزرێندراو كۆشكە چۆڵكراوەكەی هاوڕێكەمیان ژێرو ژووركرد هیچ شتێكی وایان نەدۆزی‌یەوە كە جێگەی گومان بێت . هیچ نیشانەیەكی ئەوە بەردەست نەكەوت كە ژنێك لەوێدا خۆی شاردۆتەوە .

لێكۆڵینەوەكە بەهیچ نەگەیشت ، پشكنینەكە وەستێندرا ، تا ئێستا ئەوا بۆ پەنجاو شەش ساڵ دەچێت هیچی دیكەم لەسەر نەبیستووەو هیچ زیاتر لە جاران لەو بارەیەوە نازانم .

سەرچاوە :

**88 SHORT STORIES**

**BY . GUY DE MAUPASSANT**

محمد حمه صالح توفیق

# حەقایەتی باوەژنی سەرسەخت



دەگێڕنەوە كە لە ڕۆژگارو سەردەمێكی دێریندا پیاوێك دەبێت ژنەكەی دەمرێت‌و كچێكی لێ بەجێ دەمێنێت . ڕۆژ دێ‌و ڕۆژ دەڕوا پیاوە ژنێكی تر دێنێت ، كچە گەورە دەبێت‌و باوەژنەكەی دەیكاتە لای ڕانی ئاژەڵ‌و ماڵات پاش ئەوەی كە هەموو ڕۆژ گوڵۆڵەیەك خوری دەدایە تاوەكو بیڕێسێت . ڕۆژێكیان كچە لە پاڵ دارێكدا دادەنیشێ خورییەكەی بڕێسێت لە ناكاو بایەكی توند هەڵدەكات‌و خورییەكەی لەدەست دەفڕێنێ‌و دەیكاتە كونە ئەشكەوتێكەوە كچەش شوێن خورییەكەی دەكەوێت بۆ ئەوەی بیگرێتەوە ، بەڵام كاتێك دەگاتە ئەشكەوتەكە دەڕوانێت دەڵە دێوێكی كەتەی تێدا پاڵ كەوتووە . دەڵە دێوەی گۆان شۆڕ كچەی بانگ كردە تەنیشت خۆیەوەو پێی وت : ئا تەماشا كە كچی باش بزانە من جوانترم یان دایكت ؟ كچە كە هێندەی نەمابوو لە ترساندا زارەترەك بێ لە وەڵامدا وتی بێگومان تۆ جوانتریت . پاشان دێوە پێی وت دە ئێستا وەرە سەرم بدۆزە ، لەكاتێكدا كچە سەرە قژنە چڵكنە پڕ لەڕشك‌و ئەسپێ‌ی دەڵە دێوی دەدۆزی دێوە وتی قژی من جوان‌و نەرمترە یان هی دایكت ؟ كچەی داماویش چی بكاو چی بڵێ ؟ ناچار لە وەڵامدا وتی قژی تۆ لە هی دایكم جوانترەو لە ئاورێشمیش نەرم‌و خاوترە . دێوە زۆر بەم پیاهەڵدانە

دڵخۆش بوو وئەوجا وتی من ئێستا دەخەوم‌و تۆیش ئەگەر ئاوێكی ڕەش هات هەڵم مەسێنەو ئەگەر ئاوی سپی‌و پاشان سوورو دواییش زەرد هات ئەوا بە ئاگام بێنەوە . پاشان كە ئەم ئاوانە دەهاتن كچە دێوەی لە خەو هەڵ دەساندو دێوەش كچەی هەموو جارێك لەو ئاوانە هەڵدەژەند . كچە بە ئاوی سپی دەست‌و پل‌و دەم‌و چاوی جوان‌و سپی بوونەوەو بە ئاوە سوورەكە ڕوومەت‌و دەم‌و لێوی سوورو ئاڵ هەڵگەڕان‌و بە ئاوە زەردەكە قژی زەرد بوو . پاشان دێوە گشت خورییەكەشی بۆ ڕست‌و بەوپەڕی وێڵ‌و كەماڵ‌و میهرەبانییەوە بە ڕێی خست . كچە گەڕایەوە ماڵی خۆیان‌و كاتێ باوەژنەكەی بینی كچە وەكو مانگی چواردە دەدرەو شێتەوەو ڕوومەتەكانی وورشەیان لێوەدێت ، لە ئێرەیی پێ بردن‌و تووڕەییدا چاوی پەڕییە تەوقی سەری‌و كەوتە داركاری‌و فەلاقە كردنی كچەی بەستەزمان . هەرچەندە كچە تەواوی باس‌و خواسەكەی لە نووكەوە بۆ

ـیەوە بەڵام هیچ دادێکی نەبووو باوەژن بڕوای پێ نەکردو ـ نێ دەوت تۆ ئارایشتت کردووەو داودەرمانت بە کار ـەوەو هەر ئێستا دەبێ پاك بیشۆی . بەڵام کچە بەوە ـوەندەی تر جوان بوو .

ـاوەژن کە خۆی کچێکی ناشیرینو ڕەشو دێزی هەبوو ـەری دەکرد کچەکەی خۆیشی ئاوا جوان ببێتەوە ، بۆیە ئیدی ـیشت کچەی هەنەزای لە ماڵ دەرچێتو هەستا کچەکەی ـۆی کردە لای ڕانو گوڵۆڵەیەك خوریشی دایە بۆ ئەوەی ـڕیسێت . بە هەمان دەستووری پێشوو با توندو قایمەکە ـهەڵیکردو خورییەکەی بەرەو ئەشکەوتە کە لوولدا ، کچەش ـدوای کەوتو لە نێو ئەشکەوتەکەدا چاوی بە دێوەکە کەوت . دەڵە دێو کچەی بانگ کردە لای خۆیەوەو وتی ئادەی کچی باش تاوێك قاچو قولم بۆ بشێلە ، کچەش فەرمانەکەی بەجێ هێنا . دێوە پێی وت باشە پاو پووزی من جوانە یان هی دایکت ؟ کچە لە وەڵامدا وتی ئۆی دەلاچۆ قاچو قولی تۆ ئەوەندە ڕەشو ناشیرینە دەڵێی قیرە ، هی دایکم جوانو ناسکە دەڵێی توێی ئاوە . پاشان دەڵە دێو پێی دەڵێ باشە وەرە سەرو قژم بدۆزە ، کچە ڕووی لێ وەردەگێڕێ دەڵی دەلاچۆ ئۆی سەری تۆ پڕە لەرشكو ئەسپێو هەر قێزم نایە دەستی بۆ ببەم . دێوە بەمە زۆر دڵگران دەبێتو دەڵێ باشە من ئێستا دەخەوم وتۆیش ئەگەر ئاوێکی ڕەش هات وەئاگام بێنەوە . پاش ماوەیەك کە ئاوەکە هات کچە دێوەی لە خەو هەڵساند ، دێوە کچەی سەرتاپا لە ئاوەکە هەڵکێشاو کچە بەمە ئەوەندەی تر ڕەش داگەڕاو بە جارێ بوو بە قەرەزاخ ، ئەوجا دێوە خورییەکەیشی بە نەڕێسراوی دایەوەو لە ئەشکەوتەکەی دەرپەڕاند .

کاتێ کچە بەم حاڵە دەرواتەوە ماڵەوەو دایکی دەیبینێ وای بە سەر هاتووە بە جارێ شێتو هار دەبێتو یەقەی کچەی هەنەزای دەگرێتو دەڵێ تۆ درۆت لە گەڵ کردووین . کچە هەرچەندە دەڵێ سوێندی وابێو قورعانی وابێ درۆم نەکردووە هیچ کەڵکێکی نابێ لە سزای ئەوەدا دیسانەوە دەیکەنە بەر ئاژەڵ لەوەڕاندن .

کچە ڕۆژێکیان ڕانەکەی دەباتە سەر کانیو ئاوێك بۆ ئەوەی ئاژەڵەکەی ئاو بدات ، بە ڕێکەوت کوڕی پاشایش کە لە ڕاوو شکار دەبێت بەوێدا تێدەپەڕێتو چاوی بە کچە دەکەوێت دەسبەجێ بە تیری ئەشق کچە گرفتار دەبێو لەو ڕۆژە بە دواوە ئیدی ئارامی لێ هەڵدەگیرێو خەوو خۆراکی لێ حەرام دەبێ تاوەکو دەچنە داخوازی کچەو بۆی مارە دەکەن .

ئەوجا حەوت شەوو حەوت ڕۆژ شاییو زەماوەند دەگێڕنو عەشاماتێکی زۆری تێ دەڕژێو نانو چێشتێکی فرەو فرەوان دەدرێ بە خەڵكو شەوو ڕۆژ هەر خوو بە زورنادا دەکرێو زرمەی دەهۆڵ دێو کۆڕی شاییو هەڵپەڕکێ گەرم دەبێت . ڕۆژی بووك گواستنەوە باوەژنە زۆرزانەکە کچەکەی خۆی دەرازێنێتەوەو لە کەژاوەی بووکدا بۆ ماڵی زاوای بەڕێ دەخات .

وەختێ بووك دەگاتە ئەوێو تارای بووکێنیی لە سەر لادەدرێت پیلانو فرو فێڵ ئاشکرا دەبێت . ئەمانیش دەیگێڕنەوە بۆ ماڵی باوکیو لەوێ لە دووی بووکەکەی خۆیان دەگەڕێن . باوەژن هەرچەندە پێ دادەگرێو دەڵێ هەر ئەم کچەمان هەیەو کچی ترمان نییە ، دەستەو دایەرەی کوڕی پاشا دڵیان بەم درۆیە ئاو ناخواتەوەو باوەڕی پێ ناکەنو دەکەونە ماڵ پشکنینو ئەوجا بووکی ڕاستەقینەی خۆیان دەدۆزنەوە کە باوەژن لە ناو تەنووردا شارد بوویەوە بەم جۆرە بووکی جوانو قەشەنگ لە گەڵ خۆیاندا دەبەنو کوڕی پاشای پێ شاد دەبێتو باوەژنەی فێڵبازو سەر سەختیش ڕووڕەشیی بۆ دەمێنێتەوە .

ئیتر چەپکێ گوڵو چەپکێ نێرگز
مەرگتان نەبینم هەرگیزاو هەرگیز

* ئەم حەکایەتەم لە دەمی پوورە ئامینی مەلا محەمەدی گەرمیانی تۆمار کردووە . تەمەنی هەشتا ساڵ دەبێتو ئێستا دانیشتووی شاری سلێمانییە .

# تیشکی لیزەر

## LASER

عەبدول‌حەمید فەتاح

**پێشەکی : مقدمة :**

تیشکی (أشعة) لیزەر ، گرنگ‌ترین خەزنەیەك‌بوو کە لە دنیای بەربلاوی فیزیاو زانیاری بەکارهاتوودا دۆزرایەوە . پاش دیتنەوەی ، تیشکی رووناکی ، وەك تاکە ڕێگای بینین نەما . چونکە نەك بە هۆی تیشکی لیزەر بینایی ڕووناك دەبێتەوە ، بەڵکو بووە هۆیەکی گەورەی ناردنی نامەکانیش بۆ شوێنە هەرە دوورەکانی ئاسمان . جگە لەوەی دەوری سەرەکی لە نەشتەرسازی پزیشکی‌دا دەبینێ ، ئەوەندەش بەهێز پارچە ئاسن بە یەکەوە دەبەستێتەوە ، جۆشیان دەدا .

دیارە بیری زانیاری جەنگ‌و سەربازی ، هەڵی‌وا لەدەست‌خۆی نادا ، تیشکی لیزەر بۆ کاروباری سوپایی بەکار دەهێنێ . لە بەکار هێنانی (رادار)دا ، دەیەها هەزار جار بە هێزترو وردبین‌تر دەبێ . خۆ ئەگەر کۆکرایەوەو لە بیلبیلەیەکی تەسکەوە دەرپەڕێندرا ، کارێکی سەرسوورمێنەری تایبەتی دروست دەبێ ، کە هەر مەعدەنێك بەردەمی بگرێ ، دەیتوێنێتەوەو وەك ئاوی لێ‌دەکا ، کە بۆ دژی تانك‌و هۆیە بزوێنەکان بەکار دەهێندرێ . ئەم کارانە لە توانای تیشکی رووناکی‌دانین ، بۆیێ داوا لە هەموو زانا ئەلکترۆنیەکان‌و بینەریەکان‌و ئەستیرە ناسەکان دەکرێ ، بۆ ئەوەی بەشداری پێشخستنی ئاسایش خوازانەی تیشکی لیزەر بکرێ ، دیارە ئەم ناوەش لە پیتی .L.S.E وشە ئینگلیزەکانیەوە هاتووە کە مانای (گەورەکردنی تیشك‌و ڕێکخستنی ڕێبازی تیشکە) دەگرێتەوە .

**دۆزینەوەی لیزەر :**

لیزەر ، وەك ئەوانی‌تر ، بە ڕێکەوت نە دۆزرایەوە ، بەڵکو پێش ئەمەش دەزاندرا . بەڵام ئەوەندە هەبوو کە تواندرا دەستی بەسەرا بگیرێ . لە ساڵی ١٩٥٨دا دکتۆر چارلز تونر ، لە زانکۆی کۆڵۆمبیاو دکتۆر ئەرثر شۆڵۆ لە کارگەکانی بێل‌دا ، توانیان کە ئەو زانیاریە سەرەتایە فیزیایانەی پێش سی‌ی ساڵ لەمەو بەر زانرابوو ، بە کاری‌بهێنن‌و ئەنجامێکی شیاویشیان وەدەست کەوێ ، کە بووە هۆی دامەزراندنی بناغەی ئامێری لیزەر . لەبەر ئەوەی :

تیشك لە چالاکیەکانی ئەلکترۆنە ، ئەویش بریتیە لە تەنە وردە سالبەکان . چۆن ئەستێرەکان بە چوار دەوری خۆردا دەسووڕێنەوە ، ئەو تەنانەش ، بە دەوری ناوکی (ذەرە)دا ، لە سنوورێکی دیارکراودا خوول دەخۆن . وە لە هەموو ذەرەیەکدا ، چەند سنوورێکی نەگۆڕ هەیە کە دەورەی ناوکی داوە . هەر ئەلکترۆنێ ، وزەی درایێ یان لێ‌ی‌برا ، دەست بەرداری سنوورەکەی خۆی دەبێ‌و دەپەڕێتەوە .

وە هەروەها دەیانزانی کە :

خۆ ئەگەر ئەو ئەلکترۆنانە ، وزەیان لە سەرچاوەیەکی

هێزی دەرەوەی خۆیان وەرگرت (وەك كارەبا) نەك یەك ـورر ، بەڵكو زۆر بەخێرایی ، چەند سنوورێك لە ناوك دوور ـكەونەوە . بەڵام ئەوەندە خۆیان‌ناگرن . لە بەشێك لە هەزار ـشی چركەیەك ، دەگەڕێنەوە سنووری خۆیان .

ئەو ئەنجامەی وەدەستیان كەوت :

لە گەڵ گەڕانەوەی ئەلكترۆنەكە بۆ سنوری خۆی ، ـوزە زیادەكەی ، بە شێوەی تیشكی موگناتیس كارەبایی ـدەداتەوە . ئەگەر ئەو تیشكە كەوتە بەشێك لە بەشەكانی پشتێنی ـوگناتیس كارەبایی ، بە شێوەی تیشكی رووناكی دەدیترێ .

بەم جۆرە دەردەكەوێ ، وەك چۆن گڵۆپی نیۆن بە كارەبا دادەگیرسێ ، ئاواش ، بۆ پەیداكردنی تیشك ، پێویستە لە پێشا ئەلكترۆنەكان وزە لە سەرچاوەیەكی دەرەوە هەڵمژن .

یەكەم بەكارهێنانی لیزەر بەم شێوە نوێیە ، لە ٥/تەمووزی ١٩٦٠ ، لە لایەن زانای ئەمەریكی تیۆدۆر هـ . میمانبوو . كە بریتی‌بوو ، لە : بۆریەكی ئاڵی بە قەد قەڵەمێكی رەش ئەستووری لە یاقووتی دەستكرد - كە كرۆمی تێدایە - بەڵام سەرچاوەی وزەكەی هەر تیشك‌بوو - چرایەكی وەك فلاش وێنەگرتن - دەورەی لوولەكەی دابوو . هەروەك لەم وینەیەی خوارەوە



تیشكی لێزەر سەرچاوەی وزەكەی كە تیشكە (فلاش) بۆری یاقوتی دەستكرد

كە فلاشەكە پێ‌دەكراو تیشكی بە هێزی دەدا ، هەندێ لە ئەلكترۆنەكانی كرۆمەكە دەبزووت ، لە سنووری خۆی یاخی دەبوو ، بەرەو ژوور دەردەپەری . كە دەگەڕایەوە ، تیشكێكی سووری دەدا ، كە تیشكی لێزەربوو ، ئەم تیشكەش لە تیشكەكانی‌تر جیا نەدەكرایەوە .

**رووناكی‌و لیزەر :**

تیشكی لێزەر لە فیزیای رووناكیەوە دێ . شەپۆلی رادیۆو تەلەفزیۆن‌و تیشكی ئێكس ، جۆرەكانی وزەی تیشكی رووناكی كارەبان . كە بە شێوەی شەپۆڵ بڵاو دەبنەوە .

درێژی‌و بزوێنی ئەم شەپۆلانە لێك جیان . لە كاتێكدا شەپۆلی تیشكی ئەرخەوانی (٤٠٠٠ر٠ ملم) درێژە ، هی شەپۆلی تیشكی سوور (٨٠٠٠ر٠ ملم)یە . ئەمەیان بە شێوەی تیشك دەبینرێ .

درێژترین شەپۆل ، هی رادیۆیە ، لە دوای ئەو تەلەفزیۆن دێ ، ئینجا شەپۆلەكانی : رادار ، تیشكی ژێر سوور ، سەروو ئەرخەوانی ، ئێكس ، گاما . تیشك خۆی ، شەپۆلی كارەبای موگناتیسە ، بە گشت لایەكدا ، بە نارێكی پەرش‌و بڵاو دەبێتەوە ، وە هەروەها تاكە وزەیەكە كە بە ناو ئاسماندا‌گوزەر دەكا . ئەم تیشكە بە هەموو : درێژیەك ، رەنگێك ، لایەكدا دێ‌و دەبێتە هۆی ئەوەی بە نارێكی هەندێك بە هێزو هەندێك







لاواز بکا . بۆیێ ئەم جۆرە تیشکە چەند پڕ بێ یان لە یەك شوێن‌دا کۆبکرێتەوە ، لە بزوێنی تایبەتی‌دا ، هێزیکی زۆر نادا .

ئەمەش بە پێچەوانەی تیشکی لیزەرەوەیە ، کە بریتی‌یە لە کۆمەڵە تیشکێکی شەپۆل ڕێك . هەموویان یەك درێژی‌و بزوێن‌و جوولانەوەیان هەیە ، بۆیێ بە شێوەی کۆمەڵێکی ڕیکوپێکی بێ هاوتا دەردەکەوێ . ئەمەش وزەی شەپۆلەکان بە هێز دەکاو پێکەوە بەرزو نزم دەبنەوە ، هەمووشیان بە یەکەوە دەگەنە شوێنی مەبەس .

بە هێزترین تیشکی لیزەر کە (١ر١×١٠$^{١٣}$ واط)ە ، لە شوێنێکدا کۆ دەکرێتەوە کە قەبارەکەی لە سەرە دەرزیەك گەورەتر نەبێ . ئەمەش بالاترین جیاوازی بەینی تیشکی ڕووناکی‌و لیزەرە . بۆ پێویستیەکانی شارستانیەتی سەردەم بەکار دەهێندرێ .

## ڕاگیرکردنی ئەلکترۆن :

دکتۆر تاونرو شۆلۆ بە جووتە . مەبەسیان‌بوو کە دەست بەسەر هەندێ لەو ملیۆنەها ئەلکترۆنانەدا بگرن کە تیشکی لیزەری لێ دروست‌دەبێ . بۆ ئەم مەبەسە . ناچاربوون ئامیەرێکی واگرانی بۆ دامەزرێنن کە بتوانێ ئامانجەکەیان بێنێتەدی . چونکە ئەو ئەلکترۆناتەی کەوای لێ‌دەکرێ کە سنووری خۆی جێ‌بهێڵێ‌و باز دادە سنووری نوێ . لەم سنوورە تازەیەدا ئۆقرە ناگرێ‌و ئامادەیە هەر وزەیەکی وەرگرتووە بە پەلە بیداتەوە . تا بگەڕێتەوە شوێنی خۆی .

بەڵام بۆ ئەوەی . ئەلکترۆنەکان بە پەلەتر دەست‌بەرداری ئەو وزەیەبن . شەپۆلی ڕووناکی وەك خۆی تێ‌دەگیرێ . لەمەش گرنگ‌تر ، ئەو شەپۆلە ڕووناکیانەی لە جووت بوونی هەردووکیان پەیدا دەبێ . زۆر بەهێزتر دەبێ . هەردوو زانا بیریان کردەوە لەوەی ئەگەر ژمارەیەکی زۆر لەو جۆرە ئەلکترۆنانە هەبن‌و ئامادەبن ئەمان بیبزوێنن . لە سەرەتادا ، شەپۆلە ڕووناکیەکان هەر لە خۆیانەوە دروست دەبن . وە ئەو ئەلکترۆنانەی لە سەر هەمان شەپۆلن ، دەبزون .

بەڵام ئەوەی جێی داخ‌بوو ، ئەو شەپۆلانەی بەم شێوەیە دروست دەبوون‌و دەیان توانی وزەی‌تر بدەن . زۆر بە پەلە ، لە ڕووناکیەکانی تردا ، بزر دەبوون . وزەی‌تر بدەن . زۆربە پەلە ، لە ڕووناکیەکانی تردا ، بزر دەبوون بۆ چارەکردنی ئەمەش ، هەندێ لە شەپۆلە ڕووناکیە سەرەتاییەکانیان – بۆ چەند جارێ – بە ناو ئەلکترۆنە بزواوەکاندا برد ، هەر دوولای ئامێرەکەیان ئاوێنەبەندکرد .

بەم جۆرە ، هەموو تیشکەکان کۆکرانەوەو شەپۆلە ئاسۆیەکان بەهێزتر کران‌و ئەلکترۆنەکانی تریش بزوێندران ، تا

یەلاین) جار بە تواناتربوو . خۆ ئەگەر یەکێك لەو ئاوێنانە لەوی تریان کوز کوز تر بوو ، لە کۆتایی‌دا ، شەپۆلەکان ئاوێنەکە دەبڕی‌و وەك قامکێ هێزی ڕووناکی لیزەری ڕێك ، لە کونی ئامێرەکەوە دەردەچێ .

**لیزەری یاقووت :**

بۆ پێشکەوتنی دنیای لیزەر ، دکتۆر مایمان ، هەردوو قمیشە یاقووتیەکەی بە جۆری لووس‌کرد تا وەك ئاوێنەی بچوکیان لێ‌هات . یەکێك لەو ئاوێنانە ، تارادەیەك ، ڕووناك دەرتربوو . هەر کە چرا کە پی‌کرا . لە ئاوێنەکەی ترەوە ، قامکێ ڕووناکی سووری بە هێز ، لە بۆ یەك لە هەزاری چرکەیەك لە لوولەکەیەوە دەرچوو . ئەمەش بووە هەنگاوی نوێ‌ی سەدەی لیزەر .

پاش شەش مانگێ ، دکتور علی جافان ئامێری لیزەری گازی دروست‌کرد . بە پێچەوانەی لیزەری یاقووتی . ک تریسکەی دەدا — ئەم ئامێرە دەیتوانی بەردەوام ڕووناکی دەرکا ، بەلاَم توانای تیشك‌دانی کەمتربۆوە . ئەم ئامێرە نوێ‌یە ، وەك گلۆپی (نیۆن) ، گازی نیۆن‌و هیلیۆمی پێکەوە تێ‌دەکری‌و بە کارەباوە دەبەسرێتەوە کە ئیش‌پی‌کرا لە هەردوو گازە تێکەلاَوەکەوە تیشکی ژێر سووری نەدیتراو دەردەچێ .

دوا بەدوای ئەم دۆزینەوەیە ، جۆرە ئامێریکی تریش دروست‌کرا . کە چەندەها جۆرەگازی تێ‌دەکرێ . بۆ ئەوەی تیشکی ڕووناکی جیابدەن . ئەمەش ، بە پێچەوانەی لیزەری ڕەق — یاقووت — کە زۆری هێزو گەرمی دەویست ، دەبوایا لە پلەی گەرمی نایترۆژینی شلەوە ( کە دەکەوێتە ١٩٦م° ژێر سفرەوە) تریسکەبدا . بەلاَم لیزەری گاز لە پلەی گەرمای ژووریشا کار دەکا . بۆ ئەمەش ئامێری سووك‌تر دروست دەکرێ .

**خاسیەتەکانی لیزەر :**

وەك چۆن لیزەر بۆ پەیداکردنی شەپۆلی ڕادیۆو تەلەفزیۆن‌و ڕادار بەکار دێ . هەرواش ڕووناکیە سەرسوورمێنەرەکەی . چونکە سەرەرای ئەوەی شەپۆلی ڕووناکی لیزەر دەیەها هەزار جار لە شەپۆلی ڕادیۆ کورت‌ترە ، بۆ ماوەیەکی دووریش بە ڕاست‌و ڕێکی دەڕوا . چەند دوور کەوێتەوە ڕێ‌ی خۆی ناگۆڕێ . وە خەتێ ڕووناکی دیتراو دەتوانێ لە چرکەیەکدا چەندەها ترلیۆن تریسکە بدا ، کە دەبێتە هۆی ناردنی زانیاری زۆر . قامکێ ڕووناکی لیزەر دەتوانی بە قەد هەموو ڕێگاکانی تری پەیوەندی کە ئێستا هەیە ، نامە پەرش وبلاَو بکاتەوە .

بەلاَم گەورەترین کۆسپێ لەم ڕێ‌یەدا ئەوەیە کە ، ڕووناکی لیزەر ناتوانێ وابەئاسانی هەورو بەفرو تەمومژ ببرێ ، زۆر لە توانای بەفیرۆ دەڕوا . بۆیێ حیساب بۆ کەژ دەکرێ .

دروست‌کردنی ڕادار لە سەرتیشکی ڕووناکی لیزەر ، کارێکی زۆر گرنگە . چونکە ئەو تیشکە دوای ئەستێرەی دەست‌کرد دەکەوی‌و بەرێ نادا . بە هۆی ئەمەشەوە شوێنی ئەستێرە دەست‌کردەکە دەست‌نیشان دەکرێ . ئەمە ، جگە لەوەی لە بەر زۆر باریکی ، دەتواندرێ قامکێ لیزەر بە کونێکی زۆر تەسکدا ببرێ . وە لە ئاوێنەدا بە کاردێ .

**بەکار هێنانی لیزەر :**

**١ — لەکاروباری سوپادا :**

— بۆ گەمارۆدانی ئاگر بەکاردێ .

— ئەو ئامیەرانەی بە هۆی تیشکی لیزەرەوە دووری شتەکان دەدۆزنەوە دەتوانن بە تەواوی شوێنەکە دەست نیشان بکەن . بۆی زووربەی ئەو ئامیرەرانە بە ژمێرەری ئەلکترۆنیەوە بەسراوەتەوە .

— ئەو لوولەیەی لیزەری تێدایەو وەك تفەنگ بەکار دێ ، لە هەرنیشانەیەك بگیرێ ، قامکێ تیشکی سوور لە شوێنەکەدا دەکەوێتەوە .

ئەمانەش هەمووی دەبێتە هۆی ئەوەی توانای سەربازی‌و سوپایی دەوڵەتان بەهێزتربکا .

**٢ — بۆ پێوان :**

لیزەر ، وردترین‌و چاك‌ترین پێوەرێکە کە تائێستا




دۆزراوەتەوە. چونکە بە تەواوی پێوانەکە دەدا . جۆری پێوانەکەش . وەك رادار ، بە شێوەی کاتە . بەهۆی ئامێری تایبەتیەوە لێك دەدرێتەوە کە چوونو هاتنەوەی تیشکی لیزەرەکە چەندی خایاندووە . ئەوسا دەکرێتە درێژیوپانی .

**٣ – بۆ کاری بایۆلۆژیاو پزیشکی :**

لە هەموو کارە گرنگەکانی پزیشکی نەشتەر سازی‌یە . وە تیشکی لیزەر دەوری سەرەکی لەم بارەیەوە دیوە : برینی شوێنی نەخۆشو دەردەکە . درینەوەی برینەکە . نەشتەر سازی دڵ ، زراو ، فاتەردش ، بێ ئەوەی یەك دڵۆپ خوێنی لێ بێ . چونکە بە هۆی رووناکی لیزەرەوە پلەی مەینی خوێن بەرزتر دەبێتەوە ، دەمی دەمارەکان دەبەسترێ . زانیاری لیزەر .

زانیاری لیزەر ، جگە لەوەی دەوری خۆی لە تاکە شانە دا دەبینێ ، سفەتە ویراسیەکانیشی ـستۆتە ژێر رکێف خۆیەوە . خۆ بۆ نەشتەر سازی چاو ، کە ئەندامێکی زۆر ناسکی ئادەمی زادە، تەواوی کاری هونەری دەکا وەك لابردنی تانە لە سەر بیلبیلەی چاو ، درینەوەی تۆری چاو . ناردنی ـیـسکی رووناکی لیزەر بۆ دەمارە باریکەکانی ناو چاو .

**٤ – بۆ زانستی :**

لیزەر ، ئامێری وای پێك هێناوە کە بتوانی زۆرشت لێك جیا بکاتەوە ، پێوانەی بکا ، وردترین بکێشێ . خۆ ئامێری لیزەری کون کەر ، هەمووشتێ ، وەك پێویست . کون دەکا . دەیبرێتەوە . پێکەوە دەنووسێنێتەوە . دەتوانی رەقترین شت ، وەك ئەلماس ، کونبکا ، هەروەها نچوکترین شت کە بە کارەبا ناکرێ ، بە یەکەوە بنووسێنێتەوە . .

### سەرچاوەکانی ئەم باسە

1 – Principles of physics by : H. RASTALL 1969.
٢ مجلة العربي : العدد ٢٤٩ لسنة ١٩٧٩ وزارة الاعلام الكويتية
٣ – مجلة العلم والحياة : العدد ٢٥ لسنة ١٩٧٣ مديرية الرعاية العلمية العامة /العراق .
٤ – العلم والشباب : الاعداد : ٧٨ و ٨٠ و ٩٣ و ٩٤ مديرية الرعاية العلمية العامة العراق .

لە ئاسۆی هونەری جیهانیدا :

# ئەلیکساندر داینێکا

## هونەرمەندی مەزنی هونەری نیگارکێشانی سۆڤیەتی هاودەم

نووسینی : پرۆفیسور چیگادایف

وەرگێڕانو ئامادەکردنی لە ڕووسی‌یەوە :

محمد عارف

ئەرکی سەرشانی هونەرمەند ئەرکێکی یەکجار قورس‌و پیرۆزە . ئەوەیش دەربڕین‌و بەرجەستەکردنی جیهانی دەروونی‌و ڕوخساری مرۆڤ‌و ڕیتمی جموجۆڵی ژیان‌و کێشەکانی بوون‌و جوانی‌و ڕەنگینی سرووشتە . بۆیەش هونەرمەندی ڕاستەقینە ڕێگایەکی نەمری لە ژیان گرتووەو ڕۆڵی خۆی لە ژیانی هاودەم‌و دوا ڕۆژدا بینیوەو دەبینێ .

هونەرمەندی سۆڤیەتی هاودەم : (ئەلیکساندر ئەلیکساندرۆڤیچ دینێکا) . لەم جۆرە هونەرمەندانەیە . کە ئەم ئەرکە قورس‌و پیرۆزانەی باسکراویان هەڵگرتووە .

جیهانی دەربڕینی هونەرمەند . مەزن‌و فراوانەو زۆر شتی جۆربەجۆری چارەسەرکردوە وەك : ڕووداو . دیمەنی سرووشتی . سرووشتی هێمن . هێلکاری . گرافیك . هونەری دیواریی . پۆستەرو پەیکەرو شتی‌تر . . . ڕاستە ئاست‌و ستانداردی ئەو هەموو بەرهەمانە وەکو یەك نین‌و لە چەند بەرهەمێکدا کەم‌و کورتیەکی سرنج ڕاکێش هەیە . . . بەڵام ئەم ووردە شتانە ڕێی لە لافاوی مەزن‌و بەتەوژمی هێزی دەربڕینی هونەرمەندی بەهرەدار نەگرتووەو تەگەرەی بۆ تاقی‌کردنەوە هونەریی‌یە ئازایەکانی دانەناوە . لە ساڵی ١٩٢٤دا . (داینێکا)ی هونەرمەند لەگەڵ هونەرمەندان : (پیمینۆڤ . گانچارۆڤ . نیسکی . کوپریانۆڤ . ڤیلیامس‌و



وێنەیەکی فۆتۆگرافی (داینێکا) لە کاتی ئیشکردندا



دانیێکا . نیگاری : (بۆ ئەوەی بترۆگراد بیارێزین)

شیفرین) یەکێتی هونەرمەندانی ناو (ئۆست - OST) - یان دامەزراندوە ئەو یەکێتی‌یەی کە ڕۆڵێکی بەرزی لە چەسپاندن‌و پێش‌خستنی هونەری سوڤیەتی هاودەم بینیوە . . بەڵێ پاش تێپەڕینی ئەم هەموو ساڵانە ، ئەو هەموو ڕەخنەو نووسینە ساکارو ساویلکانەی دژی ئەم یەکێتی‌یە نووسراون ، شتێکی ناحەق‌و نارەوا دێنە بەر چاومان . نیگاری بەناوبانگی (دانیێکا) : (بۆ ئەوەی پترۆگراد بپارێزین) نموونەیەکی بەرزی هونەری قۆناغی گرنگی ناوبراوە . لەم نیگارەدا هەست‌دەکەین هونەرمەند زیرەکانە سوودی لە هونەری کۆنی ڕووسیاو هونەری ئەورووپای ڕۆژئاواو سەدەی ووریابوونەوە : (RENAISSANCE) بینیوە . بەڵام بە ڕێبازو ستایلێکی تایبەت بەخۆی پێش‌کەشی کردووە . بەشێك لە ڕەخنەگرەکان بەناحەق ناویان لە هونەرمەند ناوە (هونەرمەندی پۆستەر) ، بەلاّم (دانیێکا) وەلامێکی بەهێزی داوەتەوەو نیگاری : (مارشی چەپ)ی پیشان‌داوەو بەم جۆرە دەم کوتی کردوونە [1] . بەرزترین نیگارەکانی هونەرمەند لەم قۆناغەدا ئەم بەرهەمانەن : (لە بالکۆندا . دیمەنێکی سرووشتی ، مەلەوانی کچان‌و دایك) ، لە ڕاستی‌دا دوا نیگار بەنموونەیەکی هەرە بەرزی دەربڕینی دایکایەتی دەژمێردرێ‌و ناوبانگی نیگاری باسکراو وەك نیگارەکانی تری هونەرمەند زۆر دوورتر لە سنووری وولاّت تێپەڕیوە .

هونەرمەند لە ساڵی ١٩٣٥دا گەشتێکی هونەری بۆ فەرەنسە ، ئیتالیاو ئەمیرکا کردووەو زنجیرەیەك سکێچ‌و نیگارو گرافیکی بەنرخی درووست کردووە ، ئەم گەشتە ڕۆڵێکی دیاری لە فراوان‌کردنی ئاسۆی هونەریی (دانیێکا) بینیوە . لە نیگارە مێژوویی‌یە تازەکانی هونەرمەند لەم قۆناغەدا تابلۆی (نیکیتکا)یە ، کە دەربڕینی تاقی‌کردنەوەی یەکەم مرۆڤی رووس بۆ فرین بەرجەستە دەکات‌و هونەرمەند دامەزراندنێکی سەرکەوتووی مەنومێنتی بۆ دۆزیوەتەوە .

هونەرمەندی مەزن وەك جەنگاوەرێك بەشداری لە جەنگی جیهانی دووەم کردووەو بۆ پاراستنی نیشتمان سنگی خۆی داوەتە بەر گولله . لەم قۆناغە سەختەدا نیگاری هەرە بەناوبانگی : (لە پێناوی رزگارکردنی سیڤاستۆپول‌دا)ی درووست‌کردووە کە نموونەیەکی هەرە بەرزی قوتابخانەی (ریالیزمی سوشیالیستی) بەرجەستە دەکات‌و لە ئاسۆیەکی جیهانی‌دا ، لەگەڵ نیگاری مەزنی : (بۆ ئەوەی پترۆگراد بپارێزین) ناسراوەو لە زۆربەی ئەو پەرتووکانەی دەربارەی مێژووی هونەری جیهانی لە سەدەی بیستەمین‌دا نووسراونەتەوە ، چاپ‌کراون .

قۆناغی ئاشتی‌و درووست‌کردنەوەی ژیانێکی پڕ لە سەرکەوتن‌و هێمن‌و دڵنیایی پاش جەنگ ڕەنگدانەوەیەکی قوولی لە بەرهەمە بەرزەکانی هونەرمەند بینیوە . . . (دانیێکا)ش وەك هونەرمەندی گرافیکی مەزن (فاڤۆرسکی)و پەیکەرتاشی بەهرەدار (مووخینا) لە بەرهەمە تازەکانی بەردەوامەو لەهەمان کاتدا وەك مامۆستای هونەر [2] لە ئەکادیمیەی هونەرە جوانەکانی مۆسکۆ بەشداری‌یەکی گرنگی لە پەروەردەکردن‌و پێگەیاندنی نەوە تازەکان کردووە [3]

١ - هونەرمەند لەم نیگارەدا سروشی لە شیعرە بەناوبانگەکەی (مایکۆڤسکی) وەرگرتووە کە هەمان ناوی هەیە واتە : (مارشی چەپ) .

(٣) وەرگێڕی ئەم نووسینە دوا دوو ساڵی خوێندنی لە ستۆدیۆی (دانیێکا) خوێندوویەتی .

(٢) ئەم هونەرمەندە گەورەیە لەم ساڵانەدا کۆچی دوایی‌کردووە .



دانیێکا . نیگاری : (بۆ ئەوەی بترۆگراد بیارێزین)

وەرگێرانی : عطا فائق عثمان
زانکۆی موصل / کولیژی ئەدەبیات

## مۆسیقارێکی جیهانیو ئۆپێرا

# جۆزیف فێردی

جۆزیف فێردی بە مەزنترین دانەری موسیقای رۆمانسی دادەنرێت ، لە دانانی ...ۆگەری گۆرانیدا تایبەت مەندێتی وەرگرتووە ، هەمیشە ئەو چیرۆکو رۆمانو شانۆگەرییانەی هەڵدەبژارد کە نووسەرانی بە ناوبانگ دەیان نووسین .

فیردی لە گوندێکی بچکۆلانەی لادێکانی ئیتالیا بە ناوی (لارونسولیە) لە ساڵی ١٨١٣دا لە ئامێزی خێزانێکی جوتیاری هەژاردا چاوی بە دنیا هەڵهێناوە . لەوکاتەدا وولایەتەکانی ئیتالیا لە ژێر دەسەلاتی ناپلیۆن پۆناپارتی فەرەنسەدابوون ، لەبەر ئەوە هەر لە سالانی منداڵیەوە هەستێکی تەواوی شۆرشگێری باڵی بە سەردا کێشابەو . لە بوارێك دەگەرا هەتا ئەوەی لە ناخیدابوو ئاشکرای بکات . هەر لە سەرەتاوە بەهرەی مۆسیقای تیا دیاربوو ، لەبەر خراپی باری دارایی ناچاربوو بارێك لە گوندەکەی خۆیدا بکاتەوە بۆ بەدەست هێنانی پاروی ژیانیو بەردەوام بوونیشی لە فێربوونی زانستە مۆسیقیەکاندا . لە نێوان سالانی سیازدەو هەژدەی تەمەنیدا پێش ئەوەی لە شاری (میلانۆ) جێگیربێت زۆربەی دانراوە مۆسیقیەکانی نووسی ، ئەم دانراوانەش بریتی بوون لە سروودی نیشتمانیو پارچە مۆسیقای ئامێرە هەواییەکانو مۆسیقای ئۆرکستراڵیو ئاینیو هەندێ دیمەنی کورتی شانۆیی کە لە ماڵی ناسیارو مامۆستاکانیدا پێشکەشی کردوون . فیردی بازرگانی دەوڵەمەندی (خەمر) بارتیسی دەناسێ ئەویش دەستی یارمەتی بۆ درێژ دەکاتو دەرگای ماڵەکەی بۆ دەخاتە سەرپشت . فیردی دەگوازێتەوە ماڵی هاوریکەی لەوی ناسیاری لەگەل مارگریتی کچیدا پەیدا دەکاتو دڵە تینووەکەی بۆ سۆزو خۆشەویستی بۆ یەکەم جار دەست بەلێدان دەکات . فیردی لە قۆناغی دواناوەندی خوێندنیدا قوتابیەکی زیرەكو شەرمن بووە ، هەتا یەکێك لە مامۆستاکانی دەیەوێت بینێرێتە دێر بۆ ئەوەی ببێتە (راهب) . بەلام بارتیسی دژی ئەوە دەوەستێت . لە ساڵی ١٨٣٦دا فیردی بەشداری پێشبرکێیەکی بەربلاوی مۆسیقای کردو سەرکەوتنێکی چاکی تیا بەدەست هێنا تاوای لێکرد بچێتە ریزی کۆمەڵەی مۆسیقا دانەرانەوە . هەروەها لە هەمان ساڵدا کچی بارتیسی هاوریی خواستو شەش گۆرانی ئۆپێرایەکی تۆمارکرد ئەو ئۆپیرایەش یەکەمین ئۆپیرای بوو ناونرا (ئۆبرتۆ) . لە ساڵی ١٨٤٢دا ئۆپیرای (نەبوخوزنەسەر) لە سەر شانۆی (یانەی ئۆپیرای ئیسکالا)ی ئیتالیا تەواو نیشاندراو ناوبانگێکی جیهانی بۆ فیردی دروستکرد بە پێشوازیکردنی جەماوەر بۆ بینینی هەر لەو کاتەشدا گەلی ئیتالیا لە ژێر زەبرو زۆرو ستەمدا دەیان نالاند هەرچۆن لە چیرۆکی پاشای بابلو رۆژانی دیلکردنیەوە بیری ئۆپیراکە هاتبوو . فیردی بەم ئۆپیرایەو بە ئاوازو ئیقاعە بە جۆشو شۆرشگێرەکەی کە توانایەکی بێسنووری هەبوو توانی گوزارشتی تەواوی ئەو زۆرو ستەمە بکات ، ناوبانگی فیردی جیهانی گرتەوەو پولو پارەی بەسەردا باری ، پاش ئەوەی (٣٠٠٠) لیرەی نەمساوی لە ئۆپیرای نەبووخوزنەسەر دەستکەوتو نرخی ئۆپیراکەش بە شێوەیەکی بێوێنە بەرز بووەوە تاپاش

ماوەیەکی کورت گەیشتە (۲۰٬۰۰۰) لیرەی ئاڵتونی نەمساوی .

لەساڵی ١٨٤٥ فیردی کچە گۆرانی بێژی ئۆپێرا (جوزفینا) دەناسێت کە بەهاری نۆزدەهەمی تەمەنیدا دەبێت ، پەیوەندی هاوسەری لەگەڵ مارگرێتدا بەرەوگێژاو دەچێتو پاشان تەلاقی دەداتو جوزەفینا دەخوازێتو دەگوازێتەوە بۆ شاری (تۆرینۆ)و پاشان بۆ (ژنوا) ، لێرەوە قۆناغی دووەمی ژیانی مۆسیقی فیردی دەستپێدەکات کە بەرهەمدارترین قۆناغەو چەندین ئۆپێرای داناوەو کە هەموویان لە ریزی ئۆپێرا بە ناوبانگە جیهانییەکانی فیردی دادەنرێن ، کە هەتا ئێستا زیندوونو لەسەر شانۆکانی جیهان پێشکەش دەکرێن ، هەموو ئەم ئۆپێرایانە بەسۆزی رۆمانسی شۆرشگێرانە بە ناوبانگن ، وەکو ئۆپێرای (لومباردیف) و (جەنگی لینیایۆ) و ئۆپێرای (ئارنانی)ی ڤیکتۆر هیگۆی نووسەرو ئۆپێرای ماکبێثی – Macbeth)ی شکسپیرو ئۆپێرای (ریگولێتو)و (غادە کامیلیا)و ئۆپێرای (تەروادە) کە چیرۆکێکی بەناوبانگی مێژوویی درامی رۆمانتیکییە ، وە ئۆپێرای (ئاهەنگ خۆگۆرین)و (کۆتایی گەورەیی)و پاشان ئۆپێرای (عایدە) .

فیردی بۆ ماوەی چەند ساڵێك لە دانانی مۆسیقا دوورکەوتەوە پاشان جارێکی تر دەستی پێکردەوە ، لێرەوە قۆناغی سێیەمی ژیانی مۆسیقای دەستپێدەکات ، ئۆپێرای (ئۆتێللۆ – Othello)ی شکسپیری دانا ، پاش ئەوەش ئۆپێرای (فالستاف)ی بە دوادا دانا کە لە بارەی چیرۆکی مەلیکی ئینگلیزەوە (هێنری چوارەم)و ژنە بەختەوەرەکانی کۆشکی (وندزر)ەوە دەدوێت ، ئەم ئۆپێرایە بە تەواوی لە ئۆپێراکانی پێشووی فیردی جیاوازە بە مۆسیقا کۆمیدییە پێکەنیناویە ناسكو هەلوێستە کۆمیدییە شاعیریەکەی بە ناوبانگە .

فیردی بە خاوەن توانایەکی بەرزی شۆرشگێری ناسراوە ، جارێکیان ئەو نازناوە رەت دەکاتەوە کە یەکێك لە پاشاکان دەیەوێت پێی ببەخشێت ، فیردی نارەزایی دەربریو ووتی کارە هونەرییەکانی لە خودی خۆیانا نازناوێکن لە نازناوەکانی شەرەف – جارێکیان یەکێك لە هاورێکانی پرسیاری لێدەکات لە بارەی باشترین کاری هونەرییەوە بە پێی تێروانینی خۆی ، بەلام ئەو وەلامی دەداتەوە (باشترین کاری من ئەو خانووەیەکە بۆ مۆسیقارە کلۆلەکانی میلانۆم بنیات ناوە) . فیردی لە ساڵی ١٩٠١دا گیانی بە خاك سپارد ، سامانێکی مەزنی هونەری بەجێهێشت ، فیردی بە دڵسۆزترین هونەرمەند دادەنرێت بۆ هونەرەکەیو بۆ رۆڵەکانی گەلەکەیو خەباتگێرێکی مەزنی داواکاری راستیو یەکسانیو ویژدانە ، لەو کۆمەڵە ئۆپێرایەی کە جارێ بە شێوەی گاڵتەجاری کۆمیدیو جارێکی تریش بە شێوەی شۆرشگێرانەی بە هێزو دواجاریش بە شێوەی ئەندێشەی درامای تەرازیدی لە شێوازێکی رۆمانسیانەدا دایناوون .

**لە بەناوبانگترین ئۆپێراکانی فیردی**

**١ – ئۆپێرای ریگۆلیتۆ**

لە راستیدا ئەم ئۆپێرایە لە چیرۆکی (مەلیك رادەبوێرێت)ی ڤیکتۆر هیگۆ وەرگیراوە کە باسی چیرۆکی مەلیکی سەرگەرمی رابواردنو کۆیلەی ئارەزووەکانی دەکات ، بۆ پاڵنانی برێکی زۆر بۆ خزمەتکاریو گاڵتەجاری کۆشکی ریکۆلیتۆ تاکو هەموو کیژۆڵە جوانو شۆخەکانی شاری بۆبهێنن ، بەرێکەوت رۆژێ مەلیك فەرمان دەدات بە هێنانی کچە نەشمیلانەکەی ریکۆلیتۆ بۆ ناو کۆشك بێ ئەوەی بزانێت کە کچی ئەوە ، ریکۆلیتۆ بریار دەدات مەلیك بکوژێت لە شەوی کۆبوونەوەدا . لە کۆتایی ئۆپێراکەدا ریکۆلیتۆ دەبینرێت یەکێك دەکوژێت بروا وایە کە مەلیك بێت ، بەلام کاتێ سەرنجی کوژراوەکە دەدات دەبینێت کچەکەی خۆیەتی لەبەر ئەوە عەقڵی تێك دەچێتو شێت دەبێت ، ئەم ئۆپێرایە بێمو بالاتیو زوڵمو زۆری کۆشکی مەلیکانو ئەوانەی سەرگەرمی رابواردنو بیر لە ژیان ناکەنەوە نیشان دەدات ، لە فەرەنسەدا نیشاندانی ئەم ئۆپێرایە قەدەغە کراو پارتە کۆنەپەرستەکان دژی وەستان چونکە راستەو خۆ روو بەرووی مەلیكبوو . میری نەمساوی لە سەر پیشاندانی ئەم

ئۆپیرایە لە سنووری وولاتەکەیدا رازیبوو ئەمەش لە سەرەتای ساڵی ١٨٣٠دا بەڵام میری فەرەنسا داوای لە فیردی کرد کە دیمەنو رووداوەکانی ئۆپیراکە بگۆرێت فیردیش بەوە رازی نەبوو بەڵکو سووربوو لەسەر پیشاندانی ئۆپیراکەی بێ دەستکاریکردن جگە لە گۆرینی ناوەکەی لە (مەلیك رادەبوێرێت بۆ ئەمیر رادەبوێرێت) .

**٢ — ئۆپیرای لاتراڤیاتا**

ئەم ئۆپیرایە وەرگێرراوەتە سەر زمانی عەرەبی بە ناوی (غادە کامیلیا) کە نووسەری بە ناوبانگ ئەلکسەندەر دۆماسی بچوك (١٨٢٤—١٨٩٥) نووسیوویەتیو یەکەم جاریشی لە ٦ی مارسی ١٨٥٣ لە شاری ڤینسیا پیشاندراوە ، بەڵام ئەم پیشاندانە سەرکەوتنی بە دەست نەهێنا ، بە تێپەربوونی کاتی ئەم ئۆپیرایە بوو بە بەناوبانگترین ئۆپیرا جیهانییەکانی فیردی . چیرۆکی ئۆپیراکە لە بارەی شۆخە کچێکی لاوەوەیە کە کورێکی خۆش دەوێت لە ئاستێکی کۆمەڵایەتی بەرزتر لە خۆی کۆمەڵو عاداتو تەقالید دەیچەوسێننەوەو جیاوازی دەخەنە نێوانیانەوە کیژۆڵەکە لە ئازاری خۆشەویستەکەیدا گیانی دەسپێرێت . ئەم ئۆپیرایە مژدەی شۆرشێکی کۆمەڵایەتی دەبەخشێت ، چونکە رەخنە لە عاداتو تەقالیدی کۆن دەگرێتو بیری بۆگەنی بۆرژوا گەورەکان ئاشکرا دەکات ، مۆسیقای ئەم ئۆپیرایە پرە لە سۆزی قوڵو دیمەنی جۆراوجۆری یاری بالیاو گۆرانیو کۆراڵ .

**٣ — ئۆپیرای ئاهەنگی خۆگۆرین (Masquerade)**

ئەم ئۆپیرایە بۆ یەکەمجار لە ١٧ی فێبریەی ١٨٥٩دا پیشاندرا ، چیرۆکی ئۆپیراکە (ئۆجین سکریب) نووسیوویەتی کە دەربارەی پادشای سویدی گوستانی سێیەمو کوشتنییەتی لە ئاهەنگی خۆگۆریندا کە لە هۆڵی یانەی ئۆپیرای ستوکهۆلم پێشکەشکرا .

لەم ئۆپیرایەدا بەرزی توانای فیردی دەردەکەوێت بە پەخش کردنی جوانکاری لەدانانو دابەشکردنی مۆسیقا بەسەر ئامێرە ئۆرکسترالییەکانو دەنگە ئۆپیرالییە تاکو کۆمەڵەکانداو پەیرەوکردنی باشترین تەکنیك لە ئاواز داناندا .

**٤ — ئۆپیرای عایدە**

ڤیردی ئەم ئۆپیرایەی لەسەر خواستی «خدێوی» ئیسماعیل دانا بە بۆنەی کردنەوەی نۆکەندی سوێسەوە ، یەکەم جار لە قاهیرە لە ساڵی ١٨٧١دا پیشاندرا . فیردی نەیتوانی ئامادەی ئاهەنگی کردنەوەی بێت بە هۆی تووشبوونی بە نەخۆشییەکی کوتوپر . چیرۆکی ئۆپیراکە (جییز لانسونی) نووسیوویەتی کە تایبەتە بە مێژووی میسرو لە رووداوەکانی نێوان (ممفیسو طیبە)ی سەردەمی فیرعەونەکان دەدوێت کە راستییەکەی چیرۆکی (عایدەی بەندییە) ئەمەش بەمەزنترین ئۆپیرای کلاسیکی فیردی دادەنرێت کە گۆرانکاری تەکنیکی گەورەی تێدایەو دیمەنەکانیشی لەوپەری جوانیدایە . مەودای بیرو ئەندێشەی مۆسیقاری مەزن نیشان دەدات .

**٥ — ئۆپیرای ئۆتێللۆ Othello .**

پاش ئەوەی فیردی چەند ساڵێك لە دانانی مۆسیقا دوورە پەرێز وەستابوو شانۆگەری بەناوبانگی شکسپیر «ئۆتێللۆ»ی گۆری بۆ ئۆپیراو یەکەم پیشاندانی لە ٥ی فیبریەی ١٨٨٧دا بوو لە شاری (میلانۆ) بەرزترینو بەناوبانگترین دیمەن لەم ئۆپیرایەدا ، دیمەنی گێژەڵوکەیە کە بینەر واهەست دەکات گێژەڵوکەکە بەراستی هەڵدەکات بە بەرز بوونەوەی دەنگی ئۆکسترالیو گۆرانیەکان . تەکنیکی شانۆ بە دیکۆرێکی مەترسی — دارو گۆرانی تیپی کۆراڵ کە خەڵکەکە بە جموجوڵی ترسێنەرو شەڵەژاو لە کەشتیدا دەینوێنن ، لەم ئۆپیرایەدا فیردی وەکو نووسەری شانۆی شکسپیر گەیشتە لوتکە لە داهێنانی هونەری مۆسیقادا .

ئەمباسەیە لە :
گۆڤاری الاذاعە والتلفزیون
العدد ٢٥٥—١٩٧٨
ص ص ٤٤—٤٥
وەرگێراوە

# پەیدابوون و گرنگی

# رۆژی جیهانی شانۆ

لێکۆڵینەوەیەکە لە ئامادەکردنی : سامي عبدالحميد

وەرگێرانی : ئازاد مولود خدر

**پێشەکی :-**

خەلکی لەوە راهاتوون کە گەلیٚ جار هەولێکی زۆر بدرێت بۆ ئاهەنگ گێران بە یەکیٚ لە بیرە بەرزەکان لەسەر ئاستی هەموو جیهان ، بەلاّم ئەبینین بە پێچەوانەی ئەو هەولانە بیرۆکەی دان‌نان بە رۆلّی شانۆ لە چەند وولاّتێکدا بە یەك‌جار مانایەکی زۆر بە خۆیەوە هەلّدەگریٚ ، هۆی ئەمەش ئەوەیە کە شانۆ رۆژێك لە رۆژان لە جیهانی‌یەتی خۆی دوور نەکەوتۆتەوە .

بەم ووشانەی کە لەوە دەچن زۆربەی زۆریان زانرابن

ئارسەر میللەری نووسەری شانۆ بەبۆنەی

ئاهەنگ گێران لە رۆژی جیهانیی شانۆی سالّی ١٩٦٦ لە بری مەلّبەندی نێو دەولّەتانی شانۆ نامەکەی پێشکەش بە جیهان‌کرد .

شانۆویستەکان‌و خەلکی تریش لە گەلّیاندا کە بە بۆنەی ئەم رۆژەوە ، ئاهەنگ دەگێرن ئەوە دەگەیەنیٚ کە ئاهەنگ گێرانی‌یانە بۆ مرۆڤایەتی‌و بیرو خووو رەوشت‌و کەلّەپووری‌یەتی‌یە . بۆیەش ئاهەنگ گێران بە بۆنەی رۆژی جیهانیی شانۆ لە هەموو ئاهەنگێك زیاتر مۆرکی گشتی‌و بە خۆوەگر هەلّدەگرێت . ئەوە خۆی لە خۆی‌دا ئاهەنگ گێرانە بە رۆژی منالاّن‌و رۆژی ئافرەتان‌و رۆژی ئەدەب‌و رۆژی هونەرو سەرباری هەمووشیان رۆژی مرۆڤ . ئەوەی جێگای شانازیشە ئەم ئاهەنگە نرخێکی گەورەترو قوولّتر دەبەخشێتە هونەری شانۆو ئەوانەی لەم بوارەدا کاردەکەن لە کۆمەلّی هاوچەرخمان کە رۆژ لە دوای رۆژ رۆلّی شانۆی لە هاوبەشی رۆشنبیری‌و

شارستانیەتدا تیا بەدیار دەکەوێ .

**چۆن بیرۆکەی ئاهەنگگێران سەری هەڵدا** :-

مەڵبەندی شانۆی نێو دەوڵەتان بیرۆکەی ئاهەنگ گێرانی رۆژی جیهانی شانۆی پەسەندکرد لەوکاتەی لە ساڵی ١٩٦١ بریاریدا کە رۆژی بیستو حەوتی ئازار لە هەموو ساڵێکدا تەرخان بکرێت بۆ ئەوەی هەموو مەڵبەندو دەستە شانۆییەکان لە جیهاندا ئاهەنگی تیابگێرن بە بانگکردنی خەڵك بۆ دیتنی شانۆگەریەکان بە خۆرایی و ئامادەبوونی کۆرو ووتار خوێندنەوەو سەردانی پێشانگای هونەری پەیوەندیدار بە بابەتەکە کە لەلایەن دامو دەزگاکان پێشکەش دەکرێن ، ئەم رۆژەش بە تایبەتی بۆیە تەرخانکرا چونکە رۆژی دامەزرانی شانۆی میللەتانە لە پاریس کە یەکێك بوو لە ئامانجەکانی مەڵبەندی شانۆی نێو دەوڵەتان .

بە پێویستیشی دەزانین لێرەدا خوێنەری بەرێز شارەزای ئەم دەستە جیهانییە بکەین کە ئاهەنگگێرانی ئەم رۆژەی پەسەندکردوو هانی رێکخستنیدا . ئەو دەستەیەی کە بنچینەیەکی ئیجابی دانا لە بەرگریکردن لە شانۆ کە لە رابووردودا بەدەست ئەوەوە دەینالاند کە هەرگیز بە یەکێ لەرووە سەرەکییەکانی رۆشنبیری جیهان نەدەژمێردراو بە یەکێ لە هەرە بەهێزترین هۆیەکانی بەرپاکردنی ئاشتی لە نێوان گەلاندا دانەنرا .

لە ماددەی یەکەم لە پەیرەوی مەڵبەندی شانۆی نێودەوڵەتاندا هاتووە :

«چونکە هونەری شانۆ دەربرینێکی جیهانیی رەگەزی مرۆڤەو هێزو کاریگەرییەکی ئەوتۆی هەیەکە گەلان بەیەك ببەستێتەوە تاکو بە دۆستایەتی بە یەکەوە بژینو بیانخاتە خزمەتی ئاشتی بۆیە دەستەیەکی جیهانی پێك هات لە ژێر ناوی مەڵبەندی شانۆی نێو دەوڵەتان» .

ئەم مەڵبەندە لە شاری پراگ لە رۆژی ٢٨ی حوزەیرانی ١٩٤٨ دامەزرا ، بە پێی راگەیاندنی ئێژنەی ئەدەبو هونەری سەر بە رێکخراوی یۆنسکۆ کە ئەوکاتە لەم نووسەرو هونەرمەندانە پێك هاتبوو (فرانسو مۆریاكو ژۆن بریستلیو ئەرشیبالد ماکلیش) هەروەها نووسەری ئینگلیزی ژۆن بریستلی کارلێ بە سەرۆکی مەڵبەندەکە دانرا بەرلەوەی بارەگاکەی بگوازرێتەوە پاریس .

یەکێ لە ئامانجەکانی ئەم مەڵبەندە هێنانەدی ئاڵوگۆری نێوان دەوڵەتانبوو لە بارەی زانیاریو پێ هەڵسانی کاروباری شانۆ ئەمیش لە رێگای دامەزراندنی مەڵبەندی نیشتمانی لە هەموو وولاتانی جیهان . ئەم مەڵبەندانە زانستو زانیاری دەربارەی جوولانەوەی شانۆ لە وولاتەکانیان دەگەیەننە مەڵبەندی سەرەکی هەروەها مەڵبەندی نێو دەوڵەتان هاوکاری لەگەڵ مەڵبەندە نیشتمانییەکان دەکا لە لادانی هەموو ئەو کۆسپانەی دێنە رێگای گۆرینەوەی تیپە شانۆییەکانو رێگای هاتووچۆو گواستنەوەیان بۆ هەموو جیهان ئاسان دەکاو هەروەها لابردنی هەموو تەگەرەیەك کە رێگای پێشکەوتنی شانۆ دەگرێت وەکو هەلگرتنی باجو نەهێشتنی (رقابە) لە سەر شانۆو جموجۆڵی شانۆییو پێشکەشکردنی یارمەتی هونەریو دارایی کە لە تواناداییێ بۆ شانۆی وولاتە تازە پێگەیشتووەکان . هەروەها مەڵبەندی نێو دەوڵەتان یارمەتی ئەو کەسانە دەدات کە ئارەزوویان لە خوێندنی شانۆیە لە دەرەوەی وولاتی خۆیانو دەتوانین گرنگترین ئەو کارانەی مەڵبەندی نێو دەوڵەتان لە سالانی سەرەتای دامەزرانییەوە پێی هەڵساوە بەم شێوەیە کورت بکەینەوە :

١ - دامەزراندنی پتر لە پەنجا مەڵبەندی شانۆی نیشتمانی .
٢ - دەرکردنی فەرهەنگێکی جیهانی بۆ زاراوە شانۆییەکانو بەهەشت زمان .
٣ - دەرکردنی گۆڤاری (شانۆی جیهانی) بە هەردوو زمانی فەرەنسایی و ئینگلیزی .
٤ - دامەزراندنی شانۆی میللەتان لە پاریس کە لە ساڵی ١٩٥٧دا کرایەوە .
٥ - ئاهەنگ گێران بە بۆنەی رۆژی شانۆیی جیهانی لە بیستو حەوتی ئازاری هەموو ساڵێك .
٦ - وەرگێرانو لە چاپدانو دابەشکردنی هەندێ شانۆنامەی هەڵبژاردە بەسەر هەموو مەڵبەندە شانۆییەکان .
٧ - سازکردنی پێشبرکێ بۆ نووسینی شانۆنامە لە هەندێ وولاتان .

مەڵبەندی میسریش یەکەم مەڵبەندبوو کە لە وولاتە عەرەبەکان دامەزری‌و هەر لە دامەزرانی‌یەوەو تائێستاش نووسەری گەورە توفیق الحکیم سەرۆکایەتی دەکا ، هەمان شێوە مەڵبەندیش لە تونس‌و مەغرب دامەزراو پاشانیش لە لوبنان‌و سوریاو عیراق .

لە پێناو هێنانەدی زمانێکی هاوبەش لە نێوان ئەوانەی لە بواری شانۆکار دەکەن مەڵبەندی نێو دەوڵەتان فەرهەنگێکی جیهانی بۆ شانۆ ئامادەکردووەو ئومێد وایە بەم زووانە دانەیەکی بەزمانی عەرەبیش لێ لە چاپ بدرێت .

هەرچی گۆڤاری (شانۆی جیهانی)یشە ئەوە ئێستا دوو مانگ جارێك دەردەچێ کە پڕە لە ووتارو لێکۆڵینەوەی رەخنەیی‌و چاوپێکەوتن‌و دەنگ‌و باسی جموجۆڵی شانۆ لە جیهاندا بە وێنەو نەخشەو نیگارەوەو زۆر جاریش ژمارەی تایبەتی پێ دەرچووە وەکو ژمارەیەك بە شانۆی برێشت‌و ژمارەیەکی تایبەت بە شانۆی سۆڤیەتی‌و هەر ژمارەیەك لەم گۆڤارە زێتر لە حەفتاو پێنج هەزار دانەی لێ بلاو دەکرێتەوە .

دەرهێنەری هونەرمەند (فیرمین ژێمی) هەوڵێکی یەگجار بێ پایانی‌دا بۆ دامەزراندنی شانۆی میللەتان لە پاریس‌و داچاندنی یەکەم دەنکەتۆوی دەگەرێتەوە بۆ ساڵی ١٩٢٧ کە یەکەم پرۆگرامی جیهانی رێکخرا لە شانۆی «شانزیلیزێ» کەچی پرۆژەکەی ئەوکات راوەستا . لە کۆنگرەی دووەمی مەڵبەندی شانۆی نێو دەوڵەتان کە لە ساڵی ١٩٤٩ لە زیوریخ گرێدرا بریاری دووبارە دامەزراندنەوەی شانۆی میللەتان درا ، بەلام ئەم بریارە جێبەجێ نەکرا تاساڵی ١٩٥٧و بە یارمەتی میری فەرەنسا .

هەموو ساڵێك تیپی جۆراوجۆر لە هەموو جیهانەوە هاوبەشی لەم شانۆیە ئەکەن‌و شانۆگەریەکانیان بە پێنج زمان پێشکەش دەکەن‌و دەماودەم وەردەگێردرێنە سەر زمانەکانی تر . هەروەها ئامۆژگایەکی هونەریش هەیە کە سەر بەم شانۆیەیەو تەرخان‌کراوە بۆ خوێندنی هونەرەکانی شانۆو ناونراوە بە زانکۆی شانۆی میللەتان ، ئەم [illegible]یە ئەو قوتابی‌یانە دەگرێتەخۆی کە لە رێگای مەڵبەندە نیشتمانی‌یەکانەوە نێردراون بۆ خوێندنی هونەری شانۆ بە هەموو لایەنەکانی‌یەوە .

مەڵبەندی نێو دەوڵەتان هەڵساوە بە وەرگێڕان‌و لە چاپ‌دان‌و بلاوکردنەوەی زۆر شانۆنامەی هەڵبژاردەو بەسەر هەموو مەڵبەندەکانی جیهان بۆ ئەوەی سوودیان لێ‌وەربگیرێ‌و شەش شانۆنامەی ئاسیایی وەرگێردراوەتە سەر زمانی ئینگلیزی‌و فەرەنسایی‌و بەسەر شانۆ سەرەکی‌یەکانی جیهان پەخش‌کراوە .

لە بۆمبای‌و تۆکیۆو پاریسیش هەندێ لە پسپۆرەکان کۆبونەوە بۆ لێکۆڵینەوەی باری شانۆکان لە ئاسیادا لە دوو لایەنی جیاوازەوە . هەڵسەنگاندنی جوولانەوەی هاوچەرخ لە شانۆدا لەلایەك‌و لەلایەکی‌تریش پارێزگاری‌کردنی شانۆی ئاسایی . لە ئەفریقیاش گەشت‌و گەرانی هونەری رێکخراو هەندێ یارمەتی بەخشرا بە شانۆ تازەپێگەیشتوەکان . لە ئەمەریکای لاتینیش هەندێ لە مەڵبەندە نیشتمانی‌یەکان لە رێکخراوێکی جیهانی‌دا کۆبوونەوەو ناونرا بە (مەڵبەندی شانۆی ئەمەریکای لاتین) .

وەگرنگترین کاری کە مەڵبەندی نێو دەوڵەتان پێ‌ی هەڵسابێ دانانی پێشبرکێ‌بوو بۆ نووسینی شانۆنامە لە هێندێك وولاتاندا ، لە ئەمەریکای لاتین دوو پێشبرکێ سازکرا بۆ هەڵبژاردنی چاکترین شانۆگەری هاوچەرخ . هەر بە هاندانی مەڵبەندی ناوبراو لە ساڵی ١٩٦٨ پێشبرکێ‌یەك سازدرا بۆ شانۆی عەرەبی لە رێگای مەڵبەندە نیشتمانی‌یەکانەوەو زۆر شانۆنامە دەست‌نیشان‌کران بۆ هاوبەشی‌کردن لەم پێشبرکێ‌یە لەلایەن چەند لێژنەیەك کە بۆ ئەم مەبەستە پێك هێنرابوون . لێژنەی عیراقیش لە بەرێزان شازل تاقەو خالد شەوواف‌و زەکی جابرو ئیبراهیم جەلال‌و سامی عەبدول حەمیدو عەبدوللا نیازی پێــــك هاتبـــوو ، ئەو نووسەرانەی هاوبەشـــی پێشبرکێ‌یەکەیان‌کردبوو داوود سەللوم بە شانۆنامەی (الاسکندر ذي‌القرنين) وعادل کازم بە شانۆنامەی (تموز يقرع الناقوس)و تەها سالم بە شانۆنامەی (مامعقوله) و جەمیل جبوری بە (بنات الناس)و مەهد سەماوی بە (سرجون الاكدي)و فوئاد تەکرلی بە (الصخرة) بەشداریان کردبووو لە ئەنجامدا شانۆگەری (تموز يقرع الناقوس) بە یەکەم دەرچووو (الصخرة) بە دووەم‌و یەکەمیان دەست نیشان‌کرا بە ناوی عیراق هاوبەشی پێشبرکێ بکات هەروەها (الزوبعه)ی مەحموود دیاب لە میسرو

(سعد)ی ئەحمەدتەیب لەمەغریبو (للباطل جولة)ی مەحمود عابدی لە ئەردەنو (جاد)ی ئەنتەوان مەعلوف لە لوبنانو (حفلة سمر في خمسة حزيران)ی سەعدوللا وەنوس لە سوریا هاوبەشیانکرد . پاشان لێژنەی دادوەران لە قاهیرە کۆبۆوە کە لەلایەن عیراقەوە یوسف ئەلعانیو جەعفەر ئەلسەعدی تیابووو لە ئەنجامدا شانۆگەری (الزوبعة) بە باشترین شانۆگەریو (جاد) بە پلەی دووەم دەرچوون .

**مەڵبەندە نیشتمانی‌یەکانی شانۆ :-**

لەم ساڵانەی دوواییدا ژمارەی مەڵبەندە نیشتمانی‌یەکان پتربوو دوای ئەوەی کە شانۆ ویستەکان هەستیان بە گرنگی بوونی دەستەیەك کرد کە دەنگو باسیان بگەیەنێتە جیهانی دەرەوەو جموجۆڵی شانۆ ویستەکانی تریان بۆ بگواستەوەو پەیوەندی نێوانیان لەگەڵ شانۆ جیهانی‌یەکان پتەو بکات .

مەڵبەندە نیشتمانی‌یەکانیش لەو لێژنانەی راپەراندن پێك دێت کە چەند ئەندامێکی بە جموجۆڵی یەکێتیو تیپو دەزگا شانۆیی‌یەکان دەگرێتە خۆ لە پیشەدارو ئارەزوومەندان ئەم لێژنانەش دەستەی کارگێری هەڵدەبژێرن بۆسەرپەرشتی‌کردنی کاروباری مەڵبەندەکەو ئەم دەستە کارگێری‌یانەش سکرتێری گشتی مەڵبەندەکە هەڵدەبژێرن ، دەستەی کارگێریش بۆی هەیە کە کۆمەڵە گشتی‌یەکان کە لە کۆمەڵی ئەندامان پێك دێت بانگ‌بکا بۆکۆبوونەوەی ساڵانە دوو یان سێ‌جار هەر ساڵێك .

جموجۆڵەکانی مەڵبەندە نیشتمانی‌یەکان دەکرێتە دوو بەش :-

أ - جموجۆڵە نیشتمانی‌یەکان وەکو بەستنی کۆنگرەو کۆڕی شانۆییو کردنەوەی پێشانگای دیکۆری شانۆو بەرهەمە شانۆیی‌یەکانو هاوبەشی‌کردن لە بەرەوپێش بردنی جوولانەوەی شانۆیی لە وولاتو دەست‌پێشخەری‌کردن بۆ لادانی ئەو کۆسپانەی رێگای ئەو بەرەو پێش‌چوونە دەگرنو کارکردن لە پێناو کەم‌کردنەوە یاخود نەهێشتنی باج - هەروەکو لەم دواییەدا لە عیراق رووی‌دا - و کۆکردنەوەی یارمەتی بۆ هەندێ تیپو کارکەرانی شانۆ کە پێویستی دارایی‌یان هەیە بۆ بەرهەم هێنان یاخود تەواو کردنی خوێندنیان . هەروەها هەڵدەستێ بە کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی جموجۆڵی شانۆ لەوولاتداو پەخشنامە بۆ ئەم مەبەستە لە چاپ دەداتو دەیگەیەنێتە مەڵبەندی سەرەکی ، و هەڵدەستێ بە بەهەرمێن‌کردنی بەرهەمی چاپکراوی شانۆییو هونەری ، ئەمانە سەرەرای سەرپەرشتی‌کردنی ئاهەنگ‌گێرانی رۆژی جیهانیی شانۆ و رێکخستنی .

ب - جموجۆڵە نێو دەوڵەتی‌یەکان وەکو هاوبەشی‌کردن لە کۆبونەوەکانی مەڵبەندی نێو دەوڵەتان و کۆبونەوەی نێو دەوڵەتی‌یەکانی تری تایبەت بەکاروباری شانۆو هەروەها یارمەتی لە تواناادا پێشکەش بە شانۆی وولاتانی تر دەکاتو هەوڵی ساناکردنی گۆڕینەوەی تیپە شانۆیی‌یەکان دەداو میوانداری ئەندامانی مەڵبەندی نێو دەوڵەتانو شانۆویستە ناسراوەکان دەکا هەروەها مەڵبەندە نیشتمانی‌یەکان ئەندامانی خۆیان ئاگاداری جموجۆڵەکانی مەڵبەندی سەرەکی دەکەن . لە بارەی دارایی‌یشەوە مەڵبەندە نیشتمانی‌یەکان لە هەڵسوراندنی کاروباری خۆیان پشت بەو یارمەتی‌یە دەبەستن کە لەلایەن میری‌یەوە لە وەزارەتەکانی پەروەردەو رۆشنبیریو راگەیاندن بۆیان‌دێت یاخود لە ئابوونەی تیپو دەزگاو ئەندامانی .

**مەڵبەندی عیراق شانۆ :-**

کۆنگرەی پێنجەمی خوانی بازنەیی دەربارەی (شانۆو سینەماو تەلەفزیۆنو رادیۆ لە رۆشنبیری عەرەبی هاوچەرخدا) لە بەیروت بەسترا لە ۳۰ تشرینی دووەمی ساڵی ۱۹۶۷ بە هاوکاریو لەژێر چاودێری رێکخراوی یونسکۆ کە تیایا نێراوانی شانۆو سینەما لە زۆربەی وولاتانی عەرەبی هاوبەشیان تێداکرد ، لەوانەش عیراق .

کۆنگرەکە یەکێ لە دانیشتنەکانی تەرخانکرد بۆ باس‌کردنو لێکۆڵینەوەی گرنگترین ئەو کۆسپانەی دێنە رێگای نەش‌و نماکردنی شانۆی کراو بە پیشە لە وولاتانی عەرەبیو دیارکردنی ئەو چارەسەری‌یانەی کە لە لایەن هەندێ لە نێراوەکان پێشکەش‌کران .

لەم کۆسپانەش نەبوونی بەڵگەنامەیەك بۆ دابین‌کردنی پەسەندکردنی ئەو شانۆگەری‌یانەی کە لە توانایاندایە خەڵکێکی زۆر بۆ لای‌خۆیان رابکێشن . بۆ ئەمەش کەوا هەموو لایەك بگەرێن بەدوای دەق شانۆیی ئاسایی کەدەست‌بدات بۆ شانۆ

دەستی نووسەرە تازەپێ گەیشتووەکان بگیرێو چارەسەرێکی گیروگرفتی زمانی عەرەبی پەتیو گشتی لە شانۆدا بکرێت . یەکێ لە کۆسپەکانی تریش نەبوونی جەماوەرێکی ئەوتۆیە کە تامو چێژ لە شانۆ وەرگرێ بۆ چارەسەری ئەمەش بریاردرا لە ئارەزووو پێویستی‌یەکانی ئەو جەماوەرە فراوانە بکۆڵد رێتەوە کە چینە میللی‌یەکانی لیٚ پێك دێتو هامووشۆی شانۆ ناکەن . هەروەها کۆنگرەکە لەوەی کۆڵی‌یەوە کە چۆن شانۆی کراو بەپیشە پێك بهێنریٚ لە رێگای هەڵبژاردنی نیمچەپیشەدارەکانو گۆرینی ئارەزوو مەندانبۆ پیشەدارو دانانی تیپی شانۆیی‌و بانگ‌کردنی شارەزایانی بێگانەو دامەزراندنی ئامۆژگای نواندن . هەروەها کۆنگرەکە باسی پێك هێنانی مەڵبەندی نیشتمانی‌کرد لەو وولاٚتانەی کە ئەم مەڵبەندانەیان لیٚ نی‌یەو بەرێز ژان‌دارکانت سکرتێری گشتی مەڵبەندی نێو دەوڵەتان کۆرێکی تایبەتی تەرخان‌کرد بۆ ئەوەی پێویستی‌و چۆنی‌یەتی پێك‌هێنانی مەڵبەندە نیشتمانی‌یەکان بۆ نوێنەران روون بکاتەوەو هانی ئەوەی دان کە دەست‌پێشخەری زۆر پێویستە بۆ ئەوەی هەر لەگەڵ گەرانەوەیان هەرکەسەو بۆ وولاٚتی خۆی لقی تیا بکەنەوە ، ئەمەش لە دوا دانیشتنەکان بریاری لەسەر درا .

ئێمەش خێرا هەموو کارگەرانی بواری شانۆمان لە عیراق بانگ‌کرد بۆ بەستنی کۆبونەوەیەك بۆ ئەم مەبەستە لە رۆژی ١٩٦٧/١٢/٩ ، کۆبونەوەکان بەردەوامبوونو گفتوگۆو مشت‌ومر گەرمبووو هەڵوەشایەوە بیٚ ئەوەی هیچ بریارێك وەربگیریٚ . کەچی دوای ئەوە دەزگای سینەماو شانۆ هەڵسا بە دامەزراندنی مەڵبەندی عیراق بە فەرمانێکی وەزاری لە ١٩٦٩/١/٥ کە لە نوێنەرانی وەزارەت‌و زانکۆی بەغداو دەزگای سینەماو شانۆو تیپە بەجموجۆڵەکان پێك بێت . ئەمەو مەڵبەندی عیراق بە هیچ جموجۆڵێکی ئەوتۆ هەڵنەستا تا ساڵی ١٩٧٠ کە ئاهەنگ‌گێرانی رێکخست بەبۆنەی رۆژی جیهانیی شانۆ کە تیایا هەندیٚ لە تیپە شانۆیی‌یەکان بەشداریان‌کرد وەك تیپی نەتەوەیی نواندن بە شانۆگەری (الاجداد یزدادون ضراوة)ی کاتب یاسین‌و دەرهێنانی حمید الجمالی‌و شانۆگەری (الصلیب)ی محمد عفیفی‌و دەرهێنانی بسام الوردی‌و تیپی شانۆی ئەمرۆ شانۆگەری (ضرر التبغ)ی چیکۆفی لە دەرهێنانی جعفر علی پێشکەش کرد دوای ئەویش تیپی شانۆی هونەری (قراءات شعریە)ی پێشکەش‌کرد کە قاسم محمد لە شیعری بەرهەلستکاری‌یەوە ئامادەی کردبووو تیپی هونەرەکانی شانۆ دیمەنێکی لە شانۆگەری (الناطور)ی علی حسن البیاتی پێشکەش‌کرد . هەروەها وەزارەتی راگەیاندن دوو پاداشتی رێزلی‌نانی بەخشی‌یە هەردوو تیپی نەتەوەیی‌و شانۆی نویٚ بەرامبەر ئەو هەوڵەی بەم بۆنەیەوە داویانە .

هەروەها مەڵبەندی روشنبیری سۆڤیەتیش بەم بۆنەیەوە ئاهەنگی گێراو تیپی دۆستایەتی سەر بەمەڵبەندەکە شانۆگەری (سیزیف والموت)ی پێشکەش‌کرد لە دەرهێنانی أدیب القلیەچی . کەچی قوتابیانی پەیمانگای هونەرە جوانەکان شانۆگەری (کنز البخیل) یان لە دەرهێنانی عبداللە جواد پێشکەش‌کرد لە کاتێکا ئەکادیمیای هونەرە جوانەکان ئاهەنگێکی سەرپیٚ‌یی‌یان گێرا . تیپی یەکێتی نیشتمانی قوتابیانیش هاوبەشی ئاهەنگەکانی کرد بە پێشکەش‌کردنی دوو شانۆگەری لە هۆڵی کۆلیجی پەروەردە لە دەرهێنانی صلاح القصب .

لە ساڵی ١٩٧١ مەڵبەندی عیراق شانۆ هەڵسا بە رێکخستنی ئاهەنگ‌گێران لە رۆژی جیهانیی شانۆ بە کردنەوەی پێشانگایەك بۆ هونەرەکانی شانۆ کە زۆربەی زۆری تیپە عیراقی‌یەکان هاوبەشی‌یان تێدا کرد لەگەڵ چەند ئاهەنگێکی شانۆیی کە چەند رۆژێکی خایاندو زۆربەی تیپە شانۆیی‌و دەزگا هونەری‌یەکان بەشداریان تێدا کرد .

**کارتێکردنی رۆژی جیهانیی شانۆ لە پەیوەندی‌یەکانی نێوان شانۆ ویستەکان :-**

دوای ئەوەی باسی ئەو دەزگایەمان کرد کە ئەو ئاهەنگ‌گێرانەی بەبۆنەی رۆژی جیهانیی شانۆ هێناکایەوە حەزدەکەین باسی گرنگی‌و کارتێکردنی ئەم رۆژە بکەین لە پەیوەندی‌یەکانی نێوان شانۆ ویستەکان لە جیهان‌دا .

لەسەر ئاستی جیهانی‌دا کاریگەری‌یەتی ئەم رۆژە بەشێوەیەك لە

شێوەکان دەردەکەوێ لە میان ئاهەنگەکانی شانۆی میللەتان لە پاریس کە جۆرەها شانۆگەری لە وولاتانی جیاجیاوە تیا پێشکەش دەکرێ کە چەندەها دەرهێنەر پیێیان هەڵدەستن‌و تیایا پاداشت دەبەخشرێتە سەرکەوتووەکان‌و شانۆ ویستەکان لە نزیکەوە شارەزاو ئاگاداری ئاستی بەرهەمە شانۆیی‌یەکان‌و دوا پلەی بەرەوپێش چوونیان لە ناوەرۆك‌و فۆرم‌و رێبازە تازەکان‌و چارەسەرکردنی بابەتەکان دەبن .

هەروەها کاریگەری‌یەتی لە نێوان ئەو داواکاری‌و نامانەی لەلایەن نووسەران‌و هونەرمەندانی جیهان دەردەکەوێ کە بۆ شانۆ ویستەکان بەتایبەتی‌و خەلکی بەگشتی دەیان نووسن .

ئاهەنگ گێران بەبۆنەی ئەم رۆژە نەمرەوە بێ‌گومان جیێ پیێی شانۆ ویستەکان قایم دەکاو هانی ئەوەیان دەدا کە زێتر پەیوەندی‌یەکانی خۆیان رێك بخەن بە رادەیەك بیێتە هۆی ئەوەی کە ئاستی کارە هونەری‌یەکانیان بەرزبێتەوەو دەنگیان بگاتە خەلکی لەهەر چوار قورنەی دنیاوە . هەروەها کۆیان دەکاتەوەو بە توندی بەیەکیان دەبەستێتەوە لە رێگای هونەرەکەیان کەوا خەریکە دەخرێتە ناو دەروونی زۆربەی خەلك‌و وایان لیێ‌دەکا رایان بگۆرنەوە دەربارەی چۆنیەتی بەستنەوەی شانۆ بە کۆمەلگای مرۆڤایەتی . هەروەکو ئارسەر میللەر ووتی : . . بەلام هێزی کاریگەری هونەر ئەگەرچی لاوازیش بیێ ، کەچی لە مەودایەکی دوورو درێژکاری خۆی دەکات بۆیە توانای ئەوەی هەیە کە کۆمەلیێ بەیەك ببەستێتەوەو هیچ گومانیش لەوەدا نی‌یە کەهەر کارێك بتوانیێ بەلگەی ئەوە نیشان بدات کە ئێمە لەیەك دایك‌و باوکین لە پەیوەندی‌یە سروشتی‌یەکانمان ئەوە نیازێکی پاکی مرۆڤایەتی تێدایە . ئاهەنگ گێران بەرۆژی شانۆ وا دەکات کە شانۆ ویستەکان هەست بکەن کە کارەکەیان زۆر گرنگترە لە کاری سیاسی‌و دیپلۆماسی‌یەکان چونکە ئەوان چ کترین کەسانن کە نوێنەرایەتی گەلانیان دەکەن‌و دەنگیان دەگەیەننە جیهانی دەرەوە بە شێوازێکی کاریگەرو لە دلیێ چەقیو بەتایبەتی کە لەم رۆژانەدا شانۆ وەکو بەهێزترین هۆی راگەیاندن سەری هەلداو بەهۆی هونەرەکەیان شانۆ ویستەکان دەتوانن مەسەلەکانی گەلەکانیان بخەنە بەردەم جیهانی دەرەوە بەشێوەیەکی پر چێژو باوەرپیێ‌کراو .

کەچی لەسەر ئاستی ناوخۆش ئاهەنگێران گیانی پێشبرکیێی بەردەوام دروست‌دەکات لە نێوان ئەوانەی لە بواری شانۆدا کاردەکەن ، هەروەها پلەو پایەیان بەدیار دەخات لە جوولانەوەی رۆشنبیری لە وولات‌داو هەلوێستی‌یان نیشان‌دەدا لە جوولانەوەی شانۆ لە جیهان‌دا . ئەمەش وایان لیێ‌دەکات کە پتر یەکتری بگرن لەپێناو ئەوەی شانۆ بخەنە ئەو شوێنەی کە شایانی‌یەتی . هەروەها پەیوەندی رێك‌و دروست پەیدادەکات لە نێوان شانۆو دەزگا رۆشنبیری‌و پەروەردەیی‌یەکان لە وولات‌داو وورده وورده ئاگاداری ئەوەمان دەکاتەوە کە شانۆ نەك تەنها بوەتە پێویستی‌یەکی ئەدەبی‌و بەس بەلکو وەکو مۆسیقاری سۆڤیەتی (شۆستاکۆڤیچ) دەلیێ بوەتە مەسەلەیەکی زیندوو ، هەر لەم ئاهەنگەش‌دا گیانی زیندوو لە کاری شانۆیی‌دا تازە دەبێتەوە . دۆزینەوەی توانای تازەیە . لە باوەش‌گرتنی بەهرە شانۆیی‌یەکان‌و بەدیارخستنیتیان . لەم ئاهەنگەدا نیگاکان دەبرێنە گەیشتن بەئاستە پێشکەوتووەکان لە رێگای پیاچوونەوەی کارە شانۆیی‌یەکان‌و بەرەو پێش‌بردنی بیری زانستی شانۆ بەبلاوکردنەوەی ووتارو لێکۆلینەوەو گفتوگۆکردن دەربارەی کارەکان‌و چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان .

## گرنگی رۆژی شانۆ لە کاریگەیەتی شانۆ :-

ئەگەر بێتو چاوێك بەو ووشانەدا بخشێنین کە نووسەرو هونەرمەندە بە ناوبانگەکان هەموو سالێك لەبری مەلبەندی شانۆی نێو دەولەتان کە بەبۆنەی ئاهەنگی ئەم رۆژە پیێیان رووەدەکەنە جیهان ، دەبینین گشت ئەم ووشانە دووپاتی گرنگی بەستنەوەی شانۆ بەمەسەلە مرۆڤایەتی‌یەکان دەکەنەوە وەکو هۆیەك لە هۆیەکانی جوولاندنی کاری شانۆیی . هەروەها

دەبینین چۆن بایەخیان خەست دەبێتەوە لە مەسەلە هاوچەرخەکانمانو ئەو گیروگرفتانەی چارەنووسمانیان پێوە هەڵواسراون . لەلایەکی تریشەوە سەیرئەکەین کە ئەم ووشانە پیێ لەسەر گرنگی گەیاندنی هونەری شانۆ بۆ فراوانترین خەڵك دەچەقێنن دوای ئەوەی کە هەستیانکرد بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لێی بێبەش بوونەو تەنها بۆ چەند چینێك بووە .

کەواتە کە شانۆ لەم رۆژانەماندا رووداوەکاتە بەدیارخستنی ئەو دەروونە خراپەخوازانەی کە جیهان بەرەو فەوتان دەبەن ، هەوڵی ئەوە دەدا لە رێگای چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی دەروون چەپکێ رووناکی بخاتە سەر گیروگرفتە گشتییەکانی مرۆڤ هاوچەرخو هۆی گیروگرفتە تاکە کەسییەکان بگەڕێنێتەوە سەر گیروگرفتە جیهانییەکان .

جوولانەوەی شانۆ لە زۆربەی وولآتان بەرەو ڕیسواکردنی جەنگی ستەمکارانە رووی ناوە کە بەهەزاران کەسی تیا ئەمریو لەرێگاوە جۆرەها رۆشنبیریو گەنجینەی کەلەپووری تیا وێران ئەکرێو شانۆگەرییەکان دەستیانکردە تاوانبارکردنی ئەوانەی ئاگری شەرهەڵدەکەنو بەرهەڵستیکردنی ستەمو بانگ راهێشتن بۆ ئاشتی دادپەروەرانە بۆهەر خاوەن مافێكو وەستان دژی ئەو مەترسییانەی روو بەرووی مرۆڤایەتی دەبنەوەو ئا ئەوەتا نووسەری گواتیمالی (بیجویل اسنوریاس) لە ووتەکەی ساڵی ١٩٦٨دا دەڵێ : (مەشخەڵی تەختەی شانۆ لە هیچ شوێنێك نەکوژاوەتەوە بەڵکو وەکو ئەستێرە دەدرەوشێتەوە ئەوەی مەسەلەکانی مرۆڤ بخاتەروو گفتوگۆیان لەسەر بکا بێئەوەی هەرە مەزنترین گیروگرفت پشتگوێ بخات کە گیروگرفتی مانەوەی شارستانییەتمانە بەرامبەر ئەم هەموو عەمبارە ترسێنەرانەی ئەتۆم) . هیچ گومانیش لەوەدا نییە کە ئاهەنگ گێران بەرۆژی شانۆ لە هەموو جیهاندا دووپاتکردنەوەی ئەو راستییەیە کە ئەم هونەرە هۆیەکە لە هۆیەکانی لەیەك گەیشتن لە نێوان گەلانداو هێنانەدی هۆیەکانی ئاسایش .

(پاپلۆ نیرۆدا)ی شاعیری پێشکەوتنخوازیش لە نامەکەی ساڵی ١٩٧١دا دووپاتی گرنگی پەیوەندی نێوان شانۆو مرۆڤ کردەوەو ووتی (ئێمە هەمووومان دەمانەوێ بنیات بنێینو هەمووومان دەمانەوێ بزانینو شت لەیەك جیابکەینەوەو هەمووشمان دەمانەوێ خۆمان ببینین کە چۆن بووینو چۆن دەبینو لەسەر ئەوەش رێككەوین کە شانۆ پێویستە سادە بێت بەڵام نەك ساکارییەکی واکە هیچ شتێکی مرۆڤایەتی تیا بەدی نەکرێ) . ئەم قسەیە نەخشەیەکی پانو بەرینمان دەخاتە بەردەم کە پێویستە شانۆ لەبەر رۆشناییا هەنگاو بنێ تا وەکو کاریگەرو نزیك بێ لە خەڵکەوە ، و هەر ئەم قسەیەش هەموو ئەو بۆچوونانەی پێداویستەکانی بەرەوپێشچوون بەخۆوە دەگرێ کە لە کەلەپوورو گەنجینە هونەرییەکانی بەر لە خۆمانەوە وەریان دەگرین . هەروەها شاعیری گەورە ئەوە دووپات دەکاتەوە کە هەموو هۆیە کۆنەکان بەسەرچوونو نەمانو ئێمەش لەو هۆیە تازانە بێبەرین کە خۆ بەزل دەزانن لە ئاست تێگەیشتنی جەماوەرو با هەموو لایەك بزانن کە شانۆ پێویستە وەکو جارانی لێ بێتەوە تاوەکو جەماوەری زۆرو زەبەن دەستی بگاتێو هەر لەو قاوخە دانەبێ کە ئەمرۆ تیایا ئەژی . (پیتەر برۆك)ی دەرهێنەر بەشەرمەوە لە ووتەکەی ساڵی ١٩٦٩ دانی بەوەدا نا کە شانۆ ویستەکان تا ئێستا سەرنەکەوتوون لە راکێشانی خەڵکێکی زۆر بۆلای کارەکانی خۆیان . هەر لەبەر هەمان هۆش (شۆستاکۆڤیچ) بانگی ئەمەی راهێشت کە پێویستە پەیوەندییەکی بەتین لە نێوان شانۆو دەزگا پەروەردەییەکاندا هەبێت هەر لە سەرەتاییەوە تاوەکو زانکۆ ، چوونکە ئێستا بوو بە پێویست کە کاریگەرییەتی شانۆ پتربێت لە دروست کردنی نەوەیەکی وا کە تام لە کاری شانۆیی وەرگرێتو بەگەرمی رووبکاتە بینینی شانۆگەری ، شانۆش وەکو (کاتب یاسین)ی نووسەری جەزایری دەڵێ سەرانجابو بنانجاب بۆ جەماوەرە .

**بە زمانی عەرەبی لە گۆڤاری «المسرح والسينما» ژمارە (٦) ساڵی (٢) نیسانی ١٩٧٢دا بڵاوکراوەتەوە .**

بابەتی هەڵبژاردە

چیرۆکی - کاتایف
سیناریۆی - عومەری عەلی ئەمین

# فلیمی
# گوڵە پەلکەزێڕینە

**پێشوازی کردن** . . . . . . . .
**لە لایەن چەند نوێنەرێکی سەرەکییەوە**
**داپیرە / لە ناو تەمێکی رەنگاو رەنگدا**
**کە لە رەنگەکانی پەلکە زێڕینە بێت**
١ - ن . د من داپیرەیەکم
خاوەنی باخچەی گوڵە پەلکە زێڕینەم .
گوڵەکانم ، دەستکردی ،
٢ - ن تیشکی خۆرو دڵۆپی بارانن .
٣ - گ . پ گوڵەکانم ،
وەك پرشنگی خۆرو دڵۆپی باران
ئاوات بەدی هێنەرن
چاو روونکەرەوەو دڵخۆشکەرن .
٤ - گ من گوڵەکانم ئەبەخشمەوە .
تەنیا ئەو کەسانەش شایستەی گوڵە پەلکە زێڕینەن کە رازاوەی ئەو رەوشتە جوانانە بن .

**کچ / لە ناو گوڵە جارێکدا**
١ - گش من ساوایەکم
ژیانم لە یاریو پێکەنین دروست کراوە .
٢ - ن . د ئەمەوێت هەموو کەس شادمان بێت ، بۆ ئەوەی . بە دەممەوە پێبکەنن‌و یاریم لەگەڵدا بکەن .
٣ - ن چونکە یاری و پێکەنین
لە شادمانیەوە دێت .
٤ - گ . پ کەسیش ئەمانەی فێر نەکردووم
بەڵکو سروشت خۆی وای دروست کردووم .

**کوڕ / لە ناو خەرمانێك یاری منداڵانەدا .**
١ - ن .د منداڵی ساغ
لەگەڵ منداڵی نەخۆشدا یاری بۆ ناکرێت .
٢ - ن کە ویستیشی یاری لەگەڵ بکات ،
ئەیەوێت وەکو خۆی ساغ بێت . دڵخۆش بێت .
٣ - گ . پ کەواتە سروشتی منداڵ
بە ماناوە پێمان دەڵێت :
دەست لە بێدەستەڵاتان مەکەنەوە .

**سێ منداڵ / لەبەر دەم نیوە خۆرێکدا کە لەکەل هەڵهاتووە . . . .**
١ - گش ١ ، ٢ ، ٣ - ئێمە منداڵین !
٢ - ن . د ١ - ئێمە مۆسیقای ژیانین !
٣ - ن . د ٢ - ئێمە ئاوازو گۆرانیی بەسۆزین !
٤ - ن . د ٣ - ئێمە گوڵی رەنگاورەنگی بۆنخۆشین !
٥ - ن ٢ - ئێمە هیواین !
٦ - ن ٣ - ئێمە زەردەخەنەی لێوانین !
٧ - ن ١ - ئێمە خۆشەویستیین !
٨ - ن . د ١، ٢، ٣ - ژیان مافی هەموومانە !
دەبا منداڵانی ناو باخە هەنجیرەکان
زەردەواڵە زیرەیان لێهەڵنەسێنێ !
٩ - ن دەبا جووجەڵەکانی ناو سەوزە گیای بەهار ،
کۆڵلارە نەیانخوات !

١٠ – گ . پ دەبا شەماڵی فێنك هەر سروەی بێت و
یاری لەگەڵ رووی منداڵاندا بكات !
دەبا مەلی خۆش ئاوازی سەر چڵەكان .
گۆرانی بۆ منداڵان بڵێن !
١١ – گ دەبا پەلكە زێرینەی سەر گوڵە جارە كان ،
هەر ستایشی پیرۆزیی منداڵان بكات !

**دەست پێكردن**

**١**

١ – گش رووەو كامێرا / رووكاری پێشەوەی ماڵی شیلان . . دەرگای حەوشە بە نیوە كراوەیی . . . . گۆڕەپانێك لەبەر ماڵەكەدا . دیسانەوە دەرگای حەوشە بە نیوە كراوەیی .
٢ – ن . د كامێرا بە دەرگاكەدا دەچێتە ناوەوە / . . باخی ناو حەوشەی ماڵەكە . . . . بە رارەوی باخەكەدا نزیك بوونەوە لە پەنجەرەیەكەوە .
٣ – گش لە پەنجەرەكەوە / ناو ژوورێكی دانیشتن . . . شیلان كە كچێكی هەشت نۆ ساڵانە لەسەر فەرشێك دانیشتووە خەریكی نووسینەوەی دەرسەكەیەتی . . . كشانەوە بۆ دوواوە . نزیك بوونەوە لە پەنجەرەیەكی ترەوە .
٤ – گش لە پەنجەرەكەوە / ناو ژووری مەدبەقێك . . دایكی شیلان لە مەدبەقەكەدا خەریكی پەتاتەو تەماتە جنینە .
٥ – ن . د شیلان دەنووسێتەوە . . نووسینەوەكەی تەواو دەكات ، كتێب و دەفتەرو قەڵەم و پێویستیەكانی دەخاتە جانتاكەیەوەو هەڵیدەگرێ‌و لەسەر مێزێك دایدەنێت .
دەنگی دایكی شیلان لە مەدبەقەكەوە :
– شیلان ! شیلان !
شیلان – بەڵێ دایە بەڵێ .
دەنگی دایكی شیلان – كە لێبوویتەوە وەرە بۆ ئەمدیو .
شیلان – لێبوومەتەوە دایە ، وا هاتم .
٦ – گش دایكی شیلان خەریكە رۆن دەكاتە مەنجەڵێكەوە كە لەسەر تەباخێكی غاز دانراوە . شیلان دێتە لایەوە .
شیلان – فەرمو دایە .
دایكی شیلان – لە كارو فرمانی قوتابخانەت بوویتەوە كچم ؟
شیلان – بەڵێ دایە .
دایكی شیلان / پارەی دەداتێ – دە ها ئەوە پارە بچۆ هێندێك نان بكرە . زەمیلەكەش بەرە تێیخە .
شیلان – باشە دایە .
زەمیلەیەكی توولین لەسەر بۆفیەكەیە . دەستی دەداتێ‌و دەرواتە دەرەوە .
٧ – گش رووەو كامێرا / دەرگای حەوشە بەنیوە كراوەیی لە دیوی دەرەوە .
لە دەرگاوە ، شیلان بە زەمیلەكەوە دێتە دەرەوەو دەرگاكە پێوە دەداتەوەو بە لایەكدا دەڕوات .

**٢**

١ – گش تەنشتەو كامێرا / شیلان لەسەر شۆسەی شەقامێكی كەمێك چۆڵ بە زەمیلەكەوە دەڕوات .
٢ – گ دەستی شیلان چەند نانێك دەخاتە ناو زەمیلەكەوە . (دەگۆڕێت بە ن . د) شیلان لە نانەواخانەیەكە لەناو چەند كەسێكدا پارە ئەدات بە شاگرد نانەواكە (دەگۆڕێت بە گشتی) نانەواخانەكە بە جێ‌دێڵێ‌و دەڕوات .
٣ – گش تەنشتەو كامیرا / شیلان بەسەر شۆسەكەی كە پێدا هاتبوو بەوێدا دەگەڕێتەوە ، زەمیلە نانەكەی بە دەستەوەیە . ئەو دەستەی كە رووەو كامێرایە .
٤ – گش تەنشتەو كامێرا / سەگێك دووای شیلان كەوتووە .
٥ – ن . د تەنشتەو كامێرا / شیلان بە زەمیلەكەوە دەڕوات .
٦ – ن . د تەنشتەو كامێرا / سەگەكە دەڕوات .
٧ – ن . د پشتەو كامێرا / سەگەكە لە شیلان نزیك بۆتەوە .
٨ – گ . پ تەنشتەو كامێرا / شیلان هەر دەڕوات . دائەچڵەكێت‌و

قریشکەیەکی لێوە دێت‌و ئاور دەداتەوە .
٩ – ن . د پشتەو کامێرا / سەگەکە رادەکات و نانی بە دەمەوەیە .
١٠ – گ‌ك زەمیلەکە لەسەر زەوی کەوتووەو نانی تیا نەماوە
١١ – گش پشتەو کامێرا / سەگەکە رادەکات .
١٢ – گش پشتەو کامێرا / شیلان بە دووای سەگەکەدا رادەکات و نیشتۆتە سەری پشتە و کامێرا / سەگەکە رادەکات .
١٣ – ن . د رووەو کامێرا / شیلان رادەکات .
١٤ – گش تەنشتەو کامێرا / لە کۆلانێکی تردا سەگەکە رادەکات‌و شیلان بە دووایەوە
١٥ – گش رووەو کامێرا / لە تەختاییەکی ناو شاردا سەگەکە رادەکات‌و شیلان بە دووایەوە .
١٦ – ن . د تەنشتە و کامیرا / سەگەکە بەسەر بناغەیەکی پڕکراوەی خانوویەکدا رادەکات .
١٧ – ن . د تەنشتەو کامێرا / شیلانیش هەر بەو جێگەیەدا رادەکات
١٨ – گش تەنشتەو کامێرا / سەگەکە لەشار دەردەچی‌و دەداتە چۆڵەوانی
١٩ – گش تەنشتە و کامێرا / شیلانیش هەر بەو جێگەیەدا لەشار دەردەچی‌و ئەداتە چۆڵەوانی بەدووای سەگەکەدا .
٢٠ – ن . د پشتە و کامێرا / سەگەکە لە ئاوی چەمێك دەپەڕێتەوە .
٢١ – ن .د پشتە و کامێرا / شیلانیش هەر لە ئاوی ئەو چەمە دەپەڕێتەوە .
٢٢ – گش تەنشتە و کامێرا / سەگەکە بە هەورازێکدا رادەکات .
٢٣ – گش تەنشتەو کامێرا / شیلانیش هەر بەو هەورازەدا بە راکردن سەردەکەوێت .
٢٤ – ن . د تەنشتەو کامێرا / سەگەکە لە ناو دارستانێکدا رائەکات .
٢٥ – ن . د تەنشتەو کامێرا / شیلانیش هەر بەناو ئەو دارستانەدا رائەکات .
٢٦ – گش پشتە و کامێرا / سەگەکە لە ناو دارستانەکەدا خۆی ون دەکات .
٢٧ – ن . د رووەو کامێرا / لەو جێگەیەدا کە سەگەکە خۆی ون کرد ، شیلان بە هەناسەبڕکی‌و رووخساری ئارەقاویەوە راوەستاوە سەیری ئەم لاو لا ئەکات و چاو بۆ سەگەکە دەگێڕێت .

(دەگۆڕێت بە گ‌ك . پ) . . . رووخساری دەگۆڕێت ، وا دەردەکەوێت کەشتێکی سەیری بەدی کردبێت و سەرەنجی دەدات .

٣

١ – گش رووەو کامێرا لەسەر شانی شیلانەوە کە پشتی لە کامێرایە / پیرێژنێك لەناو دارستانەکەوە دەرکەوتووە ، بە گۆچانێکەوە لەسەرخۆ رووەو شیلان دێت . . کە نزیك دەبێتەوە رووخسارێکی نورانیی پێوەیە .
٢ – ن . د رووەو کامێرا لەسەر شانی پیرێژنەوە کە پشتی لە کامێرایە / شیلان لە پیرێژن وردەبێتەوە .
٣ – ن . د تەنیشتەو کامێرا داپیرە بە ئیشارەت شیلان هێمن دەکاتەوەو لێی نزیك‌دەبێتەوەو دەست‌دەهێنی بە سەریاو بە ئیشارەت لێی دەپرسێت کە چی ئەکات لەم دارستانەدا ؟ شیلانیش بە ئیشارەت تێدەگەیەنێت کە سەگێك نانی لێ‌فڕاندوەو دووای کەوتوەو . سەگەکەش خۆی ونکردووە . داپیرە سەری باوەری بۆ دەلەقێنی‌و دەست‌دێنێتەوە بە سەریاو بەئیشارەت تێدەگەیەنێت کە ئەم . یاریدەی ئەدات . دەستی‌دەگری‌و تەنشتەو کامێرا لەگەڵ خۆیدا بەناو دارستانەکەدا دەبیات .
٤ – گش رووەو کامێرا / داپیرەو شیلان بە رێگایەکی بەردەلانی ناو دارستانەکەدا دەڕۆن .
٥ – گش پشتەو کامێرا / هەردووکیان بە رێگایەکی لێژی ناو

دارستانەکەدا بەرەوخوار دەبنەوە .
٦ – گش تەنشتەو کامێرا / هەردووکیان بە گردێکدا سەردەکەون .
٧ – ن . د رووەو کامیرا / شیلان لەسەر بەردێك دانیشتووە چاوەروانیی دەکات . داپیرە دێت ، شیلان لەبەری هەڵدەستێت‌و دەست‌ئەخاتە سەر شانی شیلان‌و لەسەر بەردەکە ئەگەڵ خۆیدا دایدەنیشێنێت . (دەگۆرێت بە گ . پ) لەبن بەڵ گوڵێك دەردەهێنێ‌و نیشانی شیلانی دەدات .
٨ – گ گوڵێك / حەوت پەرەی پێوەیە ، هەر پەرەیەی رەنگێکە لە رەنگەکانی پەلکەزێرینە ، وا بەدەست داپیرەوە
٩ – گ . پ پیرێژن / بە شیلان – ئەمە گوڵە پەلکەزێرینەیە . لە باخچەکەی خۆم بۆم هێناویت . هەر پەرەیەکی نیازێکت بۆ دەهێنێتە دی . (گوڵەکەی پێشکەش دەکات)
١٠ – شیلان گوڵەکە وەردەگرێت‌و سەرەنجی دەدات
– زۆر سوپاست ئەکەم .
دەستی داپیرە دەگوشێت (دەگۆرێت بە ن .د) داپیرە هەڵدەسێت‌و شیلانیش هەڵدەستێت . داپیرە بەدەم دەست بەرزکردنەوەی خواحافیزیەوە دەروات .
١١ – ن . د کەمێك رووەو کامێرا / شیلان دەستی خواحافیزی بەرزدەکاتەوەو هەر سەیردەکات .
١٢ – گش پشتەو کامێرا / داپیرە دەروات هەتا لە لایەکی گردەکەوە ون‌دەبێت .

٤

١ – ن شیلان بەدەم بیرکردنەوەوە ، هەر سەرەنجی گوڵەکەی دەستی دەدات‌و بەقنچەکەی لەسەرخۆ دەی‌سوورێنێتەوە . سەر هەڵدەبرێت‌و بەم لاو لادا چاو دەگێرێت .
٢ – گش لەگەڵ خوێندنی مەلی کێویدا دیمەنی گردەکەو چۆڵەوانیەکەی دەورو پشتی (دەگۆرێت بە گ . پ) شیلان سەیری گوڵەکەی دەستی دەکات . . . پەرەی یەکەمی لێدەکاتەوە ، بەدوو پەنجە رووەو ئاسمان کەمێك بەرزی‌دەکاتەوەو بەدەم چاوتێبرینەوە بەئاستەم لێوەکانی ئەجوولێت وەك تکای لێبکات . . . .
بەدەم مۆسیقایەکی تایبەتیەوە کۆمەڵێك هەوری رەنگاورەنگ لە رەنگەکانی پەلکەزێرینە لەبەردەمیا دروست دەبێت‌و شیلان لەو دیویەوە دیار نامێنێت .

٥

١ – ن . د هەورە رەنگاورەنگەکان دەرەونەوە ، شیلان بەخۆی‌و زەمیلە نانەکەیەوە دەردەکەوێت (دەگۆرێت بە گش) لەبەر دەرگای ماڵی خۆیاندا راوەستاوە . . . دەگەشێتەوە چاوی هەڵدەگلۆفێت . . . سەیری ئەم لاو لای خۆی دەکات ئەنجا کە باوەر دەکات راستە ، لەدەرگاوە دەچێتە ژوورەوە .
٢ – گش دایکی شیلان لە مەدبەقەکەدا خەریکی قاپ رێکخستنە . شیلان دێتە ژوورەوە ، زەمیلە نانەکە نیشانی دایکی دەداو لەسەر بۆفیەیەك دایدەنێ‌و دەچێتە دەرەوە .
٣ – گش شیلان لە ژووری دانیشتنەکەیە گوڵەکەی بەدەستەوەیە سەیری دەکات . . . ئەنجا چاو بەژوورەکەدا دەگێرێت ، گوڵدانێك لەسەر مێزێك بەدی‌دەکات . دەچێتە لای مێزەکەوە ( دەگۆرێت بە ن . د) گوڵدانەکە هەڵدەگری‌و گوڵەکەی لەتەنشتەوە رادەگرێت . . . سەری پەسەندیی دەلەقێنێت . . گوڵەکە دادەنێت (دەگۆرێت بە گش) خاولیەك دێنێت‌و رووەو مێزەکە بە خاولیەکە گوڵدانەکە پاك‌دەکاتەوە (دەگۆرێت بە ن . د) دەنگی جریوە جریوی چۆلەکە لە باخچەکەی حەوشەوە . . . . رووەو دەنگەکە ئاور دەداتەوە
٤ – ن . د لە پەنجەرەکەوە لەدیوی ناو ژوورەکەوە / چەند چۆلەکەیەك بەسەر درەختێکی حەوشەکەوە دەخوێنن .
٥ – گ شیلان رووەو خوێندنی چۆلەکەکان ئاوری‌داوەتەوەو هەر خەریکی پاکردنەوەی گوڵدانەکەیە . . . رادەچڵەکێت . دەنگی بەربوونەوەی گوڵدانەکەو شکانی لەسەر

زەوی . . . . .

٦ – ن .د گوڵدانەکە لەسەر زەویەکە پارچە پارچە بووە لەبەر پێی شیلاندا .

شیلان پەستی دایدەگرێت ، چەند جارێك سەیری گوڵدانەکەو

٧ – ن . د سەیری گوڵەکە دەکات کە لەسەر مێزەکە دانراوە . لە دووایدا گوڵەکە هەڵدەگرێت .

٨ – گ . پ رووەو کامێرا / سەیری گوڵەکەی دەستی دەکات . . . پەڕەی دووەمی لێدەکاتەوە بە دوو پەنجە رووەو ئاسمان کەمێك بەرزی دەکاتەوەو بەدەم چاوتێبڕینەوە بە ئاستەم لێو دەجووڵێنێت ، وەك تکای لێبکات . . . .

بەدەم مۆسیقا تایبەتیەکەوە کۆمەڵێك هەوری ڕەنگاوڕەنگ لە ڕەنگەکانی پەلکەزێڕینە لە بەردەمیا دروستدەبێتو شیلان لەو دیویەوە دیار نامێنێت .

٦

١ – گ . پ هەورە ڕەنگاوڕەنگەکان دەڕەوێنەوە ، گوڵدانەکە لەسەر مێزێك لەبەردەم شیلاندا دانراوەو ، شیلان بەخۆشیەوە سەیری دەکات . هەڵیدەگرێتو ئەم دیودیوی دەکات (دەگۆڕێت بە ن . د) بە خۆشیەوە لێی وورددەبێتەوە .

دایکی شیلان دێتە ژوورەوە کە گوڵدانەکە بە دەست شیلانەوە دەبینێت دەڵێت :

– وا دیارە بەلاتەوە گوڵدانێکی جوانە بۆیە وا سەیریدەکەیت .

شیلان – بەڵێ دایە گوڵدانێکی زۆر جوانە ، ئەوە هێندێك تۆزی پێوەبوو پاکمکردەوە .

شیلان گوڵدانەکە دەخاتەوە جێگەی یەکەم جاریو ئەنجا دەچێتە لای دایکیەوەو دەڵێت :

– دایە بچمە دەرەوە نەختێك یاریبکەم ؟

دایکی شیلان / دووای کەمێك – بچۆ .

٢ – ن . د رووەو کامێرا / دەرگای حەوشە دەکرێتەوە . شیلان بە گوڵەکەوە دێتە دەرەوەو کەمێك تەنشتەو کامێرا رووەو تەختاییەکەی بەرماڵیان سەیری دوور دەکات .

٣ – گش . د چوار منداڵ لەو پەڕی تەختاییەکەدا لە دەوری شتێك کۆبوونەتەوە خەریکن .

٤ – گش کەمێك تەنشتەو کامێرا / شیلان هەر رووەو تەختاییەکە سەیر دەکات وەك شتێکی بەدی کردبێت . هەڵوێستەیەکی بۆ دەکاتو رووەو تەختاییەکە دەردەپەڕێتو لەکاور دەردەچێت .

٥ – ن . د پشتەو کامێرا / شیلان رووەو منداڵەکان رادەکات .

٦ – ن . د تەنشتەو کامێرا / چوار کوری هەشت نۆ ساڵانە لە دەوری شتێك کۆبوونەتەوە کە لە شێوەی ماسیەکی گەورەدا لە تەنەکە دروستکراوە ، کە گوایا : ساروخە . دووان لە منداڵەکان لەناوەوە سواربوون ئیشدەکەن ، دووانیشیان لە دەرەوەی ئیشی تێدادەکەن .

٧ – گ . پ منداڵێك لەدوو منداڵەکەی ناوەوە / بە مشارێك خەریکی بڕینەوەی پارچە تەختەیەکە .

٨ – گ . پ منداڵی دووەمیان لەناوەوە / بە دەرنەفیسێك خەریکی قایمکردنی برغوویەکە .

٩ – گ . پ منداڵێك لە دوو منداڵەکەی دەرەوە / خەریکی چەکوشکاریە بە ساروخەکەدا .

١٠ – گ . پ منداڵی دووەم لە دەرەوە / بە پەڕۆیەك خەریکی پاککردنەوەی ساروخەکەیە .

١١ – ن . د هەموو ئیش دەکەنو خەریکن .

١٢ – شیلان / دێت – رۆژتان باش !

١٣ – هەموو – رۆژ باش .

١٤ – شیلان دووای کەمێك سەیرکردن – ئەوە خەریکی چین ؟

١٥ – چەکوش بەدەست / لە ئیش دەوەستێت / خەریکین ئەم ساروخە دروست ئەکەین . (دەکەوێتەوە ئیش)

١٦ – ن شیلان – لەسەرم ئەکەن منیش یاریتان لەگەڵ بکەم؟ ١٧- ن . د پەرۆ بەدەست / بەدەم ئیش‌کردنەوە ببورە . . . . ئەی نابینی وا ئێمە ئەچین بۆ هەرێمی سەهۆڵ‌بەندانی باکور .

١٨ – ن شیلان – هەرێمی سەهۆڵ‌بەندانی باکور؟ . . .

ئینجا خۆ ئێرە هەرێمی سەهۆڵ بەندانی باکور نی‌یە . .

ئێوە یاری ساروخ ساروخێنە ئەکەن .

١٩ – ن دەرنەفیس بەدەست – یاری چی؟ زۆر چاك بەراستانە .

٢٠ – شیلان / دووای کەمێك – ئەی ناکرێت منیش لەگەڵتان بێم؟

٢١ – مشار بەدەست / دووای لەئیش وەستان – نەخێر ناکرێت کچ لەگەڵ خۆمان بەرین .

گ . پ شیلان دووای نیوە خێسەیەك لێویان لێ هەڵدەقرچێنی‌و (دەگۆرێت بە ن . د) بەجێیان دێڵێت . . لەسەرخۆ بەدەم بیرکردنەوەوە تەنشتەو کامێرا دەروات تا کەمێك لێیان دوور دەکەوێتەوە ، رادەوەستێت (دەگۆرێت بە گ . پ . رووەو کامێرا) لەبەرخۆیەوە قسەدەکات :

– هەرێمی سەهۆڵ‌بەندانی باکور؟ . . . هەرێمی سەهۆڵ‌بەندانی باکور . . . . . . ئینجا باشە بۆچی من نەچم بۆ هەرێمی سەهۆڵ‌بەندانی باکور؟

سەیرێکی گوڵەکەی دەستی دەکات . پەرەی سێیەمی لێدەکاتەوە بە دوو پەنجە رووەو ئاسمان کەمێك بەرزی دەکاتەوەو بەدەم چاوتێبڕینەوە بە ئاستەم لێو دەجووڵێنێت وەك تکای لێبکات .

بەدەم مۆسیقا تایبەتیەکەوە کۆمەڵێك هەوری رەنگاورەنگ لە رەنگەکانی پەلکەزێرینە لەبەردەمیا دروست‌دەبێت ، شیلان لەو دیوەوە دیارنامێنێت .

٧

١ – گ . پ هەورەکە دەرەوێتەوە . . شیلان لە چۆڵەوانیەکدا کە لە بەفردا لووس بووە ، دەست‌دەکات بە سەیرکردنی ئەم لاو لای خۆی (دەگۆرێت بە گش . د) تا چاو بڕبکات هەر چوار لای چۆڵەوانیەو لە بەفردا لووس‌بووە . لە سەرمادا دەست‌دەکات بە هەڵلەرزین‌و مل بردن بەناوداو خۆ کوورکردن .

٢ – گ . پ رووەو کامێرا شیلان – ئای . . . ! چ سەرمایەکە . . ! خەریکە رەق ببمەوە .

رووخساری ترسێکی گەورەی لێدەنیشێت وەك شتی ترسناکی بەدی‌کردبێت .

٣ – ن . د چەند ورچێکی سپی لەناو بەفرەکاندا رووەو کامێرا دێن .

٤ – گ .پ رووەو کامێرا / شیلان ترسی لێنیشتووە زوو زوو سەیری ئەم لاو لای خۆی دەکات .

٥ – ن . د ورچەکان .

٦ – گ . پ شیلان ترسی لێنیشتووەو سەیری ئەم لاو لای خۆی دەکات ، وەك بیەوێت هاوار بکات . . . ئەنجا هاوار دەکات

– ورچ . . . ! ورچ . . . ! . . . ئای . . ورچ !

بەڵام وەك لەپڕ بیری کەوتبێتەوە ، پەنا دەباتەوە بۆ گوڵەکە ، دەست‌بەجێ بە پەلە پەرەی چوارەمی لێدەکاتەوەو بە دوو پەنجە رووەو ئاسمان کەمێك بەرزی‌دەکاتەوەو . . . رووەو ورچەکان سەیردەکاتەوەو . . .

ئینجا چاو دەبڕێتە پەرەی گوڵەکە ، کە بەرزی کردۆتەوە وەك تکای لێبکات بە ئاستەم لێو دەجووڵێنێت . بەدەم موسیقا تایبەتیەکەوە کۆمەڵێك هەوری رەنگاورەنگ لە رەنگەکانی پەلکەزێرینە لەبەردەمیا دروست‌دەبێت‌و شیلان لەو دیویەوە دیارنامێنێت .

٨

١ – ن . د هەورەکان دەرەونەوە . شیلان تەنشتەو کامێرا لای چوار کوڕەکەوە کە خەریکی ساروخەکەن ، ڕاوەستاوە .

چەکوش بەدەست / لە کار رادەوەستێت – ئەوە لە کوێ بوویت ؟

شیلان – لە هەرێمی سەهۆڵبەندانی باکور بووم . . وا ئێستاش ئەچم لەگەڵ کچاندا یاریئەکەم .

بە هەڵبەزو دابەزەوە بەجێیاندیلێتو دەروات .

٢ – گش پشتەو کامێرا / شیلان بە هەڵبەزو دابەزەوە دەروات . لەسەری شەقامێکەوە پێچدەکاتەوەو وندەبێت .

٣ – گش رووەو کامێرا / شیلان لەسەری شەقامێکیتردا هەر بە هەڵبەزو دابەز دەروات .

دەنگی قریوە قریوی یاری منداڵان – . . .

٤ – ن . د شیلان رادەوەستێتو رووەو پێچی شەقامەکە سەیر دەکاتو بە هەڵبەزو دابەز رووەو دەنگەکە رادەکات .

٩

١ – گش چەند کچێکو چەند کورێك لە گۆرەپانێکی مام ناوەندیدا کە جەمسەری چوار شەقامە بەدەم ئەم گۆرانییەوە یاریو سەمادەکەن . شیلانیش گەیشتۆتە ئێرە لە لایەکەوە وەستاوەسەیریاندەکات : منداڵان بەگۆرانییەوە :

-کش کش کۆلارە جووجك مەخۆ بەهارە
بەهار وەرزی گولانە کاتی شاییو سەیرانە
زەردەواڵە زەردەواڵە زیرە مەدە لەو منداڵە
منداڵ پاکو خاوێنە دڵسافە وەك ئاوێنە

(بینراوەکە بەپێی ئەم سیناریۆیە) :

٢ – گ . پ شیلان رووەو منداڵەکان سەیردەکات

٣ – ن . د منداڵەکان سەمادەکەن

٤ – ن . د شیلان سەیریان دەکات

٥ – گ منداڵەکان بەریزە لە کاتی سەمادا

٦ – ن پشتەو کامێرا / شیلان سەیردەکات

٧ – گ قاچی منداڵەکانی لە کاتی سەمادا بەریزە

٨ –ن رووەو کامێرا / شیلان سەیردەکات .

٩ – گش دوو قەمەرە بە پێچەوانەی یەکتری بە شەقامەکەدا تێدەپەرن ، بەلای منداڵەکاندا کە لە سەما کردندا بەردەوامن .

١٠ – ن تەنشتەو کامێرا / شیلان سەیردەکات

١١ – گش منداڵەکان لە کاتی تەواوبوونی گۆرانیو سەماکەیاندا

١٢ – گ . پ شیلان پشتدەکاتە منداڵەکانو رووەو کامێرا چەند هەنگاوێك لێیان دووردەکەوێتەوە ، رادەوەستێت سەیرێکی گوڵەکەی دەستی دەکات ، پەرەی پێنجەمی لێدەکاتەوەو بە دوو پەنجە رووەو ئاسمان کەمێك بەرزیدەکاتەوەو بەدەم چاو تێبرینەوە وەك تکای لێبکات بە ئاستەم لێو دەجوولێنێت .

بەدەم مۆسیقا تایبەتیەکەوە کۆمەڵێك هەوری رەنگاورەنگ لە رەنگەکانی پەلکەزێرینە لەبەردەمیا دروستدەبێتو ، شیلان لەو دیویەوە دیارنامێنێت .

١٠

١ – گ . پ هەورەکان دەرەوێنەوە . شیلان دەردەکەوێت کە بە رووبەکی زۆر گەشەوە سەیری ئاسمان دەکات .

٢ – ن . د منداڵان هەموو بەدەم هەڵبەزو دابەزو قاوو قریشکەوە سەیری ئاسمان دەکەن .

٣ – گش سەرەو کامێرا / لە ئاسمانەوە هەمەجۆرو هەمەرەنگ میزڵان دێتە خوارەوە .

٤ – ن . د منداڵان بەدەم قاوو قریشکەوە خۆیان بۆ میزڵانەکان هەڵدەدەن بیگرنەوە .

٥ – شیلان رادەکاتە ناو منداڵەکانەوە ، وەك ئەوان خۆی هەڵدەدات بۆ میزڵان گرتنەوە .

٦ – گش منداڵان ، میزڵان دەگرنەوە . چەپکە گوڵ دەگرنەوە . . . ئامێری مۆسیقای منداڵان دەگرنەوە . . لەگەڵ شیلاندا بەدەم ئەم گۆرانییەوە ، میزڵانو چەپکە گوڵو ئامێری مۆسیقا بەدەستەوە دەکەونە سەما :

گوڵو مۆسیقاو یاری خۆشەویستیو بەختیاریی

بۆژین دێنین بەدیاری

ئێمە سروەی بای وەشتین فریشتەی ناو بەهەشتین

گوڵزاری باخ و دەشتین

(سیناریۆی سەماکە بەم جۆرەیە :)

٧ – گش مناڵەکان بە سەماوە .

٨ – شەقامی یەکەم هەتا نیوەی پڕ بوەتەوە لە یاری منداڵانە :

تۆپ . پایسکل . ئوتومبیل . . . . هەمەجۆر حەیواناتی دەستکرد . . . هەمەجۆر ئامێری مۆسیقای منداڵانە (جاز ، ئۆکۆردیۆن ، شەیپور . . . هتد) بووکەشووشە . . . گالیسکە کە ئەسپی دەستکرد رایدەکێشێ . . . . هتد .

٩ – گک . پ مناڵەکان بە سەماوە .

١٠ – ن . د شەقامی دووەم هەتا نیوەی زیاتر پڕبوەتەوە لە یاریەکان .

١١ – ن . د کامێرا بەدانیشتنەوە / یارییەکان

١٢ – ن . د منداڵان بە سەماوە

١٣ – شەقامی سێیەم هەتا ئەوسەری پڕێتی لە یاری .

١٤ – ن . د یارییەکانی دەستی منداڵان بە سەماوە .

١٥ – ن . د شەقامی چوارەم هەتا ئەوسەری پڕێتی لەیاری

١٦ – ن . د شیلان لە گۆڕەپانەکەدا لەناو یاریەکاندا .

لە گۆڕەپانەکەدا منداڵان لەناو یارییەکاندا هەر سەرو شانیان

١٧ – ن . د دیارەو هەنگاو هەڵدێننەوەو لە خۆشیانا قاوو قریشکیانە .

١٨ – گش ژێرەو کامێرا / گۆڕەپانەکەو هەر چوار شەقامەکە ، کە پڕێتی لەیاری .

١٩ – ن . د تەنشتەو کامێرا / لەوسەری شەقامی یەکەمەوە

تاکسیەك کە خەڵکی تێدایە لەبەر یارییەکان ڕێگە نیە بەرەو گۆڕەپانەکە بڕوات ، هەر هۆڕن لێدەدات .

٢٠ – ن شیلان بە بێزارییەوە لەناو یارییەکانەوە سەیری تاکسیەکە دەکات .

٢١ – گش لەوسەری شەقامی دووەمەوە . کامێرا لەناو قەمەرەیەکەوە ڕووەو گۆڕەپانەکە شەقامەکە نیشان دەدات کە بەیاری پڕبۆتەوە .

٢٢ – گک دەستی – شوفێرەکە کە هەر دەستدەنێت بە هۆڕندا . هەموو جارێکیش دەنگی هۆڕنەکە دێت .

٢٣ – ن . د شیلان لەناو گۆڕەپانەکەدا لەناو یارییەکانەوە بە بێزاریو پەستییەوە سەیری منداڵان دەکاتو سەیری یارییەکان دەکاتو دەست ئەدات بە دەستدا .

٢٤ – ن . د تەنشتەو کامێرا / لە کۆتایی یارییەکانەوە لە شەقامی سێیەمدا : لۆرییەك . قەمەرەیەك . پیك‌ئەپێك . گالیسکەیەکی تریشقە ڕووەو گۆڕەپانەکە ڕاوەستاون . لەبەر یارییەکان ڕێگە نیە بڕۆن هەر هۆڕن لێدەدەن .

٢٥ – گک . پ شیلان ڕووەو شەقامی سێیەم بە پەستیو بێزارییەوە سەیردەکات . سەر بادەداتو دەشڵەژێت .

٢٦ – منداڵەکان لەناو یارییەکاندا هەر سەرو شانیان دیارە .

٢٧ – ن . د کەمێك تەنشتەو کامێرا چەند ئوتومبیلێك (تاکسی ، تایبەتی ، تانکەر ، لۆری ، تراکتۆر ، لە کۆتایی یارییەکاندا لە شەقامی چوارەم ڕووەو گۆڕەپانەکە ڕاوەستاون ڕێگەیان نیە بڕۆن هەر هۆڕن لێدەدەن .

دەنگی هۆڕنێکی زۆر .

٢٨ – ن ڕووەو کامێرا / تاکسییەك شوفێرەکەی دابەزیوە ڕووەو یارییەکان بەئیشارەت هەر بێزاری دەردەبڕێت .

کەمێك ڕووەو کامێرا / شوفێرو ڕێبوارەکانی شەقامی سێیەم زوربەیان دابەزیون لە یارییەکان هاتوونەتە پێشەوەو بە ئیشارەت بێزاری دەردەبڕن .

٢٩ – ن . د سەرەوکامێرا / سەربانی ماڵەکانی سەر شەقامەکان پڕێتی لە خەڵك ڕووەو کامێرا بەدەم دەنگی هۆڕنێکی زۆرەوە سەیری شەقامەکە دەکەن .

٣٠ – ن . د خەڵکی لەسەر شۆسەکان ڕاوەستاون سەیری شەقامەکانو یارییەکان دەکەن .

٣١ – گ‌ك . پ شیلان له نزیك قه‌راغی گۆڕه‌پانه‌كه‌وه له‌ناو یارییه‌كاندا به‌ده‌وری خۆیدا سه‌یرده‌كات . . چه‌ند جارێك له‌پێی ده‌ستی به‌رز ده‌كاته‌وه بۆ سه‌ره‌وه‌و له‌سه‌ر سه‌ری داده‌نێته‌وه ، وه‌ك له‌خۆی بدات ، كه چی كردووه‌و گوایا په‌شیمانه‌و ئه‌م یارییه زۆره كه داوای‌كرد بۆ منداڵه‌كان گیروگرفتی بۆ شار نایه‌وه . سه‌یری گوڵه‌كه‌ی ده‌ستی‌ده‌كات ، په‌ڕه‌ی شه‌شه‌می لێده‌كاته‌وه ، به دوو په‌نجه رووه‌و ئاسمان كه‌مێك به‌رزی ده‌كاته‌وه‌و به‌ده‌م چاو تێبڕینیه‌وه وه‌ك تكای لێبكات به ئاسته‌م لێو ده‌جووڵێنێت .

به‌ده‌م مۆسیقا تایبه‌تیه‌كه‌وه كۆمه‌ڵێك هه‌وری ره‌نگاوره‌نگ له ره‌نگه‌كانی په‌لكه‌زێرینه له‌به‌ر ده‌میا دروست‌ده‌بێت ، شیلان له‌و دیویانه‌وه دیارنامێنێت .

١١

١ – گ‌ك . پ هه‌وره‌كان ده‌ره‌وێنه‌وه ، شیلان له گۆڕه‌پانه‌كه‌دایه . (ده‌گۆڕێت به گ‌ش) گۆڕه‌پانه‌كه هیچ یارییه‌كی تێدا نه‌ماوه وه‌ك جارانی لێهاتۆته‌وه .

٢ – منداڵه‌كان به چه‌پكه گوڵ‌و ، میزلاْن‌و ئامێری مۆسیقاكانیانه‌وه كه به‌ده‌ستیانه‌وه‌یه هه‌ر یه‌كه به لایه‌كدا بلاْوه‌ی لێده‌كه‌ن .

٣ – گ‌ك . پ شیلان پشته‌و كامێرا / ئه‌و ئوتومبیل‌و مه‌كینه‌و گالیسكانه‌ی كه راوه‌ستابوون‌و ڕێگه‌یان لێگیرابوو ، به به‌رده‌م شیلاندا به‌ناو گۆڕه‌پانه‌كه‌دا تێده‌په‌ڕن . واته ڕێگاوبان كرایه‌وه .

٤ – شیلان ته‌نشته‌و كامێرا / لا ده‌كاته‌وه‌و له‌سه‌رخۆ ده‌ڕوات (ده‌گۆڕێت به ن . د) ده‌ڕوات . هه‌تا نه سه‌ری كۆلاْنێكدا پێچ ده‌كاته‌وه‌و دیارنامێنێت .

٥ – گ‌ش رووه‌و كامێرا / شیلان هه‌ر به هه‌مان له‌سه‌رخۆییه‌وه به رۆیشتنه‌كه‌ی خۆی . له ڕێگایه‌كی ناو باخچه‌یه‌كی گشتیدا ده‌ڕوات .

ئه‌نجا لا ده‌داته ناو پارچه چیمه‌نێك‌و به ماندوێتی له‌سه‌ر كورسییه‌كی ناو باخچه‌كه پاڵی لێده‌داته‌وه .

٦ – ن . د پشته‌و كامێرا / شیلان له‌سه‌ر كورسییه‌كه پاڵی‌داوه‌ته‌وه ، سه‌یری دیمه‌نی باخچه‌كه ده‌كات . . . له دامێنی ئه‌وبه‌ری چیمه‌نه‌كه‌وه كوڕێكی هه‌شت نۆ ساڵاْنه دیاره له‌سه‌ر كورسییه‌ك دانیشتووه .

٧ – گ‌ك . پ ته‌نشته‌و كامێرا / شیلان سه‌یری گوڵه‌كه‌ی ده‌ستی ده‌كات كه یه‌ك په‌ڕه‌ی پێوه‌ماوه . ئه‌نجا پشتی سه‌ری پاڵ‌ده‌دات به كورسیه‌كه‌وه‌و سه‌یری ئاسمان ده‌كات‌و بیرده‌كاته‌وه .

٨ – گ‌ك رووخساری شیلان به‌ده‌م بیركردنه‌وه‌وه چاوی بڕیوه‌ته گوڵه‌كه . (تێكه‌ڵ)

٩ – گ‌ش شیلان له شه‌قامێكدا سواری پایسكلێكی دوو پێچكه‌یی بووه ، جانتاكه‌ی قوتابخانه‌ی كردۆته كۆڵی . . . (تێكه‌ڵ) .

١٠ – گ‌ك دیسانه‌وه رووخساری شیلان كه به‌ده‌م بیركردنه‌وه‌وه چاوی بڕیوه‌ته گوڵه‌كه . . . (تێكه‌ڵ)

١١ – ن شیلان مێزێكی له به‌رده‌مدایه هه‌مه‌جۆر پاقلاوه ، كاسته‌ر ، پیپسی له‌سه‌ر دانراوه‌و شیلان خه‌ریكی خواردنه . (تێكه‌ڵ)

١٢ – گ‌ك رووخساری شیلان زمانی له گوویی وه‌رده‌دات وه‌ك پاقلاوه‌ی خواردبێت . (ده‌گۆڕێت به گ‌ك . پ) ڕاست داده‌نیشێته‌وه‌و سه‌یرێكی گوڵه‌كه‌ی ده‌كاته‌وه به‌ده‌م سه‌یركردنی كوره‌كه‌ی ئه‌و به‌ریه‌وه ده‌ڵێت :

– ده‌ی جاریْ په‌له‌م چیه با ئه‌م په‌ڕه‌یه بمێنێت . ده‌كه‌وێته سه‌ره‌نج‌دانی كوره‌كه . له‌سه‌رخۆ هه‌ڵده‌سێته سه‌رپێ (ده‌گۆڕێت به گ‌ش) به هێواشی بۆ ئه‌وه‌ی كوره هه‌ستی پێ‌نه‌كات به‌ره‌و پشتی كوره‌كه ده‌ڕوات .

١٣ – ن . د هه‌ردووكیان رووه‌و كامێرا / كوره به په‌ستییه‌وه له‌پێی ده‌ستی خستۆته ژێر روومه‌تی . . . . شیلان له پشتیه‌وه ورده ورده نزیك ده‌بێته‌وه ده‌ستێك ده‌كێشی به شانیاو

لاتروسکەی ن لێدەبەستێتەوە . (دەگۆڕێت بە ن)

١٤ — ن کوڕە لەسەرخۆ ئاوڕێکی لێدەداتەوەو ئەنجا ڕوودەکاتەوە بە لای خۆیەوە .

١٥ — دیسانەوە شیلان لەپشتی کورسییەکەوە لەسەرخۆ بەرەو پشتی کوڕە دێتو دەستێك دەکێشێتەوە بەشانیاو لاتروسکەی لێدەبەستێتەوە .

دیسانەوە کوڕە ئاوڕێکی لێدەداتەوەو ئەنجا پاڵ دەداتەوە بە کورسییەکەوە .

شیلان لەسەرخۆ دێتە لایەوەو لە تەنشتیەوە دادەنیشێتو سەیرێکی یەکتری دەکەن .

شیلان — ئەوە بۆچی دوو جار دەستم کێشا بە شانتا . کەچی نەهاتی یاریم لەگەڵ بکەیت ؟

کوڕەکە سەیرێکی دەکاتو قاچێکی درێژدەکاتو دەرەلنگی شەرواڵەکەی هەڵدەکاتو قاچی نیشان دەدات کە دیارە بە سارغی پێچراوەو دەڵێت :

— . . . ئاخر . . . قاچم .

١٦ — گ قاچی کوڕەکە کە بە سارغی پێچراوە .

١٧ — گ . پ شیلان چەند جارێك بە دڵنەوایی کردنەوە سەیری کوڕەو سەیری قاچەکەی دەکات .

کوڕەکە سەیری شیلان دەکات .

شیلان ئەنجا بە زەردەخەنەیەکەوە سەیری کوڕەکە دەکاتەوەو هەڵدەستێتو تەنشتەو کامێرا دەچێتە ئەولا کورسییەکەوە .

١٨ — گ . پ ڕووەو کامێرا / شیلان سەیرێکی گوڵەکەی دەستی دەکات ، پەڕەی حەوتەمی لێدەکاتەوەو بە دوو پەنجە کەمێك ڕووەو ئاسمان بەرزی دەکاتەوەو بەدەم چاو تێبڕینەوە بە ئاستەم لێو دەجووڵێنێت وەك تکای لێبکات .

بەدەم مۆسیقا تایبەتیەکەوە کۆمەڵێك هەوری ڕەنگاوڕەنگ لە ڕەنگەکانی پەلکەزێڕینە لەبەردەمیا دروست دەبێتو شیلان لەو دیویانەوە دیارنامێنێت .

١٢

١ — ن . د هەورەکان دەڕەوێنەوە کوڕەکە لەبەردەم شیلاندا کە (ڕووەو کامێرایە) کەوتۆتە هەڵەزو دابەزێکی گەرمو قاچی چاكبۆتەوەو شیلان بە ڕووبەکی گەشەوە سەیری دەکات .

٢ — گش کوڕەکە یەك دوو جار بە قریوە قریوەوە بە باز دەچێتە سەر کورسییەکەو دێتەوە خوارەوەو هاواردەکات :

— قاچم چاكبوەوە ! قاچم چاكبوەوە !

ئەنجا ڕادەکات شیلان بگرێت .

شیلان بە قریشکە قریشكو پێکەنینەوە بە دەوری کورسییەکەدا ڕادەکات .

کوڕەکەش هەر بەدوویدا ڕادەکاتو جاروبارەش دەگەڕێتەوە بەرەوبری بداتەوە .

شیلان لە کورسییەکە دوور دەکەوێتەوە بەناو چیمەنەکەدا ڕادەکات .

کوڕە بە ڕاکردن دووای دەکەوێت بیگرێت .

٣ — ن . د شیلان یەك دووجار بە دەوری دوو درەختدا دەخولێتەوەو کوڕەش هەر بە دووایەوە ڕاوی دەنێ .

٤ — ن . د شیلان ڕادەکاتە سەر ڕاستە ڕاڕەوێکی درێژی ناو باخەکە پشتەو کامێرا بە ڕاڕەوەکەدا ڕادەکات کە هەردوو بەری درەختی تێدا بەرزبوەتەوە کوڕەش هەر بەدووایەوە (دەگۆڕێت بە گش) کوڕە هەر ڕاویدەنێو بۆی ناگیرێت هەتا دوور دەکەونەوە . (دەگۆڕێت بە گش . د) وێنەکەیان بە ڕاکردوویی بچووك دەبێتەوەو لەناو چەند تەمێکی ڕەنگاوڕەنگدا ون دەبن کە لە ڕەنگی پەلکەزێڕینەن .

رابەری نیشانەی وێنەکان :

| | |
|---|---|
| ز . گ - واتە وێنەیەکی زۆر گەورە | V.C.S |
| گ — واتە وێنەیەکی گەورە | C.S |
| گ . پ — واتە وێنەیەکی گەورە هەتا پشتێن | M.C.S |
| ن — واتە وێنەیەکی ناونجی | M.S |
| ن . د — واتە وێنەیەکی ناونجی دوور | M.L.S |
| گش واتە وێنەیەکی گشتی | L.S |
| گش . د واتە وێنەیەکی گشتی دوور | D.S |

# کاروانی ڕۆشنبیری لە کوردستاندا

## لە هەولێر

دزوار : ئامادەی کردووە

### حەیران

دەزگای ڕۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی لە ڕۆژی ١٢/٤/١٩٨٦ لە هۆلی نەقابەی کرێکاراندا . کۆڕێکی بۆ کاك جەلال سنجاوی بەم ناونیشانەی سەرەوە سازکرد . لە سەرەتادا مامۆستا مەحمود زامدار بەخێرهاتنی ئامادەبوانی کردو باسی گرنگی فۆلکلۆری کرد . . بە تایبەت ئەم لایانەی کە تا ئێستا کەم‌تەرخی لی‌کراوە . ئینجا کاك جەلال لە بەراییدا وتی (حەیران لایەنێکی زۆر گرینگ‌و لە باری فۆلکلۆری میللەتەکەمانە کە تاکو ئێستا هەول‌و تەقەلایەکی ڕادە پێویستی بۆ نەکراوەو لێکۆلینەوەی بەرفراوانی لەسەر نەنوسراوە ئەوەی ڕاستی بێت تاکو ئێستا لە حەیران خاوەنی «دەق مێژوویی» نوسراوەیی کۆن نین کە بتوانین لە نوسینەکانماندا پشتی پی‌قایم بکەین بەلکو ئەوەی نوسراشبێتەوە مێژوویەکی زۆر کۆنی نیەو دەگەڕێتەوە بۆ چەند سالێك پێش ئێستا .

لێرەدا ناچارین پەنا ببەینە بەر «دەق دەماودەم» کە تا ڕادەیەك جێگای بروا نین‌و دەقەکان شێواون‌و لە ناوچەیەك بۆ ناوچەیەکی تر . مۆرك‌و سیمای جارانی فرێ دەداو تەموچێژی فۆلکلۆریەکەی لی دادەکەلی) .

دوا بە دوای ئەمە هاتە سەر بەشی «حەیران چیە»و ڕای هونەرمەند عوسمان شارباژێری‌و کاك خالد جوتیارو ئەسعەد عەدۆی بەرامبەر بە حەیران خوێندەوە ئینجا خۆیشی تارفی حەیرانی کرد .

ئەوەی شابانی باسە دەتوانین باسەکەی کاك جەلال سنجاوی بەم شێوەی خوارەوە دابەش بکەین .

* بەراین * حەیران چی‌یە * جۆرەکانی حەیران ، دەشتی ، سەر چیایی ، کەندی * هونەری حەیران لە نێوان دەنگ‌و گوتنی * لایەنەکانی حەیران * حەیران‌و دیوەخان‌و دەرەبەگ * کەندیناوەو قەراج لە ڕووی جوگرافیا * ڕێگاکانی کۆچ‌و کۆچبار * کۆچ‌و کۆچبار * سێ حەیران بێژ .

### ئومێدی ئیستقلال

بەشی کوردی لە کۆلیجی ئادابی زانکۆی صلاح‌الدین لە وەرزی ڕوشنبیری‌دا . لە ڕۆژی ٩/٤/١٩٨٦دا کۆڕێکی بۆ مامۆستا ممتاز حەیدەری لە ژێر ناونیشانی (ڕێبازو گیانی کوردایەتی ڕۆژنامەی ئومێدی ئیستیقلال) لە هۆلی کۆلێجەکەدا سازکرد . لە سەرەتادا مامۆستا فەرەیدون بەرز نجی بەخێرهاتنی ئامادەبوانی کردو مامۆستای موحازیری پێشکەش بە ئامادەبوانی کرد .

هەر لە سەرەتاوە کاك ممتاز حەیدەری بە پێنج خال دەرگای باسەکەی والا کردەوە . ئینجا وتی (باس‌کردنی ئەم پێنج خالە

دابەش کردنی باسەکەی :

- شی‌کردنەوەیەکی پێنج خاڵی
- هەڵوەستەیەك
- پێناساندنێکی رۆژنامەی ئومێدی ئیستیقلال
- رێبازو گیانی کوردایەتی ئومێدی . .
- کۆتایی

لە کۆتاییدا کاك ممتاز وتی ( راستیەکەی دەورکردنەوەو شی کردنەوەی ناوەرۆکی ئەم رۆژنامە مەزنە هەویرەکەی ئاوێکی فرەی دەوێ ، بە کۆرێك‌و دوان‌و سێیان‌و چواران بە مافی خۆی ناگات هەرچەندە من لێرەدا چەند نموونەیەکی زۆر کەمم باس‌کرد بەڵام وابزانم ئەگەر بە پەلەش بوو ئەوەی مەبەست بوو بۆ ئێستا راگەیەندرا .

باسەکەی کاك ممتاز لە لایەن ئامادەبوان گفتوگۆی لەسەر کرا .



هەروەکو گوتمان لەبەر ئەوە بوو کە بابەتەکە کورت‌و خەست دەبێ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە رووی زانستەوە ناکرێ یەکسەر بچینە ناو باسەکەوە چونکە زەمینەی بە دەست هێنانی ئاکامەکەی لاواز دەبێ . جا ئەگەر زۆر بە کورتیش بێ واچاکە هەڵوەستەیەك دەربارەی کەسایەتی شێخی نەمر بکەین‌و لە بارەی ئەم دیاردانەش چەند قسەیەکی خێرا بکەین . یەکەم دروست‌بوونی شاری سلێمانی وەك پایەتەخت بەرهەمی میرنشینی بابانە) . دوا بە دوای ئەمە وتی (هەر چەندە دەسەڵاتی فەرمانرەوایەتی کوردستان بە تایبەتی‌و کەسایەتی‌و بلیمەتی‌و قارەمانییەتی شێخ مەحمودی هەردەم زیندوو بە گشتی ، زۆرکەمی لیکۆڵراوەتەوە ، بەڵام ئەوەی ئاشکرایە شێخی نەمر مرۆیەکی بلیمەت‌و چاونەترس‌و خاوەن گیانێکی رەسەنی نەتەوەیی بووە ، بە پێی مێژوویی رووداوە کارەساتە هاوچەرخەکان مەسەلەی کوردایەتی وەك ئاوو دۆ تێکەڵی خوێن‌و هۆشی بووە) .

دوا بە دوای ئەمە مامۆستای موحازیر بەم جۆرە هاتە سەر

## دیداری فۆلکلۆری

بەرێوەبەرایەتی رۆشنبیری جەماوەر لە هەفتەی فۆلکلۆری عیراقی‌دا دیدارێکی بۆ فۆلکلۆر لە رۆژانی ١٩-٢١/٤/٩٨٦ لە هۆڵی رۆشنبیری جەماوەردا سازکرد .

### ژوان لە کوردەواری‌دا

لە یەکەم رۆژی دیدارەکەدا کۆرێك بە ناونیشانی (خۆشەویستی‌و ژوان لە کوردەواریدا) بۆ مامۆستا داود محەمد شرۆڵ سازکرا . لە سەرەتاوە کاك عەزیز حەریری بەخێرهاتنی ئامادەبوانی کردو باسی گرنگی ئەم دیدارەو ئومێدی پەرەسەندن‌و بەردەوامی کرد . ئینجا مامۆستای موحازیری پێشکەش بە ئامادەبوان کرد .

دوا بە دوای ئەمە مامۆستا شرۆڵ هاتە سەر باسەکەی‌و گوتی (دەبا چاوێك بخەینە سەر سێرەی کۆنی کوردەواری تا بزانین چیمان دێتە بەرچاو . هێی . . هێی ئەوەندەی من نزیکە گا دادەبەستم ، ئەگەرچی هەر دوورە گایە . نازانم نەمن جوتیارەکی نەزان‌و نەپڕاو شپرزەم ، نەخەتای تەدارەکی

جوتەکەیە . بەلاٚم وابزانم . خەتا لەمەر هیرتەیە . وەڵلاهی بوختانی بۆ هەلنابەستم . تووماتی پیٚ ناکەم . وەك سیرمەی دۆمان هەرچەندی ڕایبکێشی هەر لێك دەکێشرێتەوەو ڕادەکشرێ .

تیٚ ناگەم ! ئایا لە کاتی غاراندنی هیرتە درێغی کراوە ؟ وەیا بە پەلکە هەنارو جەفتەکەی وولاٚتی خۆمان نەکراوە ؟ ! وەیا مەحس و پێستەکەی جسن نیە . خۆم بە جوتیارێکی کارامە دەزانم (بام لە خۆ بریە) تەنها بەختە ڕەشی منە دەبیٚ ئاغەکەم دارجۆتم لە دەست ڕاستێنیو جۆتە کراشەکانم لیٚ وەربگریتەوەو شار بەدەرم بکا) . دوا بە دوای ئەمە وتی (خۆ کوردیش لە مێژ ساڵە بە نەتەوەیەکی گەورەو خاوەن کەلەپوورو داب و نەریت و خوورەوشتی مرۆڤانە لە قەڵەم دەدرێت و بەرچیغ و چەرەگەی لە هەموو هەوارێك و دەشت و بنارو زوورگی کۆمەلاٚیەتی ئەم جیهانە لە ناخی زەویدا شتر کردووە ، چەندین شۆرە سوارو سوارچاکی لیٚ پەیدا بووە بە هەموو دەمگرەو بەرەوەی قۆشمەو مەیدانی ئازایەتی و دڵو دامێن پاکی بوویتە داغمەی بەرخ بەرانی ئەوان) .

دەتوانین باسەکەی مامۆستا داود بەم جۆرەی خوارەوە دابەش بکەین :

- خۆشەویستی (دڵداری)
- هۆیەکانی رەخساندنی خۆشەویستی لە کوردەواریدا
  - شایی و هەلپەرکیٚ و زەماوەند
  - ساوار کولاٚندن و کوتانەوەو لیٚ کردن
  - ماتەمین
  - مەولود خوێندنەوە
- دیاریەکانی خۆشەویستی
- پێناو (راسپێردراو) و ژوان
- شوێن و کاتەکانی ژوان
- چەند رووداوی خۆش و ناخۆش لە ژواندا
- دابران و دوورکەوتنەوەو سوێند خواردنی مەیل نەگۆران



- چەند نموونەی حەیران
- هاتنەوەو بەیەك گەیشتنەوە لە ژواندا
- هەندێك لە ڕەوشتی کۆن بۆ جیٚ بەجیٚ کردنی مراز

**عەلی بەردەشانی**

لە دووەم رۆژی دیداری فۆلکلۆریدا کۆرێك لە ژێر ناونیشانی (چارێك بۆ پەرێشانی عەلی بەردەشانی) بۆ مامۆستا دلشاد مەریوانی سازکرا . لە سەرەتاوە کاك عەزیز حەریری بەخێرهاتنی ئامادەبوانی کردو پووختەی ژیانی مەریوانی پێشکەش بە ئەدەب دۆستانی شاری هەولێر کرد ، هەرچەندە مامۆستا دلشاد لەمە زیاتر لە نێو خەڵکی کۆنە شار ناسراوە .

دوا بە دوای ئەمە مامۆستای موحازیر بە هێمنی و لەسەرەخۆو بە ئوسلوبە تایبەتیەکەی خۆی هاتە سەرباسەکەیی و گوتی (لەم وتارەدا دەبوو دەربارەی ئەو قۆناغەی عەلی ، بەردەشانی تیادا ژیاوە . جۆری ژیانەکەی . خودی خۆی . ئاستی شیعرەکانی و گەلێك زانیاری پێویستی تر بنووسم . چونکە لەو ڕووانەوە شتێکی ئەوتۆ ڕۆشن نەنووسراوە کە پیویست بە



لێدوان نەکا . بەڵام لەبەر ئەوەی مەسەلەی عەلی بەردەشانیو میرایەتی پاشایانی بەبەو ژیانیو بەینەکانی ، پرۆژەیێکی تایبەتەو ماوەیێکە خۆم بۆ تەرخان کردووە . نامەوێ هەروا سەرپێ‌یێ دەربارەی ئەو بابەتانە بدوێم . جگە لەوەی هێشتا زۆر لایەنی ئەو بابەتانەم لەلا رۆشن نەبووەتەوە .

بەگوێرەی ئەو پشکنینو زانیاریو ساغ‌کردنەوانەی تا ئێستا پێ‌یان گەیشتووم لەم وتارەدا ئەو کەسانە بەسەردەکەمەوە کە دەربارەی عەلی بەردەشانی نووسیویانە ، یان بەرهەمیان بلاو کردووەتەوە ، یا وەکو دەربارەی بەرهەمەکانی توێژینەوەیان تۆمار کردووە . نرخی ئەم وتارە لەوەدا دەبێ : کە هەڵەی ئەو نووسەرانە راست دەکەینەوە – دیارە بەگوێرەی بۆچوونی خۆم – هەروەها ئەو سەرچاوانە دەخەینە پێش چاو کە بەرهەمو باسو لێکۆڵینەوەیان تیادایە دەربارەی عەلی بەردەشانی) .

کاك دلشاد زیرەکانە بە ناخی گۆڤارو رۆژنامەو کوردی‌یە کۆنەکاندا گەراو پیرەمێردی نەمری شاعیرکردە سەر دەستە کە لە ساڵی ١٩٤٧وە شیعرەکانی بەردەشانی بلاوکردۆتەوە . ئینجا مامۆستای خوالێ‌خۆشبو محەمەد تۆفیق ووردی لە ساڵی ١٩٦١ . دوا بە دوای ئەم دوو نەمرانە مامۆستا عەبدولحەمید حوسێنی لە ساڵی ١٩٨١ ئینجا بەرێز فاروق حەفیدو هی‌تر .

دوا بە دوای ئەمە مامۆستا مەریوانی هاتە سەر خوێندنەوەو لێکدانەوەی بەیتەکانی شاعیری میللی کورد عەلی بەردەشانی بە تایبەت بەیتی راو ـ کیسەڵ ـ پیوازان ـ بەیتی ئەورەحمان پاشای بەبە ـ بەیتی خوازێ یان بەیتی شایی دۆڵەبی ـ هەرچەندە ئەم بەیتەی دوایی تەواو نیە بەڵام دەتوانین بڵێین ئەمە بۆ یەکەم جارە بەم شێوەیە رووناکی دەبینێ ـ بەیتی شایی جندوکان یان بەیتی قوڵەشین .

ئەوەی شایانی باسە کاك دلشاد بە ئەمانەت نێوی هەموو گۆڤارو رۆژنامەو بلاوکراوەکانی شیعرەکانی عەلی بەردەشانی کردو تا لاپەرەکانیشی دەست نیشان کردن . لە کۆتایی باسەکەدا کۆمەڵێك پرسیار ئاراستەی کاکی موحازیر کراو چەند برادەرێکیش رای خۆیان لەبەردەم مایکرافۆن پیشاندا .

- دلشاد محەمەد ئەمین فەتاح مەریوانی .
- لە ١٩٤٧/٣/٢٨ لە شاری سلێمانی لە دایك بووە .
- لە حزیرانی ١٩٧٢ کۆلێجی ئادابی – زمانانی لابراو – تەواو کردووە .
- چەندان ساڵە وەك مامۆستای زمانو ئەدەبی کوردی کار دەکا .
- لە ساڵی ١٩٧٧وە لەگەڵ خوشکی چیرۆك‌نووس شیرین کەمال احمد هاوسەرنو بەرهەمەکەیشیان سیڤاو رۆزایە .
- چاپکراوەکانی : فرمێسكو زەردەخەنە ، یەکەم هەنگاو ـ پێشوازی خاوەن شکۆ ، بین بە تیشك ، دێر یاسینو چەندانی‌تر .

## ئەنتیخیومای فۆلکلۆر

لە رۆژی سێیەمدا کۆرێك بە ناونیشانی (ئەنتیخیومای فۆلکلۆری کوردی) بۆ کاك خالد جوتیار سازکرا . لە سەرەتاوە کاك ناظم دڵبەند بەخێرهاتنی ئامادەبوانی کرد ، ئینجا کاك جوتیار هاتە سەر باسەکەی‌و گوتی (نەك هەر مرۆڤ ئاوو هەواو

شارو گوندو گۆرانیو تا دوایی . بە بالآی بەرامبەریان نابڕێنو
تەواوەتی نانووشتێنەوە سەر دونیاو دەروونی هیچ لایەکیان ،
بۆیەیەو زۆر شتی لیّ دروست بووەو لیّی دەژی ،
فۆلکلۆریش لەو دونیایەوە دێو پەلو پۆو ڕەگی ئەو شتانە
لەگەلْ خۆی دێنێو مرۆڤیش تووشی سەرسوڕمانو گێژەنو
ئیسان دەکا . هەر مەسەلەی چۆنیەتی کۆکردنەوەو سۆراغ
کردنیشی ، بە بیروڕای زۆربەی زانایانی دونیا بەبیّ ئەتلەسێکی
فۆلکلۆری زەحمەتە کارەکە ئاسانتربێو بتوانریّ هەموو شوێنو
ناوچەیەك بکەوێتە بەر دەسەلآتی فۆلکلۆر خوازان . ماوەیەکیشە
هەولّو تەقەلآی تاقەکەسی بەبرەوو هەرمێنە . ئەوەی هەستی بە
مەترسی لە ناوچوونو لەیاد چوونەوەو بناوکردنی بابەتە
فۆلکلۆرییەکان دەکرد) .

دوا بە دوای ئەمە کاك جوتیار بە ناخی باسەکەیدا چووە
خوارەوەو بەم جۆرەی خوارەوە دابەشی کرد :

- سەرنجێکی خێرا
- ئاوردانەوەیەك
- فۆلکلۆری خێرو شەڕ
- بەیتی شۆڕ مەحمود ، ئەوەی شایانی باسە ، ئەم باسەی

کاك خالد لەسەر لایانی خێرو شەڕی بەیتی شۆڕ مەحمود بوو کە
لە کتێبی لیرەیەك لە گەنجینەی نەتەوەی کوردی کاك ئەسعەد
عەدۆ لە سالّی ١٩٨٤ بلآوکراوەتەوە . وە بۆ ئەم مەبەستە
چەندان نموونەی بەیتەکەی هێنایەوە .

- بەیتەکە لە ڕووی شێوەی دەربڕینەوە .
- لێکدانەوەیەکی دونیای بەیتەکە

لە کۆتایی باسەکەدا چەندان برادەری فۆلکلۆر پەروەر
کەوتنە گفتوگۆ کردن لەسەر باسەکە .

### جەژنی ڕۆژنامەگەری

نەقابەی ڕۆژنامەنووسانی لقی کوردستانی بە چاودێری بەڕێز
یەحیا جاف سەرۆکی ئەنجومەنی ڕاپەڕاندنی ناوچەی
کوردستان ، لە یادی جەژنی ڕۆژنامەگەریدا ئاهەنگێکی بەم



بۆنەیەوە لە ڕۆژی ٢٢/٤/٩٨٦ لە هۆلّی ئوتێلی هەورەماندا بەم
شێوەی خوارەوە سازکرد .

- دەقیقەیەك ڕاوەستان لەسەر گیانی شەهیدان
- وتەی نەقابەی ڕۆژنامەنووسانی عیراق — مەلّبەند — لە
لایەن بەڕێز مغاذ عبدالرحیم خوێندرایەوە .
- وتەی نەقابەی ڕۆژنامەنووسانی لقی کوردستان لە لایەن
بەڕێز محەمەد ئەمین محەمەد ئەمینداری گشتی ڕۆشنبیریو لاوانو
سەرۆکی لق خوێندرایەوە .
- چەندان بروسەکە بە بۆنەی ئەم جەژنە لە لایەن بەڕێز
یەحیا جاف ، جەعفەر بەرزنجی پارێزگای سلێمانیو طه البصری
سەرۆکی نەقابەی ڕۆژنامەنووسانی عیراق ، یەکێتیی ئەدیبو
نووسەرانی کورد لقی کوردستان ، نەقابەی هونەرمەندانی
هەولێر ، بەڕێوەبەرایەتی ڕوشنبیری جەماوەر ، زانکۆی
صلاح الدین .
- چەند گۆرانیەك لە لایەن هونەرمەندانی کچو کوڕانی
شاری هەولێر ، پێشکەش کران .

### هەولێر

هەردیسان نەقابەی ڕۆژنامەنووسانی لقی کوردستان لە ڕۆژی

٩٨٦/٤/٢٣ له هۆڵی بنکەی تەندروستی‌دا . کۆڕێکی بۆ مامۆستا کەمال رەئووف محەمەد بە ناونیشانی (یەکەم رۆژنامەی هەولێر) سازکرد . لە سەرەتاوە کاك سەلاح شوان بەخێرهاتنی ئامادەبوانی کردو کەمێك لە ژیانی کاك کەمالی بە ئامادەبوان راگەیاند .

دوا بە دوای ئەمە مامۆستا کەمال باسەکەی لەبەر درێژی کورت کردەوە . لە پێشـەکی باسەکەیدا وتی (هەموو سەرچاوە ناسراوەکانی وەك مێژووی رۆژنامەگەریی کوردیی‌و رابەری رۆژنامەگەریی کوردیی . . . تاد . کە باسی نوخشەی رۆژنامەنووسیی نێو باژێری هەولێریان کردووە . ناوی دوو گۆڤاریان هێناوە : روناکی‌و هەتاو کە یەکەم هەفتانەو دووەم پازدە رۆژیی بووە .

بۆ رۆژنامەیێکی نۆبەرەیش کە ناوی دیاربێت . ئەو تا کە هەواڵە دووبارە کراوەتەوە کە دەڵێت : کۆمەڵێ مامۆستای هەولێر لە (١١)ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٠دا هەتا نێزیکەی سێ ساڵ رۆژنامەیێکیان بە ناوی (هەولێر)ەوە بە عەرەبیی‌و کوردیی بلاوکردووەتەوە) . دوا بە دوای ئەمە وتی (بەم پێیە ناچار بووین هەر ئەو تا کە ژمارەیەی رۆژنامەکە بخەینە روو کە لە گەنجینەی بە نرخی مامۆستای زانا (شێخ موحەممەدی خاڵ)دا دۆزیومانەتەوە . . هیوادارین ئەم کارە -مۆمە- داگیرسانی چراێکی بە دوودا بێت‌و رووی هەموو نهێنی‌یێکی ئەو رۆژنامەیە ئاشکرا بکات) .

باسەکەی مامۆستا کەمال لە دوو بەشی سەرەکی پێك هاتبوو . کە بە گشتی بەم جۆرەی خوارەوە دابەشی دەکەین :

- رۆژنامەی هەتاو ١٩٤٨
- پێداچوونەوەی
- تێکستی بابەتەکان
- رەوشت‌و ئامانجی غەزەتەکە
- خاوەندی رۆژنامەکە
- نووسەرەکانی
- بارو دۆخی دەرچوونی
- دەنگدانەوەی دەرچوونی
- چارەنووسی
- ئەنجام
- پاشکۆ

لە کۆتایی خوێندنەوەی باسەکەی مامۆستا کەمال . لە لایەن ئامادەبوان گفتوگۆی لەسەرکرا .

## لەسلێمانی

«ئازاد» ئامادەی کردووە

**پیشانگا** :-

لە رۆژانی ٢٢-٣ تا ٢٨-٣-١٩٨٦ دا و لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی . بەرێوەبەرێتی‌ی رۆشنبیری‌ی جەماوەر لە سلێمانی پیشانگایەکی تایبەتی‌ی بۆ قوتابی‌ی هونەرمەند «شۆرش



ئیبراهیم» کردەوە ، تیایدا نزیکەی پەنجاوپێنج کاری هونەریی خۆی پیشاندا . کە تێکەڵ بوون لە کاری (بۆرەك ، وەمەرەکەب ، وقەڵەم ، وپەستیل ، وزەوی ، وچیمەنتۆ ، ومس) .

● ئەمە یەکەم پیشانگای تایبەتیی ئەو قوتابی یە هونەرمەندە بوو .

● شۆڕش ئیبراهیم لە ساڵی ١٩٦٥ دا لە سەرچنار هاتۆتە ژیانەوە .

وێرای ئەم پیشانگا تایبەتی یە لەم پیشانگایانەدا بەشداری کردووە :-

● پیشانگای قوتابخانە سەرەتایی و ناوەندیەکان .

● پیشانگای هاوبەشی قوتابخانە ناوەندیەکانی «دیالی» .

● پیشانگای فیستیڤاڵی ساڵانەی پەیمانگای هونەرە جوانەکان لە سلێمانی ساڵانی ٨٢-٨٣-٨٤-١٩٨٥ .

**شانۆ** :-

**«رۆژی شانۆی جیهانی»**

وەکو نەریتێکی جیهانی رۆژی ٢٧-٣ ی هەموو ساڵێك بۆ یادی شانۆو هونەرمەندانی شانۆیی لە جیهاندا تەرخان کراوە ، بۆیە لەو رۆژەدا ولە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا چەندان ئاهەنگ ساز دەکرێ و تیایدا چەندان نمایشی شانۆیی پێشکەش دەکرێ .

لە سەر شانۆی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی ، بەشی شانۆی پەیمانگای ناوبراو ئاهەنگێکی بچکۆلەیان بەم بۆنەیەوە ساز کرد ، سەرەتا مامۆستا «ئەحمەد سالار» وتارێکی سەبارەت ئەو رۆژو بۆنەیە خوێندەوە و دوا بەدوای ئەوەیش قوتابیانی بەشی شانۆ ئەم نمایشانەیان کردە دیاری بۆمان :

● **مرۆڤێکی ئاسایی** :-

ئەم شانۆیە لە نووسینی کاك «رەئوف حەسەن» و دەرهێنانی قوتابی «ئاکۆ عومەر» بوو ، ئەکتەرەکانیش لەم قوتابیانە پێکهاتبوون :- نیاز لەتیف ، بەکر فەرەج ، سەرکەوت حەمە سەعید ، ژیان ساڵح .

● **یەکگرتن** :-

ئەم کارە بریتی بوو لە «پانتۆمایم» ێك قوتابی «بەهزاد مستەفا» بە ئامادەکردن و دەرهێنانی هەڵسابوو .

لەو قوتابیانەی وەکو ئەکتەر بەشداریان تێدا کردبوو :- تەها حەمە ئەمین ، ماهر حەسەن ، کاوە تۆفیق ، ڤیان کەمال ، هیوا سوعاد ، ئامینە ساڵح ، جوان سەعید .

**کۆڕ** :-

**«شانۆی منداڵ و پەروەردە»**

«لە گرنگترین بەهاکانی سەدەی بیستەم دۆزینەوەو پەروەردە کردنی بەهرەی منداڵانە ، رۆشنبیریی منداڵیش کارێکی راستەوخۆی لەسەر پێکهێنانی کاراکتەری پیاوانی پاشە رۆژەوە هەیە ، وەك دەبینین دواکەوتنی رۆشنبیری وهونەر وزانست لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لە زۆر رووەوە هۆکەی بۆ سەردەمی منداڵی تاکەکانی ئەو گەلە دەگەڕێتەوە» .

بەم جۆرە هونەرمەند «رزگار کریم» دەستی بە خوێندنەوەی ئەو باسە پەروەردەییەی کرد لە کۆڕێکدا کە دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی - لقی سلێمانی لە رێکەوتی ٨-٤-١٩٨٦ دا لە هۆڵی رۆشنبیریی جەماوەر لە سلێمانی بۆی سازکرد .

کاك رزگار باسەکەی بەسەر ئەم بەشانەدا بەش کردبوو :-

١ - دراما وشانۆی رووداوی مێژوویی .

٢ - چۆن بابەتی زانستی دەکەینە دراما .

٣ - دراما وبابەتی ئەدەبی وکۆمەڵایەتی بۆ قوتابیان .

لە سەرەتای خوێندنەوەیدا خاوەن باس ئەوەی دەسنیشان کرد کە باسەکەی زیاتر ئاراستەی لایەنە پەروەردەییەکان دەکات وئەمە پێشنیارێکە لە بواری تیۆریدا دەخرێتە روو بە هیوای چوونە بواری پراتیکەوە بۆ وەدی هێنانی نەوەیەکی رووناکبیر و ئاسۆفراوان کە لە رێی پەروەردەیەکی هونەری و زانستیی دروستەوە دێنە گۆڕێ .



هەر بۆیە کاك رزگار ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە پەروەردە کردنی منالّ لە ڕێی دراماوە چەند ئامانجێك دەپێکێت لەوانە :-

١ - ڕێگایەکی دیموکراسیانە لە نێوان قوتابیو هاوڕێکانی و بارودۆخی مالّەوە ونێو مامۆستایاندا دروست دەکات بۆ سەربەستی پێدانیان لە ڕادەربریندا .

٢ - خەیاڵی منالاّن فراوان دەکات .

٣ - منالّ متمانەی بە خودی خۆی لا دروست دەبێت .

لە کۆتایی باسەکەدا هەندێك لە ئامادەبووان ڕاوباری سەرنجی خۆیان سەبارەت باسەکە خستە ڕوو و بەمە کۆتایی بە کۆڕەکە هێنرا .

- ڕانیە-

**شانۆیی «تەرازوو»**

لە نووسینی نووسەری کۆچ کردوو مامۆستا «ئەمین میرزا کەریم» ودەرهێنانی هونەرمەندی لاو «محەمەدی مەلا ئەسعد» تیپی «بیتوێن»ی سەر بە مەڵبەندی لاوانی ڕانیە شانۆیی «تەرازوو» یان لە ڕۆژانی ١٨-١٩-١٩٨٦/٣/٢٠ دا پێشکەش کرد ، لەوانەی بەشداریان لەم بەرهەمە هونەریەدا کردبوو :-

کاوە ئەحمەد محەمەد ، کەژاڵ عەبدوڵلا ، دیاری حەمەد ئەمین ، ئیبراهیم عەزیز ، مستەفا ئەحمەد سەعید ، جەمال حاجی سێتاجیانی ، بەکر حەسەن ، جەبار شەریف ، خەدیجە محەمەد رەسولّ ، خەدیجە حەمەد ئەمین ، کامەران مەحمود . ئەنوەر شێخانی ، بەهمەن رەحمان . . . . و هەندێکی تر .

ئەوەی شایانی باسە جەماوەرێکی زۆری ڕانیە ئەم نمایشنامەیەیان بینی .

- **چەمچەماڵ** -

لەم دواییەدا هەواڵی چەند چالاکیەکی هونەریمان لە «چەمچەماڵ» ەوە پێ گەیشت ، کە نیشانەی سەرەتایەکی لەبارو پرشنگدارە بۆ جموجۆڵێکی هونەری لەوێو ئێمەیش ئاواتی بەردەوامیان بۆ دەخوازین .

● لە ڕۆژانی ١٤-تا-١٩٨٦/٣/١٩ شانۆیی «شارەکەم» لە نووسینی «عەزیز نەسین» و دەرهێنانی «ئارێز» بەردەوام پێشکەش کرا . لەو ئەکتەرانەی لەم بەرهەمەدا بەشدار بوون (سیروان رەحیم ، محەمەد مەحمود ، فایەق عەزیز ، بەکر



مەحمود . موەفەق قادر . کەریم شەریف . ئیبراهیم ئەحمەد ، تالیب عەبدولکەریم . هیوا نوری . نەجات عەزیز . دلێر محەمەد ئەمین . پەخشان نوری . ئامین جەوهەر . کوێستان کاکەخان . سەعدیە نوری . هەروەها منالآن :– نەرمین شاسوار . وزانا فاتیح .

● بە بۆنەی رۆژی شانۆی جیهانیەوە لە ۳/۲۷ دا ئاهەنگێك سازکرا . سەرەتا کاك ئاریز وتاری نیقابەی هونەرمەندانی سلێمانی وهەروەها وتارێك لە بارەی ئەو بۆنەیەوە خوێندەوە . پاشان کاك «عومەر بێبەش» باسێکی سەبارەت پەیوەندیی شانۆ بە بینەرەوە پێشکەش کرد . دوای ئەویش کاك «سیروان رەحیم» راپۆرتێکی مێژوویی سەبارەت جموجۆڵی شانۆیی لە چەمچەماڵدا خوێندەوە .

● لە هەمان رۆژی ناوبراودا دوو شانۆیی‌ی دی پێشکەش کران :– ۱ – «گۆرانی‌ی چایکا»ی چیخۆف و وەرگێرانی ئەحمەد سالار –۲– شانۆیی‌ی «دەریا» لە نووسینی «رەشاد نوری» وکاك ئاریز بە دەرهێنانیان هەڵسابوو . لەوانەی لە شانۆیی «دەریا»دا بەشدار بوون :– بەکر مەحمود . سیروان رەحیم . محەمەد مەحمود . دلێر محەمەد ئەمین . ئەنوەر محەمەد سالح . . . و هەندێکی دی .





– **قەڵادزێ** –

تیپی نواندنی قەڵادزێ – سەر بە مەڵبەندی لاوان لە رۆژانی ۱۰–۱۱–۱۹۸٦/٤/۱۲ دا لە پێشکەش کردنی شانۆیی‌ی «کامە رەوایەو کامە نارەوا» کە لە نووسینی هونەرمەندی لاو «شەفیق محەمەد» و دەرهێنانی کاك «کەمال محەمەد ئالانی»یە بەردەوام بوون .

دەورەکان بەم پێیە دابەش کرابوون :–

کرێکار – عومەر محەمەد ئەمین

ژن – زریان مەحمود حاجی

پاشا – سابیر عەبدوڵڵا

کەسی (۱۰) – ئازاد مستەفا

فریشتە – رەوەند حەسەن

کەسی (۱) – (ئارارات حەسەن ئەحمەد)

کەسی (٥) – نزار رەسوڵ

بەڵێندەر – کەریم حەسەن



فەرمانبەرێك - حسێن مەحمود
دەنگ - دلشاد حەسەن
منالێ - هەردی قادر
کارە هونەریەکانیش بەم جۆرە هەلسورێنرابوون :-
بەرێوەبەری شانۆ - سەلام عومەر
مۆسیقا - حسێن مەحمود
پۆستەر - (عوسمان حسێن
(عوسمان رەسولێ
دیکۆر - حەمید عەبدوللا ، ئاسۆ رەسولێ

## لەدهۆك

ئامادەکرنا : مەتین

## «پێشانگەهەکا فولکلوری»

بهەلکەفتنا جەژنێت نیسانێ‌و ل ژێر چاڤدێریا هێژا محمد أمین عبوی جێگرێ پارێزگەرێ دهوکی ل رێکەفتی ٧-٤-١٩٨٦ پێشانگەهەکا تشتێت فولکلوری هاتە ڤەکرن ل هولا چالاکیێت خاندنگەها .

ئێکەتیا نیشتمانی یا قوتابیاو لاواو رەوشەنبیری جەماوەرو رێبەریا چالاکیێت خاندنگەها پشکداری دڤێ پێشانگەهی دا کربون . ژ کەل‌پەلێت فولکلوری کوردەواری یێت ناڤ مالێ یێت کو هاتینە پێشچاڤکرن ئەڤێت ژێری بون .

- (چوخك‌و کەپەنە . بەرك . مێزەر . مەحفویر . تێر . چانتك خرار ، پارزوین . جل‌و بەرکێت مللی یێت ژناو زەلاما ، گۆرەو ساق‌و کولاڤ‌و دەزبلوینك) .
- (ئامانێت داری یێت نەخشین . کلۆز . لالیکێت ئاخێ . کەفچکێت داری ، هەسکوی . تیرۆك‌و نان‌وەرگێرك‌و خانك‌و مەشك باسك‌و قەلوین ، گۆپال . خەتیرە) .
- «پێلاڤێت مللی‌و رەشك‌و کالك . تزبیێت داری‌و یێت کەزوانا ، شەکر شکێنك‌و جوهنی» .

ئەڤەو هژمارەکا کێم یا کورێت دهوکێ خەمخورێت کەلەپوری نەمرێ بێ باب‌و باپیرا هاتنە پێش ڤێ پێشانگەهێ ژ بەرکو گەلەك نەماو هندەك پێشانگەهێت دی هاتنە دبەررا . دا پێشانگەها بێ‌قام یا بسەرکەتی بیت ئەگەر :

- هەر تشتەکی ناڤێ وی لسەر نڤیسیبا .
- جە بێ بەرفرەهـ باو چ پێشانگەهێت دی نەهاتبانە د بەررا .
- کارێت هاتینە پێشچاڤکرن دکێم نەبان .
- دەلیلەك هاتبا چێکرن بو تشتێت پێشانگەهێ .



## «چەند پێشانگەهێت هەمەرەنگ»

● ب بونا جەژنێت نیسانێ‌و ل ژێر چاڤدێریا هێژا ئەمینداریێ نهێنی یێ تایێ دهوکێ یێ پارتا بەعسا عەرەبیا هەڤپشکی ل رۆژا ١٩٨٦/٤/١٠ ل هولا خاندنگەها تأمیم ، پێشانگەهەکا وێنێت فوتوگرافی هاتە ڤەکرن ، ژ بزاڤێت ریبەریا چالاکیێت قوتابخانا . ڤان وێنا بزاڤێت هەمی خاندنگەها بو مە خویا کرینە ، کو دیسان وەرارو دەستکەفتێت پێشەسازی‌و کشتوکالی‌و ئاڤاهیی ، ل پارێزگەها دهوکێ پێشچاڤکرینە . هەروەها ئاهەنگ‌و بزاڤێت دهێنە کرن بهەلکەڤتنێت نەتەوەیی‌و نیشتیمانی د ڤان وێنادا د دیاربون .

ئەڤەو هژمارەکا باش یا بەرپسیاراو کورێت بازێرێ پارێزگەهی هاتنە پێش ڤێ پێشانگەها بەرکەڤن ، نێزیکی چار پێنج رۆژەکا ل دویف ئێك .

● هەر بڤێ هەلکەتنێ‌و ل هەمان رۆژێ هێژا رێبەرێ گشتی یێ پەروەردێ ل دهوکێ پێشانگەکا بەلاڤوکێت تاقا ڤەکر یێت تایبەتی ب وەرزشیڤە ل هولا بزاڤێت ڤێرگەهی ، هەمی خاندنگەهێت دهوکێ پشکداری دڤێ پێشانگەهێ‌دا کرو کارێت وان بێ‌قام د داهینەرو ژێ‌هاتی بون . نیزیکی حەفتیەکێ قوتابیێت دهوکێ سەردان برنە پێشانگەهی .

● دیسان ل وێ رۆژێ هێژا پارێزگەرێ دهوکێ پێشانگەهەکا بەرفرەهـ یا (وسائل تعلیمیە) ڤەکر .

هەمی خاندنگەهێت دهوکێ پشکداری دڤێ پێشانگەهی دا کرن‌و هژمارەکا مەزن یا ماموستایا هاتنە پێش .

## «ئەیازێ نەمرو کۆرەك ل زاخو»

ژ بزاڤێت دەزگەها رەوشەنبیری‌و بەلاڤکرنا کوردی ل بازێرێ زاخۆ ل رێکەفتی ١٩٨٦/٤/٨ل هولا بوتان کۆرەك هاتە سازکرن بو کەکێ نڤیسەڤان هێژا سکڤان عبدالحکیم ل ژێر ناڤنیشانا (ئەیازو سترانا کوردی) .

هێژا سکڤان یوسفی رێڤەبەریا ڤی کۆری کر .



ژ رێڤە هێژایی موحازر تابەکێ لسەر ژیانا هونەرمەندێ نەمرو دەستپێکرنا وی‌یا هونەری‌و چونا وی بو ئێزگا کوردی لسالا ١٩٨٢ ئاخفت .

د دویڤدا بدرێژی بەحسێ سترانێت وی کر یێت کو بو ئێزگی‌و تەلەفزیونێ تومارکرین ، دیسان هوزانڤانێت – خودێ لێ‌خوش‌بوی – هوزانێت وان کرینە ستران . پاشی دەورێ وی د پێشخستنا سترانا کوردی ، لڤەلەم‌داو بو مە هندەك بیرهاتنێت خو لگەل ئەیازی بەحس کرن .

ل دویماهیێ هژمارەك هەلبەستێت شعری ژ مەرا خاندن یێت وان شاعرو نڤیسەڤانا ئەڤێت بهونەرمەندێ نەمر گوتین ، ژ وان د . بدرخان سندی ، صبری بوتانی ، محمد سلیم سواری ، هشیار محمد حسن ، نور الدین سعید ، بدل رڤو مزوری ، سکڤان عبدالحکیم .

ئەڤەو ڤی کۆرێ خوش نێزیکی سەعەت‌و نیڤا کێشا ، هژمارەکا بەرفرەهـ یا رەوشەنبیری‌و ئەڤینداریێت هونەرێ کوردی‌یێ رەسەن‌و ئەڤینداریێت سترانا ئەیازێ نەمر ، لێ ئامادەبون .

نەهـ شاعرا پشكدارى دڤى خاندنىێدا كرن ، هزرڤانىێ شاعر هەر وەكى هەمى جارا كەتە پێشيا كاروانىو شعرا خو خاند ل ژێر ناڤنيشانىێ (ئەڤيندارم ئەز) د دويڤدا ل پەى يەك ڤان شاعرێت ژێرى خاندن :

هشيار محمد حسن (دێران) ، شكرى شهباز (ڤەگەريانەك ژ جيهانەكا بەرزەبوى) ، هيڤي بەروارى (لىێ دوتمامىێ) ، خالد حسين (ئەزو دل) ، رمضان عيسى (داستانا عشقەكا نەمر) صديق شرو (رۆژەك) ، محسن قوچان (صەد چريسەك د (گاڤەكىێدا) ، سلمان كوڤلى (سىێ پەيڤ) .

**«كۆڕەك لسەر رۆژنامەگەريا كوردى»**

ل رۆژا شەمبيێ رێكەفتى ٢٦-٤-١٩٨٦ ژ بزاڤێت دەزگەها رەوشەنبيرىو بەلاڤكرنا كوردى كۆڕەك هاتە سازكرن لسەر رۆژنامەگەريا كوردى بو كاك «وصفى حسن»ى ل هولا بزاڤێت خاندنگەها . كەكىێ صديق شرو ىرێڤەبەريا ڤى كۆڕى كر .

هژمارەكا ئەديبو نفيسڤانێت دهوكىێ لىێ ئامادەبون . ژ رێڤە كاك وصفى بەحسىێ بونا رۆژنامەگەريا كوردى كر ، پاشى بدرێژى رۆژنامەگەريا كوردى ل عيراقىێ ل قەلەمداو بێهنەكا خوش مێژووا گوڤارو رۆژنامێت كوردى عيراقىێ ل رۆژا پەيدابونا وانو هەتا سالا ١٩٥٨ پێشچاڤ كرن . د دويڤدا چەپدا ناڤەروكا ڤان بەلاڤوكا وكاركەرێت تێدا شول دكرنو دەورىێ وان د پێشێخستنا رۆژنامەگەريا كوردىدا ، ئەڤەو لكوتاييا كۆڕى هژمارەكا برادەرا كەتنە قادا دان ستاندى لگەل كەكىێ موحازر لسەر بيرو رايێت د موحازەرا وىدا هاتينو كۆڕ بكوتاى هاتو نێزيكى سەعەتو نيڤا كێشا .

**«پێشانگەها «سالم كورد» يا كەسوكى»**

ژ چالاكيێت دەزگەها رەوشەنبيرىو بەلاڤكرنا كوردىو بچاڤدێريا سەيدا قائمقامىێ دهوكىێ ل رێكەفتى ٢٧-٤-١٩٨٦ پێشانگەها كەسوكى يا ئێكىێ يا هونەرمەند «سالم كورد»ى هاتە ڤەكرن ل هولا بزاڤێت خاندنگەها .



**(سىێ پێشانگەهێت دى)**

● بەهلكەڤتنا بونا سەرەكىێ فەرماندە (خودىێ بهێليت)و ل ژێر چاڤدێريا هێژا پارێزگەرىێ دهوكىێ ل ئێڤاريا رۆژا ٢٧-٤-٩٨٦ ل هولا ناڤنجيا گارە پێشانگەهەكا سيراميكىێ هاتە ڤەكرن .

ناڤنجيا (هێژاو سەرسنكو گارە) پشكدارى دڤىێ پێشانگەهىێدا كربون بسيراميكىێو كارێت دەستى .

ديسان هەر بڤىێ هەلكەڤتنىێو ل رێكەفتى ٢٨-٤-٩٨٦ . دوو پێشانگەهێت دى هاتنە ڤەكرن ژ لايىێ رێبەرىێ گشتى يىێ پەروەردىێڤە . پێشانگەهەك ژوان ، يا خاندنگەها (القادسيه) بوو يا دى يا خاندنگەها (التأميم) .

**«ئێڤاريەكا خاندنێت شعرى»**

ژ چالاكيێت رەوشەنبيرى جەماوەرو بەهلكەتنا جەژنێت نيسانىێو رۆژا رۆژنامەگەريا كوردى ، ئێڤاريەكا خاندنێت شعرى هاتە سازكرن بو شاعرێت دهوكىێ رێكەفتى ٢٤-٤-٩٨٦ ل هولا بزاڤێت خاندنگەها . هژمارەكا بەرفرەهـ يا رەوشەنبيرو ئەڤيندارو شەيدايێت شعرىێ لىێ ئامادەبون .

نفيسڤانىێ برا هێژا رشيد فندى شاعر پێشكێش كرن .

ئەڤ پێشانگەهە ژ ٤٠ کەڤالا پێك‌هاتیە ، ئەڤە ژی ناڤنیشانێت هژمارەکا وان کەڤالانە :

(وێنە ژ جەنگی – ژنکەك ژ مویسل – رویچکێ زاروەکی – چاڤەرێ – رویچکێ هونەرمەندەکی – تاخەکێ مللی – شێر – سەروکێ فەرماندە – بیرهاتنا کوشتنا ئێخسیرێت عیراقێ – کچەك ژ کوردستانێ – سیار – قیریا بریندارەکی . . .) کەرەستێت ژێری بو چێکرنا ڤان کەڤالا هاتبونە بکارئینان : (رەنگێت ماجك – رەنگێت ئاڤی – پێنڤیسێ جاف ، رصاص – رەژوی – زەیت .) . کاك فەهمی بالایێ هونەرمەند ل پێشانگەهێ یێ ئامادەبو ، بومە رایا خو دەربارەی ڤێ پێشانگەهی خویاکر کەرمکر گوت :

دگەل سوپاسیێت گەرم بو هەستێ ڤی گەنجی‌و خەمخوری‌و رەنجا وی بەرامبەر کارێ هونەری‌و ڤەپێش ئێخستنا هونەرێ کوردی . من دڤێت چەند ئاخفتنەکا دیاربکەم د ڤێ پێشانگەهێ‌داو هیڤی‌دارم سینگێ ڤی هونەرمەندی‌و هەمی هونەرمەندا یێ بەرفرەه‌بیت‌و د پاشەروژێ‌دا ببنە مێرخاسێت مەیدانا هونەری .

ڤی هونەرمەندی گەلەك یا خو زەحمەت دای‌و ملێت خو پێت بن‌را برین ، لێ لگەل هندێ لنك من دوو رێباز ژێ ڤ دەردکەڤن ، رێبازا ئێکێ پێتر لسەر لایێ بازرگانی‌ڤەیە ، یا دی ئەڤ هونەرمەندە پێتر گرێدایە ب خاندنگەهێت کەڤن‌و کلاسیکی‌ڤە . بەلێ دگەل هندێ کارێت قەلەمی گەلەك هێزو هێلێن بێ ترس یێت تێداو کارەکێ هونەرییێ ب هێز لڤێرێ دیاردبیت ، هونەرمەند دشێت‌و شیایە زال بیت لسەر هونەرێ خوە . دیسان من داخوازا ژ هونەرمەندی هەی کو گەلەك رەنگێ سپی دکەڤالێن خو یێن زەیتی‌دا بکار نەئینیت . . داکو بشێت پێتر تەکنیکێ بکار بینیت د کەڤالێن خودا . هیڤیا پاشەروژەک گەش بو هونەرمەندی دخازم ، هیڤی دارم هەر دەم یێ ڤ سەرکەفتی بیت دژینا خویا هونەری‌دا .

● سەمه کورد ●



– ل سالا ١٩٥٦ لباژێرێ شێخان هاتیە دنێ .

– خاندنا خویا سەرەتایی‌و ناڤنجی لمویسل بدوماهی ئانینە .

– د هەمی پێشانگەهێت بەرفرەهـ یێت شێوەکاری ل بەغداو مویسل پشکداری‌کریە .

– هەیامەکێ کار کریە وەکو (مصمم) ل روژناما (الحدباء) .

– نهو ژی فەرمانبەرە ل چاپخانا زانکویا مویسل .

**«ئەڤین‌و مەم‌و زیناخانی»**

ژ چالاکیێت دەزگەها رەوشەنبیری‌و بەلاڤکرنا کوردی ، ل رێکەفتی ٢٩–٤–١٩٨٦ ل هولا بزاڤێت خاندنگەها ، کورەك هاتە پێش‌کێش کرن بو سەیدایێ هێژا (رشید فندی) ل ژێر ناڤنیشانا :

«ئەڤین‌و مەم‌و زینا خانی» . هێژا «وصفی حسن»ی کور برێڤە برو هژمارەکا باش یا رەوشەنبیرێت دهوکێ لێ بەرهەڤبون .

ژ رێڤە سەیدایێ موحازر بکورتی لسەر ئەڤینێ‌و رەنگێت وێ ئاخفت ، ئو بەراوردکرنەك لناڤبەرا ئەڤینێ‌و ئەڤینا مەم‌و زینێ کر ژ لایێ ئەڤینا توخمی‌و ئەڤینا سوفیانزم‌و مشە نمونە



دەربارەی ڤێ چەندێ ژ ئەدەبێ کوردی ئانین . بتایبەتی ژ شعرێت نالی‌و جزیری .

ناڤەروکا بابەتێ سەیدای ئەڤ ئالێت ژێری باس کرن :

١ – گرنگیا ئەڤینێ ژ لایێ باشی‌و خرابی‌ڤە .

٢ – پێناسینا سوفیا بو ئەڤینێ .

٣ – ئەڤین‌و شریعەت .

د دویڤدا چیروکا مەم‌و زینا خانی ژ مەرا گێراو خویا کر کو نێتا خانی ب مەم‌و زینێ ئەوبو ، بیرو باوەرێت خو پێ رون بکەت‌و دارێژیت .

پشتی بابەتێ خو بدوماهی ئانی ، دەرفەت بو دان وستانێ ڤەبوو هژمارەکا برادەرها لسەر بیرو رائێت کەکێ موحازر ئاخفتن . ئەڤا ژێری ژی کورتیەکی ژێ :

● حجی جعفر : ب هزرا من بەراوردکرن ل ناڤبەرا سلمی جزیری‌و مەم‌و زینا خانی نە یا درستە . مەم‌و زین ئینایە وەکو رەمز دا یا د دلێ خودا پێ بێژیت .

سەیدای گوت د . عرالدین ژی پشتەڤانیا من دکەت ! ڤێت گوتبا ئەز پشتەڤانیا د . عزالدینی دکەم ، چمکی هێژای باوەرناما دکتورا پێ وەرگرتیەو نابیت مروڤ حەقێ خەلکی بخوت . یا دی ژی سەیدای گوت دێ خو قول‌و کویر داهێلم پاشی تنێ بو مە چیروك خاندو شروڤەکر .

● رشید فندی : هندەك برادەرێت هەین خو بچیروکێت خەیالی‌ڤە گرێددەن . هەر شاعرەك بو خو یارەکێ د گریت‌و د کەتە رەمز .

کی دبێژیت جزیری دەزگرەك هەبو ناڤێ وێ سلمی‌بو ؟

دەربارەی رایا د . عزالدینی ، ئەز پێ رایا خو دبێژم ، ئەز رایا وی د ئینم‌و د کەمە دەلیل دا یا من ژی پێ ب هێز بکەڤیت .

● صدیق شرو : پێتڤی‌بو هندە تشت هاتبانە رون کرن ژوان : «ئەگەرا نەدانا زینێ بو مەمێ چ‌بو ؟» یا دی مە دڤیا کاك رشیدی بو مە بەحسێ زینێ کربا جوانیا وێ .

● رشید فندی : ئەگەرا نەدانێ ، فەسادیا بەکروکی‌بو . هوزانێت وەصفا زینێ دکەن گەلەکن من نەدڤیا ئەز گەلەك درێژکەم .

ژ پسیارێت هاتینە کرن مە ئەڤە ژێ هەلبژارتن :

– چ جیاوازی هەیە ل ناڤبەرا مەم‌و زینا خانی‌و مەم‌و زینا فولکلوری ؟

چ پەیوەندی د ناڤبەرا ئەڤینا مەم‌و زینێ دایەو (الحب العذري) ل جزیرا عەرەبی .

– بەکروك چ کەس‌بوو ، مەبەستا وی ب کریارێت وی یێت نەمروڤانە چ بون ؟ .

ئەڤەو پشتی هێژایێ موحازر بەرسڤا ڤان پسیارا ب پێڤەهاتن دای کۆر ب کوتایێ ، هات‌و نێزیکی سەعەت‌و نیڤێت خوش مە ل گەل رابوارلندن .

# كاروان




مجلة ثقافية شهرية
تصدرها الامانة العامة للثقافة و الشباب
باللغتين الكردية و العربية

رئيس التحرير
محمد أمين محمد احمد

نائب رئيس التحرير
حسين عارف

46
تموز ١٩٨٦
السنة الرابعة

قصة كردية

# النفق

قصة / غفور صالح عبدالله
ترجمة: محمد صابر محمود

شخير كثيف ينحصر داخل غرفته ، يغدو بخاراً يلتحم بالريح الباردة في الخارج ، ليتحول على واجهة زجاج النافذة الى قطرات من الندى . . . بضعُ قطرات من الدموع المنهمرة على وجنتي امه المتغضنتين كانت تثير دهشته . . تُرى هل هي تحلم بموت أبي ؟ ام تراها تشعر ببرودة الوحدة ووحشتها ؟ ثم انها ومنذ مدة خلعت عنها ثياب الحداد ورمتها جانباً ! وهي ايضاً في بعض الاحايين تحيس وتتمايل أمام المرآة . . لماذا . . لا . . كلنا من ضحايا الوحدة . .» .

سبعة دنانير هي ايجار غرفته . بضع عوارض خشبية عوجاء مرصوفة رصفاً فوق لبنات من الطين . معظمها منخورة من مواضعها والبعض الأخر قد امتلأ بالشقوق من وسطه بفعل مداهمة السوس والأرضة . حيث تمسي خميرة مجموعة من الأحلام المليئة بالكوابيس المزعجة اثناء رقادات الليالي . . اشعال المصباح كان يدغدغ جناح الفراشة البيضاء القابعة فوق الجدار . والتي كانت تتعلق بخيط من خيوط الضوء راحت تتدلى . دندنة ذبابةٍ كانت تربكها ، شرعت بالدوران حول نفسها . . هو بدوره بدأ يبحث عن مصدر صوت الذبابة . كان حائراً . راح المصباح يتأرجح من جراء قوة دفع تيار الهواء من أجنحة الذبابة . .

في وقت من الأوقات ، كانت الوحدة جاعلة من نفسها قلادة تطوق عنقه الابيض الناصع . وكان الانتظار صرة مرمية في إحدى زوايا النسيان ، لكي تغدو فداءاً لعينيها الزرقاوين . لكن لحد الآن فما زال ذلك الفراغ الذي يصطخب فيه الكون مثل فقاعة ، يستحيل شكاً لايبين له أثر وسوف لن يملأه شيءٌ – اللهم – إلا اذا انتشلته يدُ الشيطان من هذا القبر الخرب . . ثم أن غرفته ليست هي الوحيدة التي تضيف بمن فيها حدّ الاعتصار ، حتى تأوي كل هؤلاء الناس البؤساء ، إذ أن معظم المدن مملوءة هي الأخرى لدرجة انك ينبغي ان تكون حذراً دوماً على ما في جيبك لئلا تفقد (جواز سفرك) أو يتعرض للنشل ، فتقع الطامة الكبرى وتبتلي . . .

عيناه لم تكونا لترتما عن منظر الذبابة ، والفراشة . . كانت الذبابة غارزة بجسدها في ظهر الفراشة ، فما عدا صوت قعقعة من اجنحتها . . ، لم يكن ليصدر عنه حتى ولا نأمة من أنين . . . بمشقة بالغة كانت الفراشة تدفع بنفسها باتجاه النور . . رعشةٌ معربدة تصاعدت من إبهام يده ، منسحبة الى الاعلى ، تكور على نفسه عقد ذراعيه ، فطوق بهما ركبتيه . كابوس رعبٍ قاتل راح يقيم في غرفته طقوس عرسٍ .

الصقت الفراشة صدرها بزجاج المصباح . في حينِ كانت الذبابة تقرض – على عجل – اجنحتها . سقاطاتها راحت تتراقص في مهب هواء الغرفة . كانت ممتطية ظهرها بأحكام لدرجة لا يكاد يتبين إلا القليل من لمعان لونها الابيض من تحت لون الذبابة الداكن الأسود. كان يشعر وكأن حسيس احتراق جسد الفراشة يثقب طبلتي اذنيه ، فيهمد في مكانه وينقطع عن الحركة . . .

راح يزداد احساساً وكأن الاحداث المرعبة التي مرت عليه طوال سنوات عمره ، تخضع – ثانية – امام عينيه لعملية مونتاج مثل فلم بوليسي . . أنشب انامله في موضوع الرأس من قلبه . . طنين الذبابة يختلط بضجيج الشخير كان يحبل رحم الغرفة . لم يتمالك نفسه . قلبه بدأ يتخافق ، انطلق خارجاً . .

كانت النجيمات المتفرقة تختنق خلل زرقة السماء الضبابية ، تذوب الواحدة تلو الاخرى .

«أما تخبرني ؟ كل هؤلاء المتشدقين المتزلفين من اصحاب الخناجر التي كل واحدة منها كانت تتسع لابتلاع ديك رومي على ضخامته ، وقت الامان ، اين هم الآن ؟ ولماذا كُمت افواههم هكذا ، وكأنها مختومة بقفل صندوق – أختر خان[1]

– . . . . ؟ .

– أجل . . . أليس من الجائز ، أن تهجرهم احضان زوجاتهم الوثيرة الدافئة . . ؟ ! .

– هل ترى من فارقٍ ، فيما بين غرفتك هذه ، وبين السجن . . ؟ !

- لماذا لا ؟ . . نعم . . نعم . . لا . . هو المعتقل . . !
- الفارق الوحيد هو . . ان صوت الاحذية الثقيلة لا يرن في ذنيك . .
- إن موتك وبقائك ، يتساقيان نخب بعضهما البعض خلال طقوس رقصته مشتركة لاحدى المقابر . .
- لكني ، أنا الواحد . . والامنيات بالآف . . .
- كيف يمكن لكل هذه الكائنات الحية المسلوبة ارادتها أن تأخذ مكان شيءٍ عظيم ؟ إذا هي تتدفأ - ليل نهار - في احضان لنسيان . . ؟
- إنها سوف تموت مثل الحيوانات ، تنتفخ ، تتعفن . . . منذ قرون وأنا يعتصرني حجر دهر مشاكس متقلب ، على حَدَبٍ من مسامير رغبة دنسة . ما افكر فيه هو ميتة مطمئنة . ليس إلا ، اما الذي ابحث عنه فهو مقبرة معلومة . . دفقات الألم من قلبي المكلوم من أيام طفولتي ، مع كل لذعة ، تدب في دمائي دبيب النمال . حتى أبويّ فقد كانا في شغل شاغل عني في اطار حنانهما الأبوي ، حيث لم يكونا ليبدلا لحظة من متع الاحتضان على فراش الزوجية في لياليهما بالآف من قطرات الدموع الحبيسة الحائرة في محجري . يومَ مولدي ، غرست والدتي فسيلة من شجرة البلوط ، وسط باحة بيتنا . راحت تُسابق اعوام عمري ، تنافسها ، فتسامقت حتى ملأت فروع اغصانها سماء الحوش ، إلى ان دنت نهايتها في صيف قائظ . فاختلط رماد اوراقها المحترقة بأنقاض البيت . اما انا فكما تراني الآن اتحول يومياً عشرات المرات الى رماد سجائري اتذرى على موائد السكر ، والعربدة ، لأمسي سماداً لحدائق الحانات في ليلة من الليالي . . ربما يكون الدهر كابوساً مكبلاً بالقيود ، يجثم فوق صدري ، . سجناً كبيراً مُحاطاً بسياجٍ حديدي . إن الكوارث الدامية تقوم بزيارة المساجين ، حاملةً اليهم هداياها من الجماجم المترعة بخمور الدماء . . من فرط اضطرابي ألوذ بتينك العينين اللتين دشنتا السكة الرفيعة لمسار حياتي ، كي تزيح إغفاءةً في حضنها الوثير عن جسدي التعب . . .» . . .

كان الناس يتحولون من خلال هالات اضوية المصابيح الى اشباح لصباحٍ باكر من صباحات ما بعد برودة فصل الخريف ، تنطبع على وجنة الشارع الملوثة بروث الحيوانات . مجموعةً من ذكور الكلاب ذوات العيون القادحة بالشهوة ، كانت تحاصر انثىً عجوزاً ، وقد كبسن رؤوسهن فيما بين افخاذهن . بعضها راح يرمق الغادي ، والرائح بنظرات شزراء ، ويصول . وكانت مطبقة على منتصف الزقاق .

اضطر أن يغير طريقه ، فأنسحب صوب جهة اخرى . . راح يأخذ بخناق كل من يصادفه ، يلح عليه كي يفسر له رؤياه . غير انهم ، وحال سماعهم لأول جملة ، يشهرون بوجهه ضجرهم ويديرون عليه ظهورهم متذمرين .

ثمة حشرجة لهدير امواج مياه (خاصة)[٢] الكدراء ، كانت تربك صمت المدينة ، وسكونها . . . إن هذا النهر بالذات فثمة لجةٌ عليلة من لجج ربيع متأخر ، تلمسُ عادة ضفافه المتعفنة .

وإذ حاول اخر شخص أن يفسر له رؤياه ، رفع بوجهه قبضة غاضبة . .

لم يكن يعلم لماذا يثير حلمه هذا كل هذه العبث ، والسوس تحت فروة جلده . ليس لديه ثمة من مجال للالتفات نحو مصدر الضوضاء . انهم جماعات ، وزمرٌ ، يحثون الخطى . يغزلون خيوط الشارع ثم يلفونها لفاً . . كان ينتابه شعور وكأن أمواج النهر هي الاخرى تتشهى حكاية حلمه هو . . أرخى الزمام لعضلات مُخه . كان يستعيد بعض قواه ، حالما يبدأ بسرد تفاصيل رؤياه على بواطن نفسه وعلى جفول الموجات المشدوهه البلهاء لمياه - خاصة - . .

كانت قطرات من دموعه المنسابة ، تنتفخ فوق سطح الماء ، ومن ثم تتحدّر نحو الضفة . . . .

**رؤيا القبو الأول :-**

صريخٌ آتٍ من مكان لامرئي . استفزه - اخذ يتشبث بكل الامكنة . مقلتاه راحتا تنطلقان من محجريهما فتسبقان رؤيته . شرع يفتش الغرف واحدةً بعد الاخرى . كانت مملوءة بالتماثيل

الفضية ، والاصنام الذهبية ، وهي تسجد خاشعة لإمرأةٍ عارية امامها . وقد اعتصرت ناهديها عصراً قوياً . في حين كانت نواظرها ترنو عالياً . . كلها كانت مصنوعة بعناية ، وحرص شديدين ، حتى كان يود لو يطفئ لهيب رغباته ولواعجه باحتضانها . . ثمة ضياء باهت مشوش كان يتهادى ، يقبل ، ويدبر في تلك الانحاء ، ثم رويداً رويداً يزداد غموقاً . وكمثل طفل تستهويه السباحة ، فيرى الامواج وهي تلّوح له بنظرات حادة غاضبة ، راح يشق غمار الضوء حذراً ، متمهلاً . شهقاتٌ ، وغمغمات مهتاجة كانت تمتزج هناك بندى الاشياء ، تتكاثف على شكل قطرات ، وتتصببُ على وجنة الارض ، مكونة بركة من العرق اللزج بارتفاع شبر .

كومةٌ من الاشياء المتناثرة المبعثرة . كانت تستقبل خطواته الوئيدة ، وهي تتراءى تارة وتختفي اخرى . عددٌ من اللوحات الملونة كان هامداً فوق ظهور الحيطان المرصعة باللآلئ . . . المسيح . . يهوذا . . القديسون . . وفي داخل بعض الأطر ايضا . يُرى اسم – الله – محفوراً بلون ذهبي . جذوةٌ من نار موقد يقبعُ داخل صدر الحائط الذي على يمينه ، كانت تتوقد خلل رماد الجمرات ، بفعل نسمة باردة من الهواء . .

صوتٌ غاضب لامرئي ، اذهله . .

– من اتى بك ها هنا ؟ إن مَنْ يأتي الى هنا ، عليه ان يغسل خطاياه باللظى . . والأ فهو كلب نجس . . يطرد الملائكة ، ويشردها . . ! .

استحالت صحوته كابوساً ، راح يمتص رغباته قطرة قطرة . . يكاد قلبه أن يندلق من بين أضلاعه ، يتحول صوت دقاته الى الصفارات التي تطلقها السيارات لخداع الناس ، سكينتهكانت تفور ، ترغي ، وتُزبد مثل آلة منصوبة ، تتفحص الغرف على عجل ، وكلها كانت متشابهة .

ثقل رأسه صير جسده في هشاشه ورق (المقوى) . . كل قدم منه كانت تُحصى على الاخرى خطواتها . . ثمة قبة مربعة الشكل ذات لون فضي كانت هي الاخرى ، تلتمع التماعاً . .

الصوت اللامرئي عاود ثانيةً :–

من يأتي هنا . . لايرى شيئاً ، سوى ارواحنا نحن . . إنكم منبوذون . . !

كان منهمكاً في اعتصار مخه ، ليعلم ، منذ متى هو هنا ، والى متى سوف يبقى ؟ . . إنه يتميز بطقس مختلف ، المحاوير معلقة رأساً على العقب . . لاشيء هنا يهمه ، سوى أن يعثر على رأس الشليلة لتلك الطريق التي ارغمته على الوصول الى هنا . . لمراتٍ عديدة دأبت طبول الطرق الوعرة على جرجرته صوب الازقة المتعرجة ، ثم أ' هذا الامعان في التفكير قد صار بدوره مثل كوكب الشعرى الكاذب يُلقي في طريقه الطُعم نحو شفير الفناء . .

إن البساط المفروش منسوج من الحرير ، وخيوط الذهب ، والطيقان المخفية ، محشورة بعدد من القناني المملوءة من ذوات الاعناق الطويلة ، عليها صورٌ لرجال نورانيين ذوى لحى بيضاء . ثمة اصواتٌ ، وهمسات ، ولهاثات لا حصر لها راحت تردم كل ما في ذلك المحيط من ثقوب وثغرات . أذناه كانتا تفصلان غضروف جمجمته ، فتلتصقان بالجدار الذي يستقر تحت الكوة .

ما يمتلئ به القاعات ، والغرف من كائنات حية ومن جمادات كانت تتماوج في خضم عُتمة حالكة ، فيما عدا ذلك المصباح الاحمر المعلق فوق صورة تلك المرأة التي تتحضن بين ذراعيها رضيعاً وضيئ المحيّا(٣) ، وديعاً ، عجولاً . . والذي كان يشتعل وينطفئ بصورة اوتوماتيكية ، فيُدخل الاشياء المزخرفة المزدانة بها المناضد الضخمة في حومة رقصة مميتة .

مرة اخرى إنبرى الصوت اللامرئي :

– إن هذا المكان هو بلاد الصادقين والمتقين . انتم المجبولون على الكذب ، سوف تقضون علينا . .

كان يغذ الخُطى . اخذت الهمسات ، والهمهمة ، تتحول إلى أنين مُتهيج ، يوقف شعرات رأسه . تصرُ عضلاته من جرائه صريراً . . . جهاته الاربع غدتْ بحراً من الظلمات ، أخذ يزداد كثافةً باستمرار ، سوى بصيص من النور مربع الشكل ، يفتح

جُرحاً في الحائط . .

اقترب من الكوة . زوبعة من زخرات حارقة انطلقت تداهم عارض وجهه «قوةٌ مطلسمة أو صلته الى مقربة من الكوة . . رأى في الداخل كومةً من لحوم ملساء ، ملتفة حول بعضها كالتفاف ديدان القز ، يرتمي بعضها فوق البعض الأخر ، وثمة اخريات يحاولن الولوج تحتها ، عرق بارد بدأ يتصبب من جسده . . لدرجة كانت خيوط حاجبيه تأبى الحفاظ على مقلتيه ، سُعلة بقدر حجم دعبلة اخذت تخنق لهاثه ، تستبقيه المرة بعد المرة . . أثوابٌ نسائية كثيرة كانت مركومة ، عدد من المعاطف الرقيقة البيضاء معلقة ايضاً على جدار تلك الغرفة السرية . . تتحرك ببطء شديد ، كان يجهل لماذا تعتصر هذه الكومة من اللحم بعضها بعضها ، بعضها كان يتهالك ، ومن ثم يرقد على الارض مرتخي دون حراك . . نظراته راحت تثقب واجهة الكوة المزججة . . وعلى حين غرة انتفخت الغرفة بصرخة مبحوحة صعقتْ فؤاده من خلال شقوق الزجاجات . طوى العتمة رعبٌ مدمى . فاكتسح هو ايضا معها . . بدأت كومة اللحم تفتتْ الى قطع من تلقاء نفسها ، تدبُ فيها الحياة ، ثم تعود لتنتصب واقفة . وعلى شكل صفين متراصين احتلت الغرفة من اقصاها الى اقصاها . لفرط ارتباكه ، لم يتذكر متى اصبح صوت سُعلته سبباً في اثارة كل هذه البلبلة ، أم كانت صرخة جنسية تفرقع في جوفه . . كانوا وجوه ناظرة ، ريّا ، واجساد مكتنزة بضة ، كأن ريشة فنان – رومانسي – ابدعتها ، ناهيك من بشرتهن ، فلقد كانت على درجة من البياض ، والصفاء بحيث تخطف من الابصار بريقها . .

بهلعٍ وخوف ، وبقلوب واجفة كن يحشرنَ اثداءهن النافرات بين طيات كتاب ضخم – أشبه بكتب سماوية – وكل واحدة منهن ايضاً على نحرها صليب مذهب يرتشف كأس السعادة . .

ثلاثة عمالقة ذوي لحى طويلة ، كل واحد منهم وكأنه يمشي على جذعين من الشجر ، انتصبوا واقفين بخجل وسط الغرفة . شكك في وجوده . تفحص ارجاء الغرفة على عجل لم يكن يرى أي باب ، عدا كوىً مزججة كبيرة . . امتزج باللاوعي . كان يتمشى بتأثير دغدغة من دنين[٤] اغنية . اخذ يصيخ السمع . راحت يدٌ سحرية تنتزع من جسمه ، ما ارتداه من ثياب قطعة قطعة .

شرع يرتجف . كلما لامس بيده جسده . اثار نشيشاً بارداً من لحمه الخائر . قلبه لم يكنْ ليطاوعه في أنه هو ايضاً مثل هؤلاء يذوب . وأن نفس النظام بالذات هو الذي سوف يضعه داخل قفص الاتهام . . لبضع ثوانٍ اغمض جفونه . وإذ اعاد فتحها . رأى النساء العاريات وهن يمرغن انفسهن بجسده الزاغب ، ويعتصرنه ، ويدفعن به صوب مكان مجهول . .

**رؤيا القبو الثاني :**

ساعة قديمة ، صدئة ، معلقة في احدى الزوايا ، تلتمع ارقامها واحداً واحداً كعيون القطط . أما عقرب الساعة فقد كان متمدداً فوق رقم –٤– .

لم يكن يدري كيف فغرت ثغرة كبيرة في الارض القبو الأول فاها ، فأبتلعته فجأة واكتسحته الى هذا القبو ، مدحرجة اياه من خلال النفق . .

وإن هذا (النفق) بالذات هو الذي يربط كل هذه الاحداث المحزنة لهذين القبوين ببعضها .

براثن الخوف كانت تدفع به ، تنخسه بمهازها ، تُلجمه ، حرارة حشرجة كانت تهد ركبته هداً . ايماضات النور خلل صدع الحائط الاخرى كانت تميط اللثام شيئاً فشيئاً عن وجه القبو . اختلط عليه الليل بالنهار . . انطفاء النور واشتعاله من خلال الشق كان يزفان إليه بشرى الغروب والشروق . . خلال مكوثه هناك ، اضاء الصدعُ وانطفأ ثلاث مرات او اربعاً ، وكان النور مختبئاً تماماً . جسده ذاب مع الظلمة . .

اصابعه راحت تغوص في ثنايا جلده اللدن . زبدُ الجوع كان يتقطر من شدقيه . التفت ثانية ناحية الساعة . كان العقرب القصير يُسرع باتجاه الرقم الأخير . يلتمع التماعاً . . صوت

